



# سەرەنجێک لەسەر مێژووی مقامی کوردی

نووسینی:
عومەر سۆفی

٢٠٢٢

# سەرەنجێك لەسەر مێژووی مقامی کـوردی

نـووسینی
عـومەر سـۆفی

٢٠٢٢

## پێناسەی کتێب:

ناوی کتێب:سەرەنجێک لەسەرمێژووی مقامی کوردی.
بابەت: مقام.
نووسینی: عومەر سۆفی
دیزاینی بەرگ: هیوای مەلا بورهان
دیزاینی ناوەوە: سیروان شێخ لەنگەری
تایپ: عومەر سۆفی
هەڵەچن: م.کمال جلال أحمد
نۆبەی چاپ: چاپی یەکەم.
شوێنی چاپ: سلێمانی، چاپخانەی کارۆ.
ساڵی چاپ: ٢٠٢٢.
تیراژ : ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (١٣٦٨)ی ساڵی ٢٠٢٢ پێدراوە.

**پێشکەشە بە:**

* گیانی پاکی شەهیدە نەمرەکانی کورد و کوردستان به دایکە جگەرسووتاو و خۆڕاگر و سەربەرزەکانیان ، بە هەموو کەسوکاریان بەبێ جیاوازی.

* دایکی هەمیشە خۆشەویستم.

بەهاوسەری خۆشەویستم سروەخان و منداڵەکانم تاڤگە و هەڤاڵ وزریان

* بەڕوحی پاکی دوو ڕۆڵەی جوانەمەرگم یەریڤان و هاوڕێی تاقانەم

* مامۆستا بازیان هاوسەری تاڤگەخانی کچم

* پێشمەرگە قارەمانەکانی کورد و کوردستان.

* هەمووئەوکەسانەی لەهەربوارێکدا پێشمەرگە ئاسا دژبە ناحەزان و دوژمنانی گەلەکەمان و مرۆڤایەتی دەجەنگن تا کۆتایی.

* هەموو ئەدیبان و هونەرمەندان و ڕۆشنبیرانی دڵسۆزی کوردستان.

* هەموو دۆست و خۆشەویستانم بەبێ جیاوازی لە نزیک و لە دوور.

* هەموو کتێبخانەکانی کوردستان و کارمەندە دڵسۆزەکانیان لەگەڵ ڕێزمدا.

* بە تەواوی خوێنەران و ئاشقانی ئەدەب و پەرتووک

* پێشکەشەبە هەموو مرۆڤێک و مرۆڤدۆستان لە هەر شوێنێک بن لە سەر ئەم گۆی زەوییە.

## ڕێز و سوپاس بۆ:

* مامۆستا سیروان شێخ لەنگەری خۆشەویست کە زۆرهاوکارم بووە .

* کاک ئەحمەد سۆفی شاعیر، کە ناسراوە بە ئەحمەد سوسێیی

* سوپاس بۆ هونەرمەند مامۆستا ئەنوەر قەرەداغی.

* کاک محەمەد خورشید. یەکەم هاندەرم بوو، بۆ نووسین و لەچاپدانی یەکەم کتێبی شیعرییم.

* هەمووئەو کەسانەش، بەتایبەت کاک وەستا سابیر و برادەرانی تر، یارمەتیاندام لەکاتی ئەنجامدانی نەشتەرگەری دڵم، چ ماددیی و چ مەعنەویی،

* د. کاوە وسووی بەڕێز، بە کارمەندەکانیشەوە، بەڕاستی شایەنی ڕێزن.

*بەڕێز مامۆستا کەمال جەلال ئەحمەد کە ئەرکی هەڵەچنی گرتە ئەستۆ.

* ئەو کەسانەی هەمیشە ڕێزیان لێگرتووم و بەڕێزن لەلام.

*بەڕێز م. کامەران حەمەئاغای باجەڵان .

عومەرسۆفی باجەڵان

## پێشەکی:

سڵاو بۆ تۆ ئەی خوێنەری بەڕێز لە هەرکوێیەک بیت لەسەر ئەم گۆی زەوییە بەبێ جیاوازی، مرۆڤ زۆر بەنرخە و بەڕێز و پیرۆزە ، ئەو هێزەی دروستیکردووە نرخی دەزانێت ، دەزانێت توانای مێشکی تا چ ڕادەیەکە ، کەس نازانێت بەرنامەی چی لە مێشکدایە، تەنها ڕۆژگار بۆی دەرەخسێنێت ئەگەر ڕێکبکەوێت بە باری ئەودا . جا بۆیە من مرۆڤم خۆشدەوێت و ڕێز لەبیرو بۆچوونی مرۆڤەکان دەگرم بەبێ جیاوازی ئەم نوسینەی من بێ ڕێزی نیە بەبیرو باوەڕی هیچ مرۆڤێک وهیچ نەتەوەیەک لەسەر ئەم زەویە مەبەستم لەنوسینی ئەم پەرتووکە مێژووە و زانیاریە بۆمرۆڤایەتی و نەوەی نوێی گەلەچەوساوەکەمە ، بۆئەوەی بزانێ کورد کێیە وچی پێکراوە لەمێژوودا لەژێر ناوی جیاجیادا بەندە تەمەنێکم کردووە هەتا ئەمڕۆکەش تەمەنم خۆی دەدات لەشەس تساڵ لەزوڵم وزۆر زیاتر خۆشیم نەدیوە لەلایەن نەتەوەکانی ترەوە بۆیە کورد وتویەتی مێرد کێشانە نەکراوە لە سەرەتای ساڵانی حەفتاکاندا من منداڵێکی لادێی نەخۆش و لە خانەوادەیەکی هەژار و دەست کورت هاتوومەتە دونیاوە، لە بێ جل وبەرگی و بێ پێڵاویی و کەمخۆراکی و دەربەدەریی تووشی هەوکردنی گورچیلە بووم و یەک گورچیلەم نەماوە و پووکاوەتەوە، بەبێ سەردانی پزیشک و بێ دەرزی و دەرمان بۆ ماوەی حەوت ساڵ من بەدەم ئازارەوە ناڵاندوومە ، لە پاش حەوت ساڵ ئازار، منیان بردووەتە نەخۆشخانەی گشتیی خانەقین، ماوەی یەک مانگ و نیو لە نەخۆشخانەی خانەقین لە ژێر چاودێریی پزیشکدا بووم و نەشتەرگەرییان بۆ کردووم و گەڕامەتەوە بۆ ماڵەوە پزیشکەکەشم ناوی ڕەمزی برنوتی بوو لەنەتەوەی عەرەب بوو ڕوحی شادبێت سەرەڕای ئەو هەموو دەردە، هێشتا بەندە زۆر شەیدا و خولیای

میوزیـک و گـۆرانی و مەقـامی ڕەســەنی کـوردی بـووم، ئێستاشــی لەگەڵدابێـت کە تەمەنـم خـۆی دەدات لە شـەس سـاڵ، دەتـوانم بڵێم لە تەمەنـی دە ساڵـیـەوە گـوێم لە میوزیـک و گـۆرانی کـوردی گرتـووە، شارەزای مەقام و ئاوازی کوردی بووم، بەهـۆی ڕادیۆ کوردییەکانی: بەغـدا، تـاران، کرماشـان، سنە، مهابـاد و قەسـری شـیرینەوە یادیـان بەخێـر و گیـانی هەر هەمـوو ئەوانەی کۆچیـان کـردووە شــادبێت و ئەوانەیشـیان کە مـاون، سـەرفراز و لەشسـاغ بن، کە ڕۆژانە هەریەکە بۆ ماوەی کاتژمێرێک گۆرانی داواکراویان هەبوو، داواکراوی ئەوکات وەکو ئێستا نەبوو چوار پێنج گۆرانی دیاری بکات و هەر ئەوە بێت و بەس، مـن زۆربەیـانم وەردەگـرت بە ئـارەزووی دڵـی خـۆم چێـژم لـێ وەردەگرتن، بەڵام داخەکەم بەهۆی نەداریی و زوولـم و زۆری ڕژێمە فاشیسـتە یەک لەدوای یەکەکـانی ئەوکـاتی عێـراق، ئێستایشـی لەگەڵـدا بێــت نەمتــوانی خوێنــدن تەواو بــکەم، بــۆیە هەر بە دەربەدەریــی، کوێرەوەریی، کرێکاریی، کۆڵکێشی، جوتیاری و حەماڵی هێنـام تـاوەکو ئەمڕۆ. سـەرەڕای ئەمانەیش هەرگیـز لە هـونەر دانەبڕاوم خۆبەخشـانە بۆ خزمەتـی خـۆم و وڵاتەکەم، یـان باشـتر بڵێین بـۆ چێژ وەرگـرتن و ئاسوودەکردنی دەروونـی خـۆم، نـاوە نـاوە بەشـدارییم لە فێستیڤاڵ و بۆنەکاندا کردووە. هەروەها پێنج کتێبیشم نووسیوە، سیانیانم بە چاپ گەیانـدووە و دووانەکەی تـر ئامـادەن بـۆ چـاپ، چواریـان شـیعرن و یەکێکیشیان مێژووە، مێژووی مەقامی کوردی و دەتوانم بڵێم بنەچەی کوردە، ئەگەر تەمەن باقی بێت ئەوانیش بە چاپ دەگەیەنـم، ئێسـتاش خەریکی نووسـینی تـرم ، هەروەهـا دەمەوێت ئەوەش بڵێم؛ کە مـن نە خوێنـدنی زانکـۆم تەواوکـردووە، نە پەیمانگـام تەواوکـردووە، نە کەس دەرسی داوم، وە نە کەسیش فێری کـردووم، تەنهـا لە ڕێـی گـوێگرتن لە میدیاکان، یان هونەرمەنـدە گەورەکانەوە نەبێت، ڕۆحیـان شـادبێت. دەتوانم بڵێم شتێک فێربووم کە هیچ کاتێک خۆم بە مامۆستا نەزانیوە

و نازانم، منەت بەسەر کەسدا ناکەم و چاوەڕوانی هیچ پاداشتێک لە هیچ کەسێک ناکەم و نەشمکردووە، وەکو مادده، بەڵام خەڵاتیان کردووم وەکو ڕێزلێنانی ڕەمزیی، سوپاسی هەموو ئەو کەسانە دەکەم. هەر شتێکیش لە دەستم بێت درێخی لێ ناکەم لەپێناوی نیشتمانەکەمدا، وابزانم کەمتەرخەمیشم نەکردووە لە هیچ ڕوویەکەوە هەتاوەکو ئەمڕۆ کە منەت بەسەر کەسدا ناکەم، من هەر شتێکیشم کردبێت ، بۆ نیشتمانەکەمم کردووە، بە شانازیشی دەزانم، من داواکارم لە هەموو کوردێک لە هەر کونجێکی سەر ئەم زەوییە بێت بۆ خۆشگوزەرانی خۆی و خێزانی هەوڵبدات و تێبکۆشێت بەوپەڕی هۆشیارییەوە، نەک لەسەر حسابی کەسانی تر، خیانەت نەکات و لەگەڵ وڵاتی ڕەگەزپەرست نەبێت، کولتووری خۆیشی لەدەست نەدات، نەوە بە نەوە بیداتە دەستی نەوەکانی دوای خۆی ، ئەگەر وا نەکەیت ، واتا تۆ ئەمەکت بۆ نیشتیمانکەت نەماوە ، کورد ووتەنی نمەک حەرام دەرچوویت ، ئەنجامی هەموو مرۆڤێکیش هەر مردنە ، ئێستا من ئەم کارە دەکەم و کەس زۆری لێ نەکردووم ، تەنها فشاری دەروونیم لەسەرە ، چونکە دەبینم گەلانی چواردەورمان خەریکە دار و بەردمان قووت دەدەن، بڕوانە ئەنجاممان گەیشتووەتە کوێ، ئێمە سەڵاواتیان لەسەر دەدەین، ئەوان چەقۆ دەخەنە سەر گەردنمان، ئەمەش هۆکارەکەی دەگەڕێتەوە بۆ وەلانانی دڵسۆزیی بۆ خاک و ئاو و کولتوور و نیشتمان و ڕێزنەگرتن لە یەکتری.

کورد ووتەنی، منیش لە ڕقی ناحەزانم مەنی خوێ دەخۆم، بۆیە هەستاوم بە نووسینی ئەم کتێبە، تا دەروونی خۆمی پێ ئاسوودە بکەم ، پێناسەیەکیش بێت بۆ دواڕۆژی گەلەکەم و کولتوورەکەم، هەروەها چقلێکیش بێت بۆ چاوی داگیرکەران و بەکرێگیراوانیان. لە کۆتاییدا داواکارم لە هەموو ئەدیبان و هونەرمەندان و ڕووناکبیران ، لەبری ئەوەی ببنە پارێزەری ماڵ و سامانی بێگانە ، ببنە پارێزەری ماڵە دزراو و داگیرکراوەکەی خۆتان، چونکە زۆرجار دەبینم هونەرمەندێک یان نووسەرێک ڕەخنە لەم و لەو دەگرن ، ئەم نووسراوە هی فلانە گەلی بێگانەیە ، یان هی فلانە هونەرمەندی بێگانەیە ، بۆ نێوان یەکتری ئەم ڕەخنانە ئاساییە هەر چۆنێک بێت ، بە بۆچوونی من سوودیشی هەیە ، داواکارم با مافی یەکتری بدەین ، با بە چاوی ڕێزەوە بڕوانینە یەکتری ، هاوکاری یەک بین بۆ یەکتری و یەکتر نەشکێنینەوە و نەبینە کۆسپ و لەمپەر لە بەردەمی یەکتریدا ، ئەگەر ڕۆشنبیریت یان هونەرمەندیت دەبێت هاوکاری هونەرمەند بیت ، ڕۆشنبیر دەبێت هاوکاری ڕۆشنبیر بێت، دەبێت هەموو ڕۆشنبیران لە هەموو چین و توێژەکان یەک بن، وڵات بە ڕۆشنبیریی گەشاوە دەبێت و بەرەوپێش دەچێت ، لەمپەری بەردەم گەشەکردنی ژیان ئەوانەن کە هەمیشە دوژمنی زانستن، زانست چرایەکە بنج و بناوانی تاریکی ڕووناک دەکاتەوە. خوێنمژەکانی ئازادیی مرۆڤ لە ڕووناکی دەترسن، دوژمنەکانی خۆشگوزەرانی مرۆڤ لە تاریکیدان، بۆیە تاریک پەرستان بەرگریی لە تاریکی دەکەن، هەمیشە دەبێت مرۆڤ هەوڵ بۆ زانست بدات و بیر بکاتەوە ، ئەگەر مرۆڤ بیر نەکاتەوە ، ئەوا وەکو بەردێک وایە ، یان وەکو ئاژەڵێکە هەر بەکاریدێنن ، چونکە کۆنەپەرستان دووژمنیان زانست و بیرکردنەوە و پرسیارکردنە ، هەروەکو شەمشەمەکوێرە چاویان بە ڕۆشنایی هەڵنایەت ، هەر بە وێنەی مێشە گودڕە بەسەر

خوێنی هەژارانەوە دەژین. ئەی برای ڕۆشنبیر بۆچی هەوڵ نەدەین
بۆ سەپاندنی عەقڵگەرایی بەسەر تاریکپەرستان و دووژمنانی مرۆڤ
و خۆشگوزەرانی جیهاندا ، ڕۆشنبیر نابێت ڕێگر بێت لە ڕێی
ڕۆشنبیردا ، چونکە کۆنەپەرستان ڕێگرن لە ڕێی زانستدا هەموو
ئەوانەی خۆیان بە ڕابەری ڕێبازێک یان نەتەوەیەک دەزانن، یان
خاوەنی سەرمایەیەکی زۆرن ، بێگومان حەزیان لە پێشکەوتنی
مرۆڤایەتی نییە، جا لە هەر چین و توێژێک بن. ئەی مرۆڤی بەڕێز، لە
ژیانتدا بەبێ هەڵسەنگاندن و بیرکردنەوە نەکەویتە ژێر هیچ بارێک، با
نەبیتە کۆیلەی هیچ مرۆڤێکی تر لە هەرچی بوارێکدا بێت، چونکە ئەو
هێزەی تۆی هێناوەتە سەر ئەم ئەستێرەیە، بەبێ جیاوازی مافی
هەموویانی داوە بە گیانلەبەر و خشۆک و هەموو ئەوانەی
دەجووڵێنەوە لەسەر ئەم زەوییە، خوا هیچی لە تۆ ناوێت، جگە لە
چاکەکاریی. ئەوە مرۆڤە پیلان بۆ تۆ دادەڕێژێت بۆئەوەی بەکارت
بهێنێت بۆ خۆشگوزەرانی خۆی و خێزانی، جا لە هەر بوارێکدا بێت،
تۆیش مافی خۆتە وەک هەر مرۆڤێکی خۆشگوزەران بژیت، بێگومان
جوانترین گوڵی باخچەکانی ژیان هونەر ومۆزیکو ئەدەبیاتی ڕاستییە،
چونکە زمانی هەموو گەلانی سەر گۆی زەوییە، خەمڕەوێنی هەموو
دڵێکە، چونکە پەیامبەری ئاشتی هەموو گەلانی جیهانە، هەر یەک
زمانیشی هەیە، بۆیە داواکارم بە قسەی بکەن و گوێی لێبگرن، بزانن
چیتان پێ دەڵێت، بێگومان دەڵێت بژی یەکسانی، بمرێت شەڕ و
خوێنڕژان، نەمێنێت برسێتی وماڵکاولی، ڕسوا بێت زۆرداران و
خۆپەرستان و درۆزن و تاریکپەرستنی سەر ڕووی زەوی. ئێوە
بڕوانن ڕۆژانە لەسەر ئەم زەوییە چەندەها مرۆڤ هەن وا خۆیان
دەردەخەن بە ناوی ئاین و نیشتمان و ڕێبازەکانەوە خەڵکی دەکوژن
و دەیانکەن بە گژیەکتردا و ماڵکاولیان دەکەن، سەروەت و سامانی
وڵاتیش دەدزن، کەچی خۆیان بە خزمەتگوزار و پیاوچاک و دڵسۆزی

گەل دەزانن، بڕوانە هونەر و هونەرمەندان ڕۆژانە بە دەیەها فێستیڤاڵ و کۆنسێرت و ئاهەنگ ساز دەکەن بۆ ڕەواندنەوەی خەم و ئازاری ناو دڵی خەڵکی، کە سیاسییەکان و بازرگانەکانی مرۆڤایەتی و ڕابەرانی بوارەکان دروستیان کردووە، بەرهەمەکەشی بۆ نەخۆشخانەکان و خزمەتی هەژارانە، ئەوانەی کەوا بێڕێزیی بە هونەر دەکەن، بە حەرام لە قەڵەمی دەدەن یان بەسوک سەیري دەکەن ، هیچ کاریگکیشیان بەبێ هونەر بەڕێوە ناچێت و نەچووە. تۆ بڕوانە حیزب و سیاسییەکان کاتێک مەرامێکیان هەبوبێت، ئاهەنگێکیان سازکردووە، چونکە ئەگەر ویستبێتیان وتارێک بخوێننەوە، چۆن جەماوەر کۆ دەکەنەوە؟ بێگومان دەبێت ئاهەنگ ساز بکەن و تێچووەکەی هەرچەندێک بووبێت گرنگ نەبووە، بەڵام هیچ کاتێک ڕێزیان لە هونەرەکە نەناوە، بەداخەوە ئەمڕۆ هەموو شتە پیرۆزەکانی هەڵقوڵاوی ناخی مرۆڤایەتی، کە لەگەڵ مرۆڤدا لەدایک بووە بەستوویانە بە سیاسەتەوە، بەتایبەت لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بازرگانی پێوە دەکەن، ئەم باسە قسە زۆر هەڵ دەگرێت، بەڵام کۆتایی پێدێنم، دەڵێم هیوادارم بە چاوی ڕێزەوە لە هونەر بڕوانن، چونکە هونەر مایەی سەرکەوتنی هەموو گەل و وڵاتێکە، بەڕاستی پیرۆزە، بڕوانە وڵاتانی پێشکەوتوو چۆن ڕێز لە هونەر دەگرن، سەرکەوتووبن وڵاتانی ئازادیخوازی سەر ئەم زەوییە، سوپاسی هەموو مرۆڤێکی ئازادیخواز دەکەم، هیوای سەرکەوتنیام بۆ دەخوازم، سەربەرز بێت مرۆڤی مرۆڤدۆست، سەرشۆڕ بێت دوژمنی مرۆڤایەتی، تەمەندرێژ بێت خامەی ڕووناکبیران، مەشخەڵان بکا لەسەر ڕووی جیهان، کوێر بکات دوو چاوی تاریکپەرستان.

عومەر سۆفی

٢٠١٨/٥/١٧

کەلار- شەهیدان

## دەستپێک

گەڕان بەدوای بەڵگە و سەرچاوەی ڕاستیدا بۆ سەلماندنی دێرینی و مێژینەیی گەلەکەمان کە خاوەنی داهێنان و کەلتوورێکی فرە و فراوان و جوگرافیایەکی پان و بەرین و پڕ پیت و بەرەکەت بووە و هەتا ئێستاشی لەگەڵ بێت، با بزانین هەموو وڵاتان لەوڵاتێک جیابوونەتەوە و زانست و هۆشیاریش لە سەرچاوەیەکەوە دەرچوون، هەموو بیروباوەڕەکانیش لە سەرچاوەیەکەوە پێگەیشتوون ، بڕوانە چۆن سیاسەت لە یەک سەرچاوەوە گەشەی کردووە، هەرواش دینەکان لە سەرچاوەیەکەوە گەشەیان کردووە، بێگومان هەمووشی لە دژی یەکتر بووە، بۆ نموونە لە پێش میترایيەکاندا زۆر شت پەرستراون، کە لەبەشەکانی دواتردا بە درێژایی باسیان لێوە کراوە، ئیبراهیم پێغەمبەر لە دژی نەمروود بووە ، کە بتی داهێناوە ، بۆ کۆیلەکردنی گەلەکەی، سوپا و هێزیشی دامەزراندووە،
بۆسەرکوتکردنی جوتیار و کرێکارانی وڵات، ئەوەبوو ئیبراهیم پێغەمبەر لە دژی وەستا و لە پاشان شکاو هەڵات بۆ شاخەکانی باکور و باشووری کوردستان، چەندەها شاریان بنیاتنا و شۆڕبوونەوە بۆ وڵاتی میسری قبتییەکان و لەوێوە بۆ فەلەستین، ئەوەبوو بەنی ئیسرائیلیان لێ دروستبوو، هەمان دینی هۆرییەکانیشیان بەکارهێنا و بۆ ماوەی هەزاران ساڵ فەرمانڕەواییان کرد، لە پاشان لەناو ڕۆمەکان مەسیح سەري دەرهێنا لە دژی یەهود وەستایەوە ، ئەوە بوو مەسیحیان لەخاچ دا، لە هەمان کاتدا وتیان عیسا نەمردووە دەگەڕێتەوە دیارە کاهنەکانی مەسیح هەر لەوڕۆژەدا بەردی بناغەی بیرۆکەیەکی تریان دانا بوو لە سەر هەمان بیروباوەڕ بە دەستکارییەوە. هەر لەو کاتەوە گوتیان مەسیح نەمردووە و دەگەڕێتەوە ، ئەوەبوو گەڕاندیانەوە بەجۆرێکی تر، بە هاوکاری گەورە کاهینەکانی مەسیح و گەورە سەرمایەگوزارەکانی

عەرەب لە قورەیشا هەوڵیاندا تا ئەورۆژەی پێغەمبەری ئیسلام خودا ناردی موحەمەد (ﷺ)، زۆر کەسی تر هاوڕابون لەگەڵ پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت ئەو بیروباوەڕەی هەبوو، وەکو ئەبوبەکری صدیق و هەتا باپیرەی پێغەمبەر (ﷺ) عەبدولموتەڵیب بن عەبدولمەناف، کە ناوی مەناف یەکێک بووە لە بتە گەورەکانی قورەیش، هەروەها وەرەقە بن نۆفل کە ئامۆزای خەدیجەی خێزانی پێغەمبەر بووە(ﷺ)، وە زیاد هەمیشە لە ئەشکەوتی حەڕڕاء سەردانی (پێغەمبەری کردووە) (ﷺ)، پاشان دیار نەماوە، هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانی ئیسلامەوە بۆ ئەبەدی ، ئەمانە لەپێشدا نەسرانی بوون ، هەر ئەمانیش هاورێی و هاوڕای پێغەمبەر بوون درودی خوای لەسەربێت ، چونکە هاوڕێ و یاریدەدەریبون.(بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: کتێبی سێبەری شمشێرەکان)، نووسینی چێنەر، بە بەڵگەی قورئانییەوە بۆت دەسەلمێنێت، من نامەوێت بچمە بنج و بنەوانییەوە هەتا ئاوەهایان بەسەر یەهودا هێنا، کە وڵاتیان پێ چۆڵکردن و قڕیانکردن و هەر ئاوارە بوون هەتا ساڵی شەستەکان واتا (١٩٦٠)ی ز، ئەمجارە بەزۆری مەسیحییەکان دووبارە لە دژی ئیسلام، یان عەرەب یەهودیان گەڕاندەوە بۆ ئیسرائیل، چونکە عەرەب و دینەکەی لە دژی مەسیح وەستانەوە، لە پاشاندا مەسیح، یان خاچپەرستەکان دووبارە سەرکەوتنەوە بەسەر عەرەبدا، هێزی ئیسلام کزبوو، جارێکی تر مەسیح بە دەستی هیتلەر یەهودی قەلەپارچە کردەوە، لەپاش شەڕو خوێنڕشتنی دینەکان، بیروباوەڕی دین و دینگەرایی و سیاسەت پێی نایە قۆناغێکی تر بە ناوی عیلمانییەت و بە شێوە جیاجیاکانی، هێزی عەسکەرتارییەت، جیهانگیریی، دیموکراسی، کۆمۆنیزمی، سۆسیالیستی و سۆشیال دیموکرات و ئەمجارەش سەدەها باڵیان لێبووەوە، هەر هەمووشی بۆ بەرژەوەندیی چەند بنەماڵە و تایەفەیەک، یان چەند وڵاتێکە، هەمووشیان یەک بنەمایان

هەیە، ئەو بنەمایەش لەم وڵاتەی من و تۆوە بووە بنەمای میوزیک و مەقامیش هەر لێرەوە بووە دەستی پێکردووە. سەردەمانێک بووە ئەم کوردستانە بە هەزارەها جار کراوە بە خۆڵ لەژێر سمی ئەسپی داگیرکەراندا عەرەب وفارس وتورک و یۆنانی ومەغۆل وزۆری ترونموونەکانیان، ئەگەر دەتەوێت گەلەکەی خۆت بناسیت، برۆ مێژوو بخوێنەوە و بزانە تۆ کێی لەم ژیانە و بە دەستی خائین و خۆفرۆش و داگیرکەران چیت پێکراوە. لە سەردەمی عوسمانیدا دەرفەتێک ڕێکەوت بۆ وڵاتانی بندەست کە دەوڵەتیان بۆ دروستبکەن و نەجاتیان ببێت لە بندەستی لەلایەن وڵاتە گەورەکانی دونیاوە کەچی بەخیانەتی پاشاجاشەکانی ئەوسەردەمەی کورد لەباریان برد گوتیان ئێمەڕازین بە تورک هەردوو لامان موسوڵمانین و کەموکورتیمان نیە جا بەپلانی تورک جلی کوردیان پۆشابوو ئامادەی پەڕلەمان بوون لە بەردەم ئەونوێنەرانەی کە لەوڵاتانەوە هاتبون بەنوێنەرایەتی کەسێک لەخێڵی بەدرخانێکان دەکرێت بووترێت پاشا عەبدڕەزاق بەدرخان بوو دەوڵەتخوازانی کورد هەڵیان بژاردبوو کە مەرامیان بوو دەوڵەتی بۆکورد دابمەزرێنن کەچی ئەوخیانەتکارانە لەباریان برد لە پاشانیش تورک هەمویانی لە سێدارەدا گوتی ئێوە خیانەتتان لەوڵات کردووە جلی کوردیتان لەبەر کردووە هەر بە ئەمری خۆیشی پۆشیبویان لەپاش لەباربردنی قازییەکە گوتی ئێوەخیانەتکارن داوای جودا خوازیتان کردووە هەموویانی لە سێدارەدا جابرای بەڕێزم ئێمە خیانەت کوشتوینی و نەزانی و نەخوێندەواری جا منیش هەر بۆیە دەمێکە دەمەوێت کە هەرچۆنێک بێت بە گوێرەی توانا ڕوونکردنەوەیەک لەسەرمێژووو مقاماتی کوردی بنووسم و بیخەمە بەر دیدەی خوێنەرانی کورد، بۆئەوەی لە فەوتان بیپارێزین و لەناو نەچن، بەڵکو لە بیری نەوەی داهاتوومانداا بەزیندوویی ڕایانبگرین، هەروەها وەکو سەرمایەیەکی کولتووریی ڕەسەنی کوردی

نەوەکانمان سوودی لێ ببینن، چونکە هەموو میللەتێک خاوەنی کلتووری خۆیەتی، ئێمە لە هەموو میللەتێکی تری سەر ئەم زەوییە دەوڵەمەندترین لە ڕووی کلتوورییەوە، چونکە بە شاهیدی مێژوونووسانی بیانی و ناوخۆیی کۆنترین نەتەوەین، بەڵگەی حاشا هەڵنەگریش بۆ هەموو شتێک، ناوەکان و شوێن هەوارەکانە، بۆ نموونە ئێستاش دەیەها گرد و گوندی شوێنەواری لەکوردستاندا هەیە و دەرکەوتوون وەکو گوندی چەرموو، کە بۆ یەکەمجار لە هەموو جیهاندا کشتوکاڵی تیادا کراوە و دانەوێڵەی لێ چێنراوە. ناوچەی بنکورە، واتا ناوچەی پیشەسازیی ئەو سەردەمە. بەڵێ ئەم ناوچەیە تەپۆڵکەی لێیە، بێگومان ئەم تەپۆڵکانە هی سەردەمی گاورەکانن واتا سەردەمی زەڕدەشتی و هەزارەها ساڵی پێش ئێستایە کارگەی پیشەسازیی ئەوکاتانە بوون، کە وەکو گۆزە و کوپەڵە و زمڕووت و زێڕو زیو و هەموو پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەیان تیا دروستکراوە ، ئەم تەپۆڵکانە هەموویان کوورەی ئاگریین بوون بۆ برژاندنی کەرەستەی خاو دەرهێنراون، وەکو: خۆڵی زێڕ، زیو و ئاسن و خشتی برژاو بۆ بیناسازیی، نموونەیان قەڵای شێروانەیە هەرچەند قەڵای شێروانە تازەیە بەڵام پێش ئەوقەڵایە قەڵایەکی گەورەبووە بەناوی لبدوو هەر لەشوێنی ئێستای شاری کەلار بەقەد قەڵای هەولێربووە کە ئاشوورییەکان ڕووخاندویانەو وێرانیان کردووە جا خشتەکانی قەڵایش هەرلەوێوە هێنراوە لەتەپۆڵکەکان دەریان هێناون،زۆرکەس دەڵێن لە زەنگاواتەوە هێنراوە، بەڵام بنکورە نزیکترە، گوایە دەڵێن نەیانتوانیوە لەبەر ئاوی سیروان بیپەڕێننەوە ، ئەم بۆچوونە ڕاست نییە ، چونکە ناوی بنکورە بە خۆیەوەیە، هەموو کورەیەکی تیادا بووە، ئێستاش شوێنەوارەکەیان بە ئاشکرا دیارە، خشتی گاوری دروستکراوە و خۆشەیان کردووە و کردوویانە بە کوورەکەدا، کە بە ئاسانی دیارە، دوو تەپەی گەورە هەیە لە بنکوورە، هەردووکیان شار

بوون به ناوی تەپەگاوری و گاورتەپە، تەپەگاوری لە ئاوایی گەورەیە و گاورتەپە لە شێرەوەنە کاتی خۆی شارێکی گەورەبووە لەبنکورە و خشتی گاوری زۆری تیادایە . خشتی گاوری واتا دەستکاری گاورەکان، یان گاتاکان یان گەورەکان، لە پاشان بوو بە گۆران، ئەم ناوەش لە گاتاکانەوە هاتووە. بێگومان کوردستان هەموجێگایەکی شوێن هەوارە ئەگەر خاونی هەبێت و بەدوایدا بگەڕێیت ئەوتا لەم ماویەدا بەبۆنەی دابەزینی ئاوی دەریاچەی دووکانەوە چەند شوێنەوارێک بەدەرکەوتون بەهەندەسەو دیزاینێکی جوانەوە کە بەگوتەی شوێنەوارناسان مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش شەش هەزار ساڵ پێش ئێستا.



با ئەوە بزانین کەتاوەکو ساڵی (١٩٧٥) نەریتی زەردەشتی بە ئاشکرا لە گەرمیـــان مـــابوو ، بەڵام ڕژێـــمە فاشیســـتە یەک لەدوای یەکە ڕەگەزپەرســـتەکانی چواردەورمـــان و جاشـــە چڵکـــاوخۆرە تاریکپەرستەکانی کورد بنەبڕیان کردن بە ناوی بیدعەوە، خۆ ئەگینا لە سەردەمی هاتنی لەشکری خەلیفەکانی ئیسلامدا وا نەبووە، ئەوە هەر ناحاڵیەکانی کورد بوون بە هەمو یانەوە بە تەواوەتی لەناویان بردو و بیرو باوەڕی بێگانەیان زاڵکرد بەسەر کوردی سادە و دڵپاکـدا ، بەداخەوە ئێـستاش کاربەدەسـتانی هەرێـم پشتگوێیان خستووە. خشتی بـرژاوی گـاوری، واتـا سـەردەمی گاورەکان، یان گۆرانەکان هەتا کاتی ئەم نووسینە هەر ماوە.

گۆرانەکـان کـێ بـوون؟ گەورەکـان، یـان گـاتایەکان، واتـا زەردەشتییەکـان، زەردەشتییەکانیـش لە هۆرییەکـانەوە هـاتوون، واتـا خۆرپەرسـەکان، یـان هۆریـیەکان لە پـێش خۆریشـدا زۆر شـتی تریان پەرستووە ، چونکە گەلێکی بنەڕەتی بوون، واتا ئەو مرۆڤانەی لە سەرەتاوە پەیدابوون هەرشتێکی سرووشتی ئازاریانی دابێت، یـان هەرشتێـک ژیـانی خۆشکردبێتـن، یـان زەرەری پێگەیاندبن، بە خودایـان زانیوە و پەرەستوویانە، بۆئەوەی ئەزێتیان نەکات خێر و بەخششیان پێ بەخشیوە. دیارە مرۆڤەکـان ژمارەیـان زۆر بـووە و زیادیـان کردووە و ئاژەڵدار بوون یـان بەدوای دانەوێڵەدا گەڕاون و ئاژەڵدارییان کردووە و لە یەک ناوچەدا جێگایـان نەبووەتەوە، دواتـر کۆچیـان کـردووە و بە دوای شـوێنی باشـتردا گەڕاون، هەرچـی دابونەریتێکیش لەوێدا کە هەیـانبووە لەگەڵ خۆیانـدا بردوویـانە، بـۆ هەرکوێ ڕۆیشـتبێتن، ئەوانەشـی کە پەرستوویانە وەکو: ئـاو، ئـاگر، هەورەبروسکە، لافاو، ڕەشەبا، باران و زریان، هاوین، زسـتان، بەهـار، ئەستێرە، مانگ و خۆریشیان پەرستووە. پێم وابێت ئاڵاکەی توورک گوزارشـت لە کـاتی مانـگ و ئەستێرەپەرسـتییەکە دەکـات بۆزانیـاری

زیاتر بڕوان مێژووی سۆمەریەکان کتێبی گلگامش بەڕونی باسی مانگ و ئەستێرەدەکات کە خوایان بوە ، چونکە کورد خۆی بە دەستی خۆی تورکی هێناوەتە ئازەربایجان، یان ئاترۆپاتیان چەند سەدەیەک پێش زایین (کە لەدواتردا بە ڕوونتر ئاماژەم پێکردووە)، بەکورتی؛ گوتوویانە ئەم خۆرە نوری خودایە، بۆیە لە سەرهەڵدانی زەردەشتەوە پێم وابێت گۆڕانکاریی بەسەر ئاینەکەدا هاتووە، چونکە لە سەردەمی هۆرییەکاندا لە سەداسەد خۆریان پەرستووە، لە سەردەمی زەردەشتدا گوتوویانە ئەم خۆرە نوری خودایە، هەر ئەم بیروباوەڕەش بووە پێغەمبەر ئیبراهیم هەڵیگرتووە و بردوویەتی بەرەو خوار، ئەگەر بە جوانی بڕوانیتە (تەورات)، بە ئاشکرا دیارە، بڕوانە بە ناوی هۆرەوە ناویان هاتووە و تەنانەت سروودی هۆرەش پەیوەندی بە خۆرەوە هەیە، کە سەرلەبەیانی زوو زیکری خۆریان پێ کردووە، کە تیشکی خۆر، یان خۆری زەرد سەری لە کەل دەرهێناوە، کڕنووشیان بۆ بردووە، بڕوانە لە وشەی کوردیدا کەلەوەر زۆر دووپات دەبێتەوە، لەو کاتەدا خۆر سەری لە کەل دەرهێناوە، نوێژی بەیانیان لەو کاتەدا بووە کە خۆر هەڵاتووە، نوێژی بەیانی کەوتووەتە پێش خۆرەوە، بۆئەوەی کە دەرچوو بیانپارێزێت، نوێژی بەیانیانی ئێستاش هەر هەمان ڕێچکەی هۆرییەکانە، سروودەکانی ستایشی خۆر بە هۆرە ناسراون. بەزمی هۆرە خۆی دەدات لە بیست بەزم و بگرە زیاتریش، یان ئاوازی هۆرە شایەتێکی حاشاهەڵنەگرە، زۆر ناو و شوێنەوار بە ناوی ئەوانەوەن لە زۆر شوێنی ئەم کیشوەری ئاسیایەدا، ئەوەتا مارک فان دی میرۆپ، لە کتێبی مێژووی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆن، دەوروبەری (٣٢٣- ٣٠٠٠) ساڵ پ.ز، لە لاپەڕە (٢٢)دا دەڵێت: ئەم گەلانەی دەوروبەری ئاسیا هەموویان بە ئەسڵ دەگەڕێنەوە سەر میزۆپۆتامیا، پشتبەسن بەتاتە قوڕینەکان ئەمەیان سەلماندووە بەتایبەت ئیسرائیل و گەلانی هیندی نەژاد، لە

تەوراتیشـدا بە ڕوونـی هەمـان ئامـاژە دراوە بەم باسـانە و نـاوچەی میزۆپۆتامیا. (کە دواتر ڕوونتر باسیان دەکەم). دەسـەڵاتی هۆرییەکـان زۆر فـراوان بـووە، کە بە هۆرییەکـان ناویـان دەرکـردووە و ئەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەی گرتووەتەوە، بڕوانە شـوێنەواری هۆرییەکـان لە زۆر جێگـای ئەم ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـتە دیـارن، لە ئەرمینیـاوە کە خـاکی ئارییەکـان بـووە، نـاوی ئـارینوو بـووە، یەکەم شـاری کـوردی بووە پەرستگای ئارینووی تیادا بـووە کە ئـاگر و هەورەبرووسکەیان پەرستووە ئێستا ئەرمینیایە، واتـا لە هەمـان ڕەگەزی ئارییەکانە، کە ئـاری نەژادن، ئێسـتا بـووەتە نـاوی دەوڵەتێک کە ئەرمینیـایە، بەر لە (٣٣٠٠) سـاڵ بەر لە ئێسـتا بـووە، واتـا ئاگرییەکـان، یـان ئارییەکـان. دیـارە بـۆ یەکەمجـار مرۆڤ ئـاگری دۆزیـوەتەوە و پێموابێت لە پێش تۆفانەکەی نوح، یان جەمشید یان زودزودرا بووە، ئاگر دۆزراوەتەوە. ئەم قۆنـاغی ئـاگرە و بگـرە هەزاران سـاڵ ژیـان بەردەوام بـووە، بەم قۆنـاغەش گـوتراوە سـەردەمی متراییەکـان، بە بۆچـوونی خـۆم و لێکدانەوەی سەرچاوەکان و ناوەکان و شـوێنەوارەکان، ئەم سـەردەمە ئەمـڕۆ پێـی دەڵـێن سـەردەمی ئـادەم و حەوا، هەتـا سـەرهەڵدانی لافـاوەکەی جەمشـید، نـوح پێغەمبەر لەم شـارەدا بـووە، ئـاگر بـووەتە هۆی ڕزگارکردنی ژیانیان و پێشکەوتنیان لە هەموو ڕوویەکەوە، بۆیە بە پیرۆزیان زانیوە و دین و ئیمانەکەشیان و هەموو بیروباوەڕیـان لە سروشـتەوە هـاتووە و سـەری هەڵداوە، وەکـو: ئـاو، ئـاگر، تاریکـایی، مانـگ، ئەسـتێرە، هەورەبرووسـکە، دار و بەرد، گـا، مـار، مەیمـوون و زۆر شتی تر بووە، هەتا بەرزبوونەوەی ئـاوی شـاخەکان، دیـارە دۆڵ و شـاخەکان دەرگایـان نەبـووە و سـەرەتای بەرزبـوونەوەی پـلەی گەرمـا بـووە بـۆ سـەرووی سـفر، سـەری سـاڵیش بـووە و بەفرەکـان تـواونەتەوە، واتـا مەنفەز بـۆ دەرچـوونی ئـاو نەبـووە، تـا پـڕ بـووە و خاڵیبووەتەوە و دابەزیوە، ئەوجا بەهۆی کەشتییەکانەوە، یـان دەشـێت

شاخی بەرزتریش بووبێت، خۆ مەرج نییە هەموو شاخەکان بە قەپان یەک ئاسـت کـرابن، بێگومـان شـاخی بەرزتـر هەبـووە و گواسـتوویانەتەوە بـۆ شـاخی بەرزتـر و ڕزگـاربوون، لە پاشـان خۆشییان کردووە و ئاگریان کردووەتەوە و ناویان ناوە نەورۆژ، واتا ژیانێکی نوێ و ئاخێکی تازە، ئەو نوێ- یە ئێستا کراوەتە نەورۆز، ئەم ڕووداوەش لە شاخی گودیەوە سەری هەڵداوە، ئەو شاخەش لە باکووری کوردستانە، شاخەکەش ئەو ڕۆژە ناونراوە، واتا شوێنێکی باشە، گود واتا باش، ئیتر ژیانی نوێ لەوێوە دەستی پێکردووەتەوە و هەتا ئەمڕۆ بەردەوامە، جا یەکەم شاریش کە دامەزراوە ناوی شاری نوێیە، یان شەڕناخ لە باکووری کوردستانە، هەروەها شاری بۆتانیش هەیە هەر ئەوان بونیادیان ناوە، شاری باشان، یان بۆتان، ئەمجار دەیەها شاریان دروستکردووە و چینایەتی دروست بووە و ڕژێمی ئاغا و جوتیار و دەوڵەتداریی دەستی پێکرد، لە شاری ڕووهاوە، یان ڕووحاوە دەستی پێکرد، ئەو شارەش لە ڕۆژئاوای کوردستانە، یەکەم پاشاش یان ئیمپراتۆر نەمرووود بووە و یەکەم کەسیش بووە بتخانە و پەرستگای دامەزراندووە و خەڵکەکەی ڕاکێشاوە بۆ ناو شار، بە زۆری ئەنکـی پـاڵەوان کە دایکـی ئەنکـی پێشـەوایان بـووە، هەر لێرەشەوە دووبەرەکی دروست بووە، هەتا ئەو کاتە خەڵکی سروشتی ژیـاون و سروشـتیان پەرسـتووە. هەمـوو جوتیارەکـان لە ترسـی نەمرووود و ئەنکیدا هەڵاتوون بۆ شاخەکانی شەنگار و دەوروبەری، لەسـەر ئەم ڕووداوانە دووبەرەکـی دەکەوێـتە نێـوان دایە ئانانـا و نەمروودەوە، چونکە دایە ئانانا ناهێڵێت خەڵکەکە بێنە شارەوە و ببنە کۆیلەی پاشـا ، دایە ئەنانا دەزانێت پاشـا هێز دەنێرێتە سـەریان زوو بەخەڵکەکە دەڵێ خۆتان لە زوڵمی نەمرود ڕزگاربکەن چەند ڕۆژێک پـێش ئەوەی پاشـا هێرشـیان بکاتەسـەر ئەوان بەمـاڵ و منـداڵ و حاڵیانەوە هەڵدێن بۆ شاخە سەختەکانی دەوروبەر دایە ئەنانا بەتەنیا

دەمێنێتەوە لەماڵدا و هەتا دەمرێت کۆڵنادات بەهیچ شێوەیەکیش حساب بۆ پاشا ناکات چونکە دایە ئەنەنا ویستویەتی گەلەکەی بەسەربەرزانە بەکشتوکاڵ و ڕەنجی شانی خۆیان بژین و دوور لە فرتو فێڵی پاشا نەمرود کەمەبەستی کۆیلەکردنیان بووە جا نەنە ئەنانا دانشتووە هەتا بە ئەمری پاشا نەمرود ئەنکی کوڕی هاتۆتە سەری و بە زنجیر بەستویەتییەوە بەئەسپەکەیەوە و بەڕاکێشان بردوویەتی بۆ بەردەمی پاشا نەمرود نەمرود زۆر هەوڵیداوە نەنە ئانەنا لەخشتە بەرێ هەتا خەڵکەکەش ساردبکاتەوە بڵێ ئەوە پێشەواکەتانە ، بەڵام سودی نەبووە کەسیش نەیتوانیوە دایە ئەنانا قایل بکات ، جگە لە ئەنکی کوڕی ئەنکیش هیچی پێنەکراوە ، ئەنکی پاشا بە تەماحی کچەکەی و ماڵ و سەروەت فریوی دەدا و دەینێرێت بە زنجیر دایکی دەبەستێتەوە و ڕایدەکێشێت بۆ ناو کۆشک، دایە ئەنانا کۆڵ نادات و پاشاش بە نامرۆڤانەترین شێوە دەیکوژێت ، کە لەبەر دەرکی پەرستگا دەیبەستێتەوە و بڕیار دەدات هەرکەسە کە دێت بۆ پەرستگا، پیسیی بەسەردا بکەن تا دەمرێت. دایە ئەنانا بەو شێوەیە دەکوژێت و لە پاشانیش ئەنکیش دەرماندخوارد دەکات. لە پاش ئەم ڕووداوە زۆربەی گەلەکەی لێی تەوەلا دەبنەوە و ڕوو دەکەنە شاخەکانی شەنگال و دەوروبەری جا ئەم بەسەرهاتە لە مێژووی سۆمەریەکانا بەجوانی ڕەنگی داوەتەوە ، لەدوای ئەم ڕووداوە دەڵێن: ئیبراهیم کوڕی ئاگر، یان ئازەر باوکی پەیکەرتاش دەبێت لای نەمروود لە بتخانەکەدا کار دەکات، ئیبراهیمیش لە بەردەستیدا کار دەکات، شەوێکیان بە تەور هەموو بتەکان دەشکێنێت و بە خەڵکەکە دەڵێت ئەم بتانە ناتوانن بەرگریی لە خۆیان بکەن، دەشێ چیان پێ بکرێت بۆ خەڵکی، بۆیە دەڵێت خودایەکی تاقانە هەیە، ئەو خۆرەش نوورەکەیەتی. بێگومان خۆر سەرچاوەی ژیانە، بەتایبەت لەو ڕۆژگارەشدا کە چەندە سەرماوسۆڵە بووە، بۆیە لە پاش هاتنەکایەی

ئەم ئاینەوە، هەموو هاتنە سەر ئاینی حەزرەتی ئیبراهیم، چونکە حەزرەتی ئیبراهیم ئەم ئاینەی گەیاندە ئۆرشەلیم، واتا خۆرمایەی ژیان و سەلامەتیە شەلیم واتا سەلیم هەرسەلام و عەلەیکەکەی ئێستایە ئەوە بۆ خۆی بەڵگەیە، ئەمە لە پاش ئەوەی نەمروود پێی دەزانێت و بڕیار دەدات لە ناوەڕاستی شاردا بیسوتێنن، ئەویش بە خۆی و بنەماڵەو لایەنگرانییەوە هەڵدێن بۆ ناو کۆمەڵەکەی دایە ئانانا لە کێوەکان، بەڵام دەزانێت نەمروود وازیان لێناهێنێت، سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەڕۆن بەرەو خوارووی کوردستان، دەیان شار و گوند و شارۆچکە دروست دەکەن، باشترین نموونە و بەڵگەیان شار یان قەڵای ئۆرکە، یان جێگەورەیە کەلە باشووری کوردستاندایە، عەرەب پێی دەڵێن زەقورە و هەتا دەگەنە ناوچەکانی فەلەستین دەوروبەری هەموویان ناوی ئۆریان پێوەیە ، واتا هۆر، یان خۆر، چونکە خۆریان پەرستووە. تۆ بڕوانە ئاڵاکەی ئیسرائیل هەر خۆرەکەیە و کەمێک گۆڕانکارییان تێدا کردووە، پەڕەکانیان کەمکردووەتەوە، هەمان ئاڵا کۆنەکەی سەردەمی نەمرووده، هەر لە سەردەمی ئیبراهیم و نەنە ئانانادا خودا و شەیتان دروست بووە، ئەم چیرۆکانە پەرەیان سەندووە و هەر سەردەمەو گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتووە، لە حوکمی هەر بنەماڵە و پاشا و ئیمبراتۆرییەکدا یاسا و دەستووریان هەبووە، کە عەقڵی نوێ و بیری نوێ و نەوەی نوێ داهاتووە، بێگومان گۆڕانکاریی بەسەر ناوچەکەدا دێت، باوەڕی نوێ دێتە ئاراوە و باوەڕە نوێیەکە بە کۆنەکە ڕازی نەبووە و ئۆپۆزسیۆن دروست بووە و گۆڕانکاریی بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، هەروەها دەستووری نوێ هاتووەتە ئاراوە، ئەوانەی ڕابردوو بوونەتە ئەفسانە، زۆرجاریش لە یەکتری دابڕاون و شوێن و مەئوای خۆیان بەجێهێشتووە و هەر ڕۆیشتوون بەرەو خوارتر، هەتا دەگاتە میسر و ئەو ناوچانەی هەتا ئێستاش لێی دەژین، کە پێی دەڵێن فەلەستان، یان فەلەستین، یان بەنی

ئیسرائیل، واتا نەوەکانی ئیبراهیم پێغەمبەر، بەڵام کۆمەڵەکەی نەنە ئانانا لە شوێنی خۆیان دەمێننەوە، کە ئەو ئێزدیانەن ئێستاش لەوێن. دەگێڕنەوە گوایە زەردەشت هەر ئیبراهیم پێغەمبەرە ناویان لێناوە ئیبراهیم، چونکە گوتوویەتی ئەم دینەی من دینی برایی و ئاشتییە، خۆشیان ویستووە، پیان گوتووە برایمە، واتا برای ئێمە، بەڵام وا نییە برایم پێغەمبەر ناوی سەفایە، بەڵێ ڕاستە دینەکەی دینی برایی و ئاشتی بووە، بەڵام ئیبراهیم و زەردەشت دوو کەسی جیاوازن، نێوانیشیان زۆر دوورە لە یەکەوە، (کە لە دواتردا بەڕوونی باسم کردووە زەردەشت و ئیبراهیم کێن)، نە ئیبراهیم باوکی عەرەبە و نە زەردەشتیش ئیبراهیمە، کە ئێستا کردوویانە بە باوکە گەورەی عەرەب و هەموو پێغەمبەران، هیچ کاتێک ئیبراهیم نەیگوتووە من پێغەمبەرم، ئەو بتەکانی شکاندووە و ڕایکردووە لە ترسی نەمروود، لەپاش ئەم بەسەرهاتە دەوڵەتداریی کوردی کشاوە بەرەو باشووری کوردستان و گەورەترین شاریان دامەزراندووە، ئەویش شاری کارکۆکە، واتا کەرکوک، لە شوێنێکی تردا دەڵێن: ئیبراهیم برازای نەمروود بووە و ویستوویەتی کودەتای بەسەردا بکات و سەرنەکەوتووە و هەڵاتووە بۆ میسر و دەوروبەری، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە کتێبی: پیرۆزی ئێزدییەکان) لە خوارەوە ئاماژەم پێداوە و زۆرێکیش لە سەرچاوەکان ئاماژیان پێداوە، بەڵام کەمێک شوێنەکان جێگۆڕکێیان پێدەکرێت، بەڵام هەرچی لەسەرەوە هاتووە، ئەوەیان جێگای باوەڕە، بەڵێ پێموابێت ئەگەر لە سەردەمی لافاوەکەوە خۆریان پەرستبێت، یان لە پاش تێهەڵچوونەکەی ئیبراهیمەوە بێت، خۆر بووەتە خودای مەزن لە دەستووری کوردا، بۆیە هەتا ئێستاش ئاڵاکەمان هەر خۆری تیایە، ناوی خۆر، ئۆر، ئار، نار، مەنار و مەسجد، یان مزگەوت، ئەم ناوانە تائێستاش بە هەموو شوێنەوارەکانەوە دیارە، بۆ نموونە ئۆرڤا لە

باکووری کوردستان، ئۆرەبیلۆ، هەولێر، ئۆرماتوو هۆرێن و شێخان له باشووری کوردستان، واتا خورماتوو قەلای ئۆرک له باشووری کوردستان، ئێستاش شوێنەواری ماوه، دەڵێن ئەویش ئیبراهیم پێغەمبەر دروستی کردووه، ئۆرمێ، یان وەرمێ له ڕۆژهەلاتی کوردستان، ئێستاش له ڕۆژهەلاتی کوردستاندا، بەتایبەت له هەورامانـدا سەدەها ناو و شوێنەواری هۆرییەکانی تێدایه، هەورامان پڕیەتیه له شوێنەواری هۆرییەکان، (بڕوانه به شایەتی مامۆستای بەرز و بەڕێز ئەیوبی کوێخا ڕۆستەم، چەندەها نووسینی بەپێز و بەنرخی هەیه لەو بارەیەوه، که هێشتا له ژیاندایه و خوا تەمەنی خۆش و پڕبەختەوەریی بکات).

شایەتی گەورەیی دەوڵەتی ئۆرک، یان هۆرییەکان، یان هەورامییەکان لەو سەردەمەدا فەرمانڕەوایی حەوت دەوڵەتیان کردووه، ئەوەیش ناوەکانییەتی، بڕوانه ئۆرمیه هەتا ئۆرشەلیم، ئەمه خۆی شایەته و سنووره. ئۆرشەلیم، یان قودس له ئیسرائیل، ئەمەش له نەوەکانی ئیبراهیم پێغەمبەرەوه گەیشتووەته ئەوێ، واتا سنووری دەسەلاتی هۆرییەکان، ئەوەتا مارک فان به سەردەمی ئۆرک ناویان دەبات. ئۆرک واتا ئۆرییەکان، که خۆرییەکانن، یان هۆرییەکانن، هۆرییەکان له دەریای سپی ناوەڕاست بۆ دەریای مردوو دەسەلاتیان ڕۆیشتووه و دەسەلاتیان هەبووه. هۆرییەکان لەم ناوچەیەدا کۆنترین نەتەوەن و خاوەنی کۆنترین پیشەسازیی و داهێنانن له هەموو ڕوویەکەوه، بۆ یەکەمجار سۆمەرییەکان له هۆرییەکان جیابوونەتەوه و هاتوونەته باشووری کوردستان، واتا له ئەرمینیاوه هاتوون، دیاره پایتەختی هۆرییەکان ئەرمینیا و دەوروبەری بووه، ئەم گەله له ڕوخسار و شێوەدا سووربوون، بۆیه به سوورەکان، یان سۆمەرییەکان ناویان دەرکردووه، که بەر له (٤٠٠٠) ساڵ پێش ئێستا له ڕۆژهەلاتەوه هاتوون، دیاره له چیای سورێن جێگیر بوون، ئەم

چیایە لە ناوچەی شارەزوورە و سەر بە پارێزگای هەڵوژە، یان هەڵەبجەیە، وردە وردە بەرەو باشوور هاتوون، دەسەڵاتیان گەیشتبێتە هەرکوێ ناوی ئەوانی پێوە دیارە، بۆ نموونە چیای حەمرین، واتا چیای سوورەکان، لە پاشان بوونە سۆمەرییەکان، ئەم دەوڵەتە سنووری جوگرافییان دەتوانم بڵێم باشووری کوردستان و عێراق و سووریایە و بڕوانە سووری پێوەیە، واتا مولکی سۆمەرییەکان ئەوە خۆی بەڵگەیە و ئێرانی ئێستا و هیند و ئەفغان و ئەو گەلانەش لێیان جیابوونەتەوە، لەو سەردەمەدا سۆمەرییەکان پەیوەندییان لەگەڵ نەتەوەی ئیسرائیلیدا باش بووە، چونکە یەک نەتەوە بوون، بەتایبەت لە سەردەمی داود پاشا و هەم پێغەمبەری نەتەوەی ئیسرائیلدا زۆر باش بووە، بەنی ئیسرائیلیش پێیان گوتووە حیرام، واتا سوورەکان، کە سۆمەرییەکانن. ئەو دەوڵەتە گەورەیە بەداخەوە تا ئێستاش ماون، وەکو هۆزێکیان لێهاتووە، ئەویش سورەمەیرییەکانن، واتا سوورەمێردییەکان، یان سوورەمەیرییەکان، کە ئێستاش لە خانەقین و دەوروبەری دەژین لە هۆرییەکان جیابوونەوە و هەر لەو کاتەوە دەوڵەتیان دامەزراندووە و لە پاشان ئەکەدییەکان وەکو شوانکارە هاتوونەتە لای ئەمان و چاو و دەمیان کردووەتەوە و فێری زۆرشت بوون لە سۆمەرییەکانەوە، لە پاشان سوودیان لە ناکۆکی سۆمەرییەکان بینیوە، کە پاشاکەیان نەماوە و دەسەڵات کەوتووەتە دەستی نەوەکان و دابەشیان کردووە، ئەو یەکێتییەیان نەماوە و کەوتوونەتە ململانێی یەکتر و دوژمن زەفەری پێ بردوون، هەلیان بۆ ڕێککەوتووە و دەستیان گرتووە بەسەر دەسەڵاتی سۆمەرییەکاندا و کلتووری کوردیان بۆ خۆیان قۆستووەتەوە.

سۆمەرییەکان بوون بۆ یەکەمجار دار خورمایان هێناوەتە ئەم وڵاتە و هەر ئەوان بوون نووسینی بزمارییان داهێناوە لەم وڵاتەدا. بە بۆنەی ململانێی ناخۆییەوە ئەکەدییەکان فرسەتیان هێنا و دەستیان گرت بەسەر دەسەڵات و دین و کلتوورەکەشدا هەمویان هەر کوردبونە هەریەکەو دەوڵەتی بۆخۆی ڕاگەیاندە ، ئەوانیش بۆ ماوەیەک لە پاش نەمانی پاشاکەیان بەهەمان شێوەی سۆمەرییەکان کەوتن و بابلییەکان جێگایان گرتنەوە و لەسەر هەمان دەستوور، کە دەستوورەکەی سەردەمی نوح پێغەمبەرە، دەستپێکی ژیانی نوێ بووە، واتا سەرلەنوێ جەژنی نەورۆزیش هەر لە سەردەمی نوحەوە دانراوە، چونکە سەرکەوتن و ڕزگاریان بوو لە مردن و تۆفان و نەهامەتی و شەڕ و شۆڕ و ڕەزالەت، بە دەرکەوتنی خۆر و سەوزبوونی درەخت و گژوگیا و پەیدابوونی خۆراک و دانەوێڵە، واتا خوا ڕۆژێکی نوێی بۆ ڕەخساندن و ئەو ڕۆژەیان کردە جەژنی سەرکەوتن و ڕۆژی نوێ، بە کوردی نوێ ڕۆژ، یان ڕۆژی نوێ، لە پاشان بە زمانی هۆزەکانی تر بووەتە نەورۆز هەمان مانا دەگەیەنێت، نەورۆزیش لەمەوە هاتووە، چونکە وردە وردە پلەی گەرما بەرزبووەتەوە و خۆر زیاتر بەدەرکەوتووە و تینی سەندووە و ژیانی خەڵکی پاراستووە و ژیان و گوزەران خۆش بووە، بۆیە خۆریان پەرستووە و ئاڵاکەشیان هەر خۆر بووە، هەتا گەیشتوونەتە دامەزراندنی دەوڵەت و دروستکردنی قەڵاکان، بەتایبەت قەڵای کەرکوک، هەر لەم کتێبەدا بەڕوونی باسم کردووە، کە بیست ویەک ئیمپراتۆرییەت حوکمڕانی تیادا کردووە، بیست ویەک پەڕەی خۆرەکەش گوزارشت لەوە دەکات و ئاڵاکەشیان هەمان ئاڵای ئێستایە، بابلییەکانیش بە هەمان دەستوور و یاسا و ئاڵا و کلتووری کوردی سۆمەری. ئەمانیش بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ هێنایان و بە هەمان شێوەی ئەکەدییەکان کەوتن و ئاشوورییەکان سەریان هەڵدا،

بەڵام ئاشـووریيەکان پـێم وابێـت هەر لە نەوەی ئەکەدییەکـانن، دیـارە
دینەکەیان گۆڕیوە، کە ناوی خواکەیشیانە و هەم پاشاکەیشیانە، بۆیە
بە ئاشوورییەکان ناویان دەرکردووە، زۆر زاڵم و دڕندە بوون لەچاو
ئەمانی تر، چەندەها تەپۆڵکەیان لە کەللەسـەری ئەم گەلانەی ئەم وڵاتە
دروستکردووە، بەتایبەت کورد، کە بە کۆمەڵ کوڕ و کچی کوردیـان
سـووتاندووە و مەنجەلیقـی بـۆ کـردوون، ئەکەدی و بابلییەکـان پـێم
وابێــت ململانێیــان تەنهــا لەگەڵ ســۆمەرییەکاندا هەبــووە، بەڵام
ئاشـوورییەکان تەواوی وڵاتـی هۆرییەکـانی گرتـووەتەوە، هەتـا بەرەو
ئۆرشــەلیمیش چــووە و گرتــوویەتی و کــاولی کــردووە، هەروەهــا
خەڵکەکەی ڕاگوێزاوە بۆ بابل، زووڵم و زۆری ئاشـوور لەکارا بووە
هەتـا سـەرهەڵدانی ئیمپراتـۆری مەزنـی کوردی مـادد بە سـەرۆکایەتی
کەیخەسرەو، شای ماددەکان، لە ڕۆژهەڵاتەوە خۆی ڕێکخسـتووەتەوە
و هێرشــی بــۆ هێنــاون و تەفروتوونــای کــردوون، کە پـایتەختەکەی
ئاشـوور لە نەیـنەوا بـووە، لە دەوری سـاڵی (٧٠٠)ی پ.ز بـووە، ئەم
ئیمپراتــۆرییەتە هەتــا ســەردەمی ئەسـتیاکی کـوڕی کەیخەسـرەو لە
کۆتـایی تەمەنـی ئەستیاکدا لە کـاردا بـووە، بەڵام بەبـۆنەی نەزانـی و
کەللەڕەقــی ئەســتیاکەوە ســەربەخۆیی خــۆی لەدەســت داوە و
کەوتـووەتە دەسـت فارسـەکان، فارسـەکان هەتـا سـاڵی (٢٥٠)ی پ.ز
خاوەنی هیچ شتێکی تایبەت بە خۆیان نەبوون. کورد بە گردی مـاڵ و
موڵکی خۆی پێشکەشکردن، بە دەستی خۆیان خۆیانیان کردە کۆیلەی
فارس. فارس هەتا ناوەکەشی هی خۆیان نییە، فارس واتا پـارس، یـان
پەهلەوی وا تـا پاڵەوانەکـان، ئەوەش بە کوردیـان گوتـووە، بـا لەوەش
گەڕێین هەتـا سـەردەمی ساسـانییەکان دیـارە بە هاوبەشـی حـوکمی
ئێرانیان کردووە، چونکە لەو مـاوەیەدا ململانێ نەبـووە لەنێوان کـورد
و فارسدا، هەتا هاتنی ئەسکەندەری مەکدۆنی، لێرەدا پرسـیارێک دێتە
ئـاراوە، ئەویــش ئەو پرسـیارەیە: ئەو مێـژووەی کــورد بــۆچی وا

شێواوە؟ بەتایبەت کاوەی ئاسنگەر و زووحاک و نەورۆز، ئەمەیان چۆن وا تێکەڵەو پێکەڵ بووە و کەس سەری لێ دەرناکات، دەتوانم بڵێم فارس و عەرەب و تورکیش هەتا جاشەکانی ناوخۆش دەستێکی باڵایان هەبووە لە شێواندنی نەورۆزدا، هیچ پەیوەندی بە زوحاکەوە نییە، وەک لە پێشتردا باسم کردووە، زوحاک و کاوە و کۆمەڵێک شتی تر دروستکراون بۆ سەرلێشێواندنی مێژوو، کە کەسانێکی بەم ناوانەوە نییە، کاوە کۆرشی هەخامەنشییە و زووحاکیش ئەستیاکە، کوڕی کەیخەسرەوە و ئیمپراتۆری مادده وایان لێکردووە، ئەمانە لە ئەفسانە دەچن، بەڵام نەورۆز لە سەردەمی نوحەوە دەستی پێکردووە، واتا ڕزگاریان بووە لە دەست تۆفان و مردن وا ژیانێکی سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە، هەتا ناوی نوحیش هەر لە ژیان و ئاخە نوێکەوە هاتووە، بڕوانە نوخ نوێ ئاخ، واتا ئەو جێگا و مەئواو شوێنەی پێشوویان نییە، هەرچەندە زۆر دوور نەکەوتوونەتەوە، بڕوانە وشەی کرمانج چی دەگەیەنێت، کوردمان لە جێ، واتا لە جێی خۆیان مانەوە، کورمانج، کرمانج، کورد مانجێ، واتا کورد لە ئاخ و جێگا و مەئوای خۆیان مانەوە، بەڵام هەموو شتێک نوێ بووەوە، ژیانەکەشیان ژیانێکی سەرلەنوێیە لەوەوە هاتووە، بۆیە هەموو ساڵێک لەوکاتەدا ئاهەنگیان گێڕاوە، ڕێک دەکەوێتە (٢١)ی مانگی سێ-وە، کە دەکاتە سەری ساڵی کوردی، ئیتر بەهارە و ئاووهەوا خۆش دەبێت و سەرماو سۆڵە نامێنێت، چونکە ئاویش لەدەریاچەکاندا نەماوە وکو جاران ئیتر هەورو تەمومژ کەمبۆتەوەو تیشکی خۆربەدەر کەوتەوەو خەڵکی بوژاونەتەوەو وردە وردە مرۆڤەکان جوڵەیان تێکەوتووە ولەگەڵیشیدا هۆش وبیریان بەکارهێناوەو پێشکەوتون بەڵام سەردەم سەردەمی بەفرو بەستەڵەک بووە، بەڵام لەپێشاندا ئاستەنگ لەکوێ بووە لەوێدابووە هەمودەریاچەکان سارێژ نەبوەن تیشکی خۆربەدەرنەدەکەوت ژیان

ئەستەمبوو لە پاش تۆفانەکە یان لافاوەکە ژیان دەستی پێکردووە نەهامەتیەکان کۆتایی دێت و ڕزگاریان دەبێت ، ئیتر ئەمە دەبێتە کلتوور و یاسا و جەژن و بۆنە و نەریتی باو وباپیرانمان، بۆیە پیرەمێردی نەمر گوتوویەتی: (ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە، جێژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بە هاتەوە)، کە بە دەنگە خۆشەکەی مامۆستا حەسەن زیرەکی نەمر و مامۆستای شاعیر و مەقام بێژ حەمەساڵح دیلان خوێندراوە و پێموابێت ئاوازەکەشی هی بەڕێز مامۆستا حەمەساڵح-ە، کە بووەتە مارشێکی نەتەوەیی دیاری کورد، واتا ژیانێکی پاک و پڕ خێر و بەرەکەت و سەرلەنوێ.

خوێنەری بەڕێز با ئەوەش بزانیت، لە پێش لافاوەکەشدا لایەنگرانی نوح و خەڵکی تر هەر لە شەڕدا بوون، بڕوانە فیلم و دراماکان کە ڕۆژانە لە میدیاکاندا نمایشی دەکەن، باسی ئەو شەڕانەش دەکەن، واتا لە شەڕوشۆڕیش ڕزگاریان بووە، ئەو شوێنەی کە کەشتیەکەی لێ گیرساوەتەوە، ئێستاش هەر ماوە و ناوەکەشی کوردیە، ئەگەر بپرسیت چۆن گەیشتوونەتە ئەوێ، نەتەوەی عەرەب، بەتایبەتی دەڵێن ئاوەکە هەڵیگرتوون و سووڕاونەتەوە، باشە با بڵێین وایە، خۆ ئاوەکە بەرەوخوار چووە، بەرەو ژوور نەهاتووە، نەتەوەی عەرەب لە نەوەی کوڕە گەورەی نوحن، واتا سام، ئەم گەلانەش لە پاش هەزارەها ساڵ سەریانهەڵداوە و پەیدا بوون، هەر لە هەمان نەتەوەی نوح پەیدابوون و جیابوونەتەوە. بڕوانە مێژووی مرۆڤ لە پێش (٥،١٣) ملیار ساڵەوە هەتاکو ئەمڕۆ، دەڵێیت هەموو مرۆڤەکان لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە، یان خۆرهەڵاتی تورکیاوە، واتا کوردستان، ئەوکاتە تورک لێرا نەبووە. نووسەر بە زمانی ئەمڕۆ قسە دەکات، یان لەسەر جوگرافیای ئەمڕۆ ئەو ناونیشانەی داوە و دەڵێت: بەرەوخوار هاتوون، گەیشتوونەتە

ئوستورالیا و ئەوروپـا. (بڕوانە: مێژووی مرۆڤ، نووسینـی: یوڤـاڵ نـوح هەراری، ل٧ –٢٠). کەواتە ئەمە ئەوە دەسەلـمێنێـت مرۆڤـایەتی نەوەی نوحن، یان زودزوودرا لە گلگامشدا دەڵێ مـاوە نەمردوە چۆن باسـی خدری زنـدەدەکەن لەئاڤێستاشـدا دەڵێن نـاوی جەمشـیدە و لە کوردستانەوە بڵاوەیان لێکردووە لە پاش لافاوەکەوە. (لە دواتـردا بە ڕوونـی باسـم کـردووە). بـڕوانە ئیبراهـیـم پێغـەمبەر چـۆن لە مـامی نەمـرووود وەک ئەڵـێن بەڵام هـیچ کـاتێ بـرازای نەبـووە لەسـەرەوە ئاماژەم پێکردووە جیابووەوە و بەرەوخوار ڕۆیشت تا گەیشتە میسـر و دەوروبەری، کە بوونەتە هەزارەها هۆز و تیرە و گەڕاونەتەوە ژێر دەسـەڵاتی کـورد و بـوونەتە بەشـێک لەم کلتـوورەی گەلـی کـورد. مەبەسـتم لە نەوەی سـامی کـوڕی نـوحە، لە هەمـوو ڕوویەکەوە نـاوچەکە زۆر ئـارام بـووە و بەرفـراوان بـووە و گەشـەیەکی باشـی بەخـۆیەوە بیـنیوە، چەنـدەها هـۆز و تیـرە و هەتـا پاشاشـی لـێ جیـابووەتەوە و دیـن و مەزهەبیشـی لـێ جیـابووەتەوە، ئەم نەریـتە بەردەوام بـووە هـەتا هاتـنی ئەسکەنـدەری مەکـدۆنی، پاشانیـش ئیسـلام ئەوەنـدەی تـر کلـتوور و مێـژووی کوردیـان شـێواندووە، بە کورتییەکەی هەموو گەلان دەستیان هـەیە لە شێواندنی مێژووی گەلی کـورد دا، بەڵام یەک لە دوای یەک هەریەکەیـان لە کـات و سەردەمـی خـۆیدا، ئەگینـا خـاوەنی یەکەمـی ئەم نـاوچەیە کـوردە، کە سـەردەمی نەمرووود پاشا بووە و بە سەردەمی ئۆرک ناسرابوو، واتا ئۆرییەکان، یـان خۆرییەکـان کە خۆریـان پەرسـتووە، پایتەختەکەشـی یەکەمجـار ڕووهـا بـووە لە ڕۆژئـاوای کوردسـتان، لە پاشـان دابەزیـن بـۆ قەڵای کـارکۆک، یـان کەرکـوک، بـۆیە ئاڵاکەشـیان خـۆر بـووە و ئیبـراهیم پێغەمـبەریش لەسـەر گـۆڕینی دینەکە شـەڕی بـووە لەگەڵ نەمـرودا، چونکە ویستویەتی لە خۆر پەرستییەوە بیکات بە بتپەرستی تۆبڕوانە حەزرەتـی ابـراهیم هەر دینـی هۆریکـانە بردوویەتـی بـۆ ئۆرشـەلیم

شـــايەتی لۆژيـــک ئەوەيە نـــاوی ئۆرشـــەليمە پەرســـتگاکەيان هەتـــا سـەرهەڵدانی ئيسـلاميش هەر ئەوێـی پيرۆز بـووە بـۆيە ئيسـلام پێـی دەڵێت قـودس واتـا پيـرۆز بەڵـێ لەپێـشدا هۆريکـان واتـا سـەردەمی نەمروود شـا حـوکمی حەوت دەوڵەتـی کـردووە و هەمـوو جيهـان هەر حەوت دەوڵەت بوون و ئەمڕۆ بەڵگەش زۆرە، بەڵگەی حاشـاهەڵنەگر کوڕێکی خـاڵۆزام کە نـاوی ئەيـوب ڕەشـيد کەريمە، مـاوەيەکی زۆر لە بەريتانيـا بـوو، وتـی: مـن کـارم دەکـرد لەلای پيـاوێکی بەريتـانی، هەر بانگی دەکردم، هۆی زەردەشتی، گوتم: بۆچی وام پێدەڵێيـت؟ گـوتی: ئێوە زەردەشتين لـە بنەڕەتدا، گوتی: من نەمدەزانـی ئەو فـێری کـردم من کێم لە بنەچەدا، بەڵێ گوتی کورد دينی زەردەشتی بـووە لە کۆنـدا، پيـاوەکە نـاوی دەيڤـد وێلسـن بـوو، زۆر خـانەدان و دەوڵەمەنـد بـوو، خوێنـدەوار بـوو، چەنـدەها کتێبـی مێـژوويی هەبـوو، پيـاوێکی هەتـا بڵێيت ڕۆشنبيـر بوو، تەمەنی ئەو کتێـبانە لەلای ئەمـان خۆی داوە لە نـزيکەی دووسـەد سـاڵ، بەلام نـازانم مێژووی چـاپ و نووسـينی بـۆ کەی دەگەڕێتەوە، دەکرێت هەر زۆر کـۆن بـن، هەمووپـان دەربـارەی مێـژووی کـورد و کوردسـتان بـووە، پـرسياری لێـکردم گـوتی: تـۆ کوردی و پەناهـەندەيت؟ گوتم: بەڵـێ، پەناهـەندەم. گوتی: بـەداخەوە دەبـووايە ئـێمە پەناهەنـدەی ئێـوە بووينـايە، چـونکە ئـێمە و هەمـوو مرۆڤـايەتی نەوەی کـوردين، ئەو کتێبـانەش هەمـوو بەڵگـەن، گـوتی: زۆر لێـی پـاڕامەوە کتێبێـکم بداتـێ، نەيـدامێ، گـوتی: لە هەمـوو سەروەت و سامانم بەنرخترن، بمبوورە، هەرچيت دەوێت بيبە، بەلام داوای ئەوانە مەکە، ئەو کتێبانە لە باوکمەوە بۆم بەجێماوە، وەسێتی بۆ کردووم لـەناويان نەبـەم، بـاوکم (٩٦) سـاڵ تەمەنـی کـردووە و ئەو کتێبانەی هەڵگرتـووە، ئەوا خۆيشـم تەمەنـم (٨٥) سـاڵە ئەم کتێـبانەم هەڵگرتووە. گوتوويەتی باسی سەردەمی نوح دەکـات، کە کـورد بـووە، بەلام چی بکەم لە ئەمڕۆ خەڵکی غروورن و پێ لە حەق نـانێن، بـڕوانە

فەیسبووک و مێژووەکان و شوێنەوارەکان، گومانی ناوێت لە پاش نەمانی نەمرووود، کە کوڕەزای نوحە، باوکی نوحیش ناوی لامەخە، لە دوتردا بەدرێژیی باسم کردووە، ئەم ناوچەیە زۆر گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە و دەیان زلهێزی تر دروست بوون و دەسەڵاتی ناوچەکەیان گرتووەتە دەست و مێژووی ناوچەکەیان شێواندووە، بۆ نموونە ئاشوورییەکان و ئەکەدییەکان و بابلییەکان و دەیانی تر هەتا هاتنی ئەسکەندەر بەشی زۆری ئاسیای داگیرکرد و هەموو گەلانی ناوچەکە بوونەتە ژێردەستەی ئەسکەندەر، بەڵام کورد بەناویترەوە حکوم ڕانبونە گەورەتیرین گەل لەناوچەکەدا کوردبووە نەتەوەکانی تر لەناوکوردا تواونەتەوە لەوانەیە لەوسەردەمەدا وەکو دەسەڵات فارس دەسەڵات بەدەست بووبێتن بەڵام هیچی پێنەکراوە بەرانبەر بەکورد چونکە ، خاک و ئاو و گەلەکەش هەرە زۆری کورد بوون، بە لاوازبوونی فارس و مردنی ئەسکەندەر کوردی ماد سەریان هەڵداوەتەوە و بوونەتە دوو بەش، ماددی گەورە و ماددی بچووک، ماددی بچووک بە سەرۆکایەتی ئاترۆپاتیان، کە ژەنەڕاڵێکی سوپای مادد بووە و زۆر خۆشەویست بووە لەناو کوردا، بۆیە بووەتە پاشای ئاترۆپاتیان، واتا ئازەربایجان، بناغەی ناوەکە لە ئاگرپارێزەوە هاتووە، کە ناوی پاشاکەش بووە، واتا ناوێکی دینی ئەو سەردەمە بووە. ئەم ئازەر بایجانەی ئێستا کە دەڵێن تورکە لە بنەچەدا کوردن، تورک شوێنی ناوەڕاستی کافکازە، یان قەفقازە، لە ناوەڕاستی وڵاتی چیندایە، تورک ئەم ناوەشی لەم وڵاتە بەدەستهێناوە لە دواتردا بە درێژیی باسم کردووە، ئەگەر بەجوانی بڕوانێتە مێژوو و دابونەریتەکان، شوێنەوارەکان کلتووری ئەم گەلانەی چواردەورمان کۆپی هۆرییەکانن بە دین و سیاسەت و هەموو داهێنانێکیانەوە. لەو سەردەمەدا هۆرییەکان گوتوویانە ئەم خۆرە پڕ نورە خوایە، دەمانپارێزێت، ژیانمان پێ دەبەخشێت،

لە هەموو ڕوویەکەوە دونیا پڕ نور و شەوق دەکات، ئەوەتا ئێستاش دینی ئیسلام کە دوایەمین دینە، دەڵێت: خودا نورە. هۆرییەکان هەر هەورامییەکانن، واتا خۆرییەکان، یان خۆرپەرسەکان، کە زۆر پێشی هەموو دینەکان بوون، بێگومان ئەم بیروباوەڕە دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی چاخی بەستەڵەک، کە وردە وردە خۆر بەدەرکەوت و سەر زەوی بووژاوەتەوە و بەروبووم پەرەی سەندووە و مرۆڤ ئاهێکی بەبەردا هاتووەتەوە، ناوچەکەش لە هەموو ڕوویەکەوە گەشەی کردووە و پێشکەوتووە و چەندەها قۆناغی بڕیوە، هەروەها بیروباوەڕی نویٚ هاتووەتە ئاراوە، تا گەیشتووەتە قۆناغێکی باش، بەتایبەت لە پاش میترایییەکان، واتا سەردەمی ئارییەکان، پەیدابوونی زەردەشت و زەردەشتییەکان، واتا پەیڕەوکارانی ئاینی زەردەشتی: زەردەشت زۆر گۆڕانکاریی بەسەر ناوچەکەدا هێناوە لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەم لێرەدا گەیشتووەتە ئەو بڕوایەی دەڵێت: (دوو خودا هەیە، خودای خێر و خودای شەڕ، ئەوەتا ئێستاش بەهەمان شێوە شەیتان خودای شەڕە و خودای تاک و تەنیاش هەیە. زەردەشت بە بناغە دانەری دۆزینەوەی خودای یەکتا دەژمێردرێت، لەو بیروباوەڕانەی مێژوو دەژمێردرێت کە پێشکەوتنێکی باشی بەخۆوە بینیبێت، لەو سەردەمەدا، کە لەلایەن کەسایەتییەکی بە ڕەگەز کوردی بە ناوی زەردەشت کوڕی پورشاسپ) سەری هەڵدا، هەر بە ناوی ئەویشەوە ناونرا (زەردەشتی) خودی ناوی (زەردەشت)یش لە زاراوەیەکی پەهلەویی بە شێوەی (زەردەشت) هاتووە، بە مانای (ئەستێرەیەکی ڕووناک و درەوشاوە و جوان)، دواتر زاراوەکە وەک ناوی چەندین هاوڵاتی ئاسایی لە قۆناغی مێژوویی کۆندا بەکارهێنرا، کە یەکێک لەوان (زەردەشت)ی کوڕی پورشاسپ بوو، ئەم بیروباوەڕە سەرەتا لە ناوچەیەکی دیاریکراوی ئازەربایجان، یان ئاترۆپاتیان سەری هەڵدا، زۆری نەخایاند بە سەرتاسەری

کوردستاندا و دواتر بە زۆربەی جیهاندا بڵاوبووەوە، تەنانەت لە چەند ناوچەیەکی جیهاندا وەک ئاینێکی ئاسمانی گەورەش ناسرا، ئەمە و ئەم ئایینە وەک بیروباوەڕێکی مێژوویی لە ناوی ئەو کەسایەتییەوە سەری هەڵدا، کە بانگەشەی بۆ پەیامەکە کرد، ئەویش (سیتاما زەردەشت) بوو، لەمەوە سەرجەمی ئەوانەی بوونە هەڵگری بیروباوەڕی ئەم پەیامبەرە، ناوی زەردەشتیان لێنرا، واتا زەردەشتییەکان کەسایەتی (زەردەشت)، کە ناوی تەواوی سیتاما کوڕی پورشاسپ بوو، دایکی ناوی دۆغدا (ساڵی ٦٦٠ پ.ز). لەدایک بووە)، پێموابێت زۆر لەم مێژووە زووتریش بووبێت، چونکە مێژوونووسان هەریەک بە جۆرێک باسی دەکەن، من بۆم دەرکەوت ئەو زۆر لە پێش کەیخەسرەودا بووە، کەیخەسرەو لە ساڵی (٧٠٠)ی پ.ز دەسەڵاتی ئاشووری ڕووخاندووە. زەردەشت لە ئازەربایجان لە خێزانێکی ئاسایی لە نزیک دەریاچەی ورمێ، واتا شاری میترایەکان، یان وەرییەکان لە هەرێمی مادد لەدایک بووە، دیارە ئەو سەردەمە ئازەربایجان کوردستان بووە، ئەمە ئەوە دەسەلمێنێت کە مامۆستا هەژار موکریانی دەڵێت: بە ئازەرییەکانم گوتووە ئێوەش کوردن، بڕوانە هونەریان کە چەندە لە کوردەوە نزیکە، (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مرۆڤ و ئاینەکان، میشیل مالرب، ئەم پیاوە پشتی بەتاتە قوڕینەکان بەستووەو شوێنەوارەکان و زۆر گەڕانی مەیدانیشی کردووە (١٩٩٠). ئەگەر لێی بڕوانیت تێدەگەیت تۆ کێیت.

(زەردەشت) بۆ ماوەی دە ساڵێک بە تەنها لە دەرو دەشتدا ژیاوە، لە تەمەنی سی ساڵیدا دەستی بە خوداپەرستی کرد و لەلایەن خەڵکەکەیەوە دژایەتییان کرد، بەتایبەت ئەو شوێنەی کە تیایدا دەژیا، واتا ئازەربایجان، یان ئاترۆپاتیان، لە پاشان سەری خۆی هەڵدەگرێت و ڕوو دەکاتە هەرێمی (باختر)، گۆشتاسپ-ی

فەرمـــانڕەوای هەرێـــمەکە پشتگیـــری دەکـــات و بیروبـــاوەڕەکەی لێوەردەگرن و بـڵاوی دەکـاتەوە، لێـرەدا پرسـیارێک سـەرهەڵدەدات، مەقامیـــک داهێنـــراوە بە نـــاوی گـــۆشت، دیـــارە بە گۆشتاسپـــدا گوتراوە، هەر لەوێش خێزان پێکەوە دەنێت، ناوی خێزانیشی (هۆی) دەبێـت، ئەگەر بڕوانیـت ئێسـتاش لە درامـا کۆرییەکانـدا زۆر نـاوی خاتوو هۆی-ت بەر گوێ دەکەوێت، زەردەشت شەش منداڵیشی لـێ دەبێت، سـێ کچ و سێ کوڕ بە ناوەکانی: (دیست واستر, ئۆروتتنـر, هۆر چیترا)، بڕوانە ئەم ناوە دینییە، هۆر واتـا خۆر، نـاوی شاری خۆراسـانیش هەمـان نـاوی پـیرۆزی هـۆر، یـان خـۆر، وە سـێ کچەکـەش: (فـرنی, تەهریتـی, پئوروچیسـتا) ئەم نـاوانەش خۆریـان تیایە، لە پاش (٤٧) سـاڵی پەیامبەرایەتی، لە تەمەنی (٧٧) ساڵیدا و لە سـاڵی (٥٨٣ی پ.ز) لە شـەڕێکدا بە دەسـتی تـورکە بتپـەرستەکان شەهـید دەکـرێن، لێـرەدا پرسـیارێک سـەر هەڵـدەدات، زۆر لە مێژوونوسـان دەڵـێن لە سـاڵی (٧٥٠)ی زایینـی تـورک بە دەسیسـەی پاشـایەکی کورد هـاتوونەتە ئازەربایجـان، لە زۆر شـوێنی تردا دەڵێن زەردەشت لە ساڵی (٦٦٠)ی پ.ز هاتووەتە ژیان، ئایا دەکرێـت تـورک پـێش ئەوەی بێـتە کوردسـتان، هەر هێرشـیان هێنابێـتە سـەر کوردسـتان؟ بێگومـان تـورک هەر شەڕانگێـز بـوون، بەبـۆنەی شەڕانگێزییانـەوە مەغۆلـەکان دووریانخستوونەتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاستی ئاسیا، لە کتێبی ڕۆستەمی زاڵدا باسی شـەڕی توران و ئێران دەکات تەنانەت زۆر لە مێژوونووسـان دەڵێن زەردەشـت لەبەر ئاگردا و لە کـاتی نوێژدا کوژراوە بە دەستی تورک، ئەمە بۆ خۆی سەلمێنـراوە و بەڵگـەیە زەردەشـت کـورد بـووە، مـادام تـورک کوشتوویەتی، بەڵێ کتێبی پیرۆز (ئاڤێستا)، کتێبی پیرۆزی ئاینی زەردەشتی (ئاڤێستا)یـە، زمانی خودی پـەیامبەرەکەیە، واتـا زمـانی مـاکینی میدیاکانە، واتا ماددەکـان، کە سـەرجەم بنەمـا و بیروباوەڕ و

ڕێنماییەکانی (زەردەشت)ی لەخۆگرتووە، بە واتایەکی تر (ئاڤێستا) سەرچاوەی بیروباوەڕی ئاینەکەیە و وەک کتێبێکی پیرۆزی ئاسمانی لای پەیڕەوانی ناسرا، ئەمە و بیروباوەڕی ئەم ئاینە لەسەر دوو بنەمای بەهێز بنیاتنرا، کە یەکەمیان: (ئاهورامەزدایە) بە مانای (خودای چاکە). دووەمیان: (ئەهریمەن) بە واتای (خودای شەڕ)، ئەم ئاینە ئێستاش لە هیندستاندا پەیڕەو دەکرێت، بەتایبەت لەلای سیخەکان، زۆر لە سەرچاوەکان دەڵێن؛ سیخەکان کوردن و لە کوردستانەوە کۆچیان کرد بۆ ئەوێ، لەشکری ئیسلام ڕاویناون، بەتایبەت مۆغەکانی زەردەشت دینی زەردەشتی بە تەواوی یاساغ بوو لەلایەن ئیسلامەوە، ئاڤێستایان سووتاند و لەناویان برد، لە پێشیشدا ئەسکەندەری مەکدۆنی ئەویش بەهەمان شێوەی ئیسلام لەناوی برد و زۆریشی لێ برد بۆ یۆنان، ئەوەی بەکەڵکی ئەوان هات، دینەکە بە تەواوەتی قەدەغەکرا، بۆیە مۆغەکانی زەردەشت ناچاربوون بە شێوەی خاڵ، یان نەقشبەندی لەسەر جەستەیان بینووسنەوە تاوەکو لەبیر نەچێتەوە، لەژێر جلەکانیانەوە دەیانشاردەوە بۆئەوەی کەس نەیبینێت، هەر بۆیە ئەو گرووپە ناویان دەرکرد بە نەقشبەندی، ئەو نەقشانەش بەشە هەرە مەزنەکەی ئاڤێستا بوو، کە گاتاکانە، لە پاشانیش دینی زەردەشتی لە هیندستانەوە گەڕایەوە لە دێی سنجانەوە کە کۆچیان کرد بۆ هیندستان لەوێدا جێگایان کردنەوە و نیشتەجێ بوون، لە پاشان کوردەکان، یان زەردەشتییەکان ئەم سروودەیان داهێنا لە خۆشەویستی خەڵکی سنجان. (سنجانە و سنجانە، سنجانەکەم لۆلۆ، هەر بە منداڵی ئازیزم قەولم دا بە تۆ...) ئێستاش ماوە، گرووپی کامگارەکان نوێیان کردووەتەوە، پێموابێت ئەو دێیە و پارێزگای ڕەفسنجانی ئێستای ئێران پەیوەندییان بەیەکەوە هەبێت، بۆ نموونە کاریگەریی دینی، چەندین ناویش هەیە لە کوردا بە

ناوی سنجان، بەتایبەت ناوی ئافرەت، وەکو گوتمان لە سنجانەوە گەڕانەوە بۆ هەورامان، کە شوێنی سەرهەڵدانی دینەکەیە و لەدایکبوونی زەردەشتی مەزنە، کە خاوەنی بیروباوەڕەکەیە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ژوانی یەسنا، بەشی یەک، ل٣٧). بۆ نموونە بڕوانە کلتووری وڵاتانی هیندستان و سەیری جلوبەرگیان بکە، دابونەریتیان و ناو و زمانیشیان زۆر لە کلتووری کوردەوە نزیکە. (بۆ زانیاری بڕوانە: ئاڤێستا، ژوانی یەسنا، بەشی دوو).

من مەبەستم زیاتر میوزیک و ئاوازە، میوزیک و ئاوازیشیان لە کوردەوە نزیکە، ئەوە هیچ هیند خۆی بەشێکە لە گەلی هیندۆئەوروپی، واتا گەلی ئاری، یان ئاگرپەرست. ئێستا و پێشتریش بە کێیان دەگوت ئاگرپەرست، بە زەردەشتیان دەگوت. ئایا زەردەشتی لە هەمووی کۆنتر نییە؟ ئەوەتا مشیل مالرب دەڵێت: هۆزێک لە هۆزەکانی یەهود دیار نەماون، لە قورئانیشدا باسیان دەکات، دەڵێت خودا کردوونی بە مشک و مەیموون و بەراز، ئەو باسە ئەو دەیکات دەڵێت: قەومێک هەن نیشتەجێی سەر دەریای خەزەرن و نزیکی سنووری ناوچەکانی ئەفغانستان و پاکستانن، پێیان دەڵێن (پەشتۆنەکان، بەو پێیەی ئەو باسیان دەکات، ئەمانە کوردن، دەڵێت گەنجەکانیان کاتێک باڵغ دەبن، ئاهەنگیان بۆ دەگێڕن و پشتێنیان لە پشت دەبەستن، بێگومان پشتوێنە سێ گرێکەیە، مەبەست لە سێ وتە جوانەکەی زەردەشتە، کە دەڵێت: بیری چاک، گوفتاری چاک، کرداری چاک، ئەمە زۆر باوە لە دینی زەردەشتی و نەریتی کوردەواریدا و زۆر لە دینی ئێزدییەوە نزیکن، دەڵێت ئەو دابونەریتەی ئەو باسی دەکات، دابونەریتی کوردە و دینەکەشیان زەردەشتییە، لە تەوراتیشدا باسیان دەکات، پەشتۆنەکان نەوەی یەکێک لە کوڕەکانی یەعقوبن، کە بوونە هۆزێکی گەورە و بەبۆنەی شەڕوشۆڕەوە لە دوای ڕووخانی بەنی ئیسرائیل ئەم

هـــۆزه خۆیـــان ونکـــرد، بەڵگـــەش بۆکـــورد بـوونیـــان (ئێســـتا مامۆسـتای بەڕێـز، موهەنـدیس بازیـان مـوحەمەد زیـاتر له بیســت ســاڵه له نەرویــجه، که زاوای خــۆمه، هــاوژینی مامۆســتا تاڤگەخانی کچمه)، لەکاتێکدا بەنده باسی مێژووی کورد و گەلانم بۆ دەکرد، بەتایبەت مێژووی پەشتۆنەکان، که هەتا ئێستایش پەیڕەوی دینی زەردەشت دەکەن، گوتی: ڕاست دەکەیت مامه عومەر، کوڕێکی هـاوڕێم هەیه له پەشـتۆنەکانه و بەیەکەوه بـەکوردی قسـه دەکەیـن و کـوردییەکی جـوان و پـاک قســه دەکـات، که زۆر جـوان له یەکتـر تێدەگەین، کەچی پێی دەڵێم تۆ چ نەتەوەیەکیت؟ دەڵێت: وەڵا نـازانم، کـوردیش قســه دەکـات، بەس دەزانێـت پەشــتۆنه، ئەمه بەڵـگەیه بـۆ کوردبوونی بەنـی ئیسـرائیل و پەشتۆنەکان، هەر ئەم قەومەش بـوون چـوون یـارمەتی داود پێغەمبەریـان دا له کـاتی بنیاتنـانی ئۆرشـەلیمدا، هەر له پاداشتی ئەو یارمەتییەدا پاشا داودی پێغەمبەری یەهود کابوڵ و دەوروبەری پێبەخشــین. (بــۆ زانیــاری زیــاتر، بـڕوانه: مـرۆڤ و ئاینەکان، چۆن باسی ئەم بیروباوەڕه دەکات)، واتا زەردەشت و دینـی بەنــی ئیســرائیل له یەکەوه نـزیکن، واتــا بنەمــای هەمــوو ئاینەکــان زەردەشــته و ســەرچاوەیان هەمــان بیروبــاوەڕه، لەمەوه ســەرجەم پەیڕەوانــی ئەم بیروبـاوەڕه باوەڕیــان به هەردوو هێـزی سروشــتی (چـاکه و خـراپه) هەبـووه و هەیه، (زەردەشـت)یش لەسـەر ئەو (دوو) بنەمایه بانگەشەی بۆ بیروبـاوەڕەکەی دەکـرد، (ئاڤێسـتا)یش به مانـای (بنەمـا و بنیاتنــان) دێـت، هەروەهــا داڵـدەدان و تەنـانەت به مانــای (فێربـوونی زانین)یش هـاتووه. ئێسـتاش هەر لەسـەر ئەو دوو بنەمـایه دەڕوات، خـودا و شــەیتانه له تەورات و زەبووریشـدا نـاوی شـەیتان ناهێنێــت، زەبــوور به گــوتەی مێژوونووســان بەشــێکه له گاتاکــان. بێگومان دونیا خۆی پێکهاتووه له دوو بەش: له خێر و له شـەڕ، هەتـا کۆتایی هەر وا دەڕوات، ئێستا دینەکانی تر ڕەخنه لەوه دەگرن گوایه

زەردەشت دوو خودای پەرستووە، من پرسیارێک دەکەم، ئەی شەیتان چییە دژایەتی خودا دەکات؟ هەتا کۆتایی مرۆڤایەتی دەمێنێتەوە، ئایا ئەگەر زەردەشت پاڵەوانی شەڕی بکوشتایە، خراپەکارییەکانی دوای ئەوی بکردایەتە ملی کێ؟ باشە ئەگەر ئیسلام شەیتانی بکوشتایە، ئەم پیاوکوژیی و تاڵانکارییانەی پاش شەیتان بیکردایەتە ملی کێ؟ بێگومان هەروا دەڕوات بەڕێوە. ئاڤێستا ئەو کتێبەی لە ماوەی چل وحەوت ساڵی پەیامبەرێتی (زەردەشت)دا تەواوکرا، من نامەوێت زۆر لەسەری بڕۆم.

خوێنەری بەڕێز، لە وانەیە بڵێیت ئەم بگرە و بەردەیە چ پەیوەندییەکی بە مەقاماتەوە هەیە؟ بێگومان هەموو مەقام و سروود و موناجاتەکان لەو سەردەمەدا داهێنراون و خزمەتی دینەکە و وڵاتی پێ کراوە، لە هەمانکاتدا بۆ سەلماندنی دێرینیی گەلی کوردە، کە خاوەنی زۆر داهێنانە، میوزیک و مەقامیش لە هۆرییەکانەوە لە زەردەشتەوە هاتووە، من لە خۆڕا ناچمە سەر بابەتێک، دەبێت بەڵگەت هەبێت، ئەمانەش بەڵگەن بۆ سەلماندنیان لە سەردەمی خۆیدا، بۆیە دەبێت بەدوای سەرچاوەدا بگەڕێیت هەتا دەتوانیت: تەنها مەبەستم لە سروودەکانی گاتایە، کە سەرچاوەی مەقامە کوردییەکانە، گاتا واتا بانگەواز، یان بانگکردن بە ئاوازەوە، یان خوێندنەوە بە ئاوازەوە، ئەمە سەرچاوەی ئاواز و مەقامەکانە، ئەویش لە بەشی یەسنایە، یەسنا گەورەترین بەشیانە، لە حەفتاودوو بەند پێکهاتووە، لەم بەشەشدا گاتا، کە سروودە ئاینییەکانی لەخۆگرتووە، لە پێنج بەش پێکهاتووە؟ منیش هەر بۆ ئەمە دەگەڕێم بیسەلمێنم کە ئەم مەقام و سروودانە کورد داینـاون و موڵکی کوردن، سەدەها سەرچاوە دووپاتیان کردووەتەوە تەنانەت (پێغەمبەر داودیش)، کە پاشای نەوەی ئیسرائیل بووە، ئەویش بەهەمان شێوەی (زەردەشت) نوێژ و نزاکانی بە

سروود و میوزیکی قیسارەوە خوێندووە، لە دواتردا باسی قیسارەم کردووە.

بەو شێوەیە بۆ خودای گەورە و تاوەکو کاهینەکانی زەمانی (موسا پێغەمبەریش) بەهەمان میوزیک و سروودەوە نزا و نوێژیان کردووە، چونکە هەمان ڕێچکەی (پێغەمبەر ئیبراهیم)ە، کە خەڵکی میزۆپۆتامیایە، یان بەینی دوو ئاو، واتا دیجلە و فورات (بە مانای فرەهات) دەگەیەنێت، لەوانەیە بڵێن چۆن دەزانیت خەڵکی میزۆپۆتامیایە؟ بڕوانە تەورات، کاتێک یەعقووب ژن دەهێنێت، ئیسحاقی باوکی کە کوڕی دووەمی ئیبراهیمە، ئیسحاق بە یەعقوب دەڵێت: قبووڵ ناکەم ژن لەم قەومانە بهێنیت، بڕۆرەوە بۆ خاکی باووباپیران لە لای خاڵۆ و مامەکانت ژن بهێنە. لەلایەکی ترەوە یەعقوب بۆ مەسەلەی پێغەمبەرایەتییەکەش فێڵی لە عیسۆی برای کرد لەگەڵ دایکیدا تۆزێکیش لە عیسۆی براگەورەکەی ترساوە، بۆیە ڕایکرد بۆ لای مام و خاڵەکانی، ئەوەبوو خاڵۆی ویستی فێڵی لێ بکات کاتێ یەعقوب داوای هەقەکەی خۆی لێکرد، خاڵۆی ملی نەدا، گوتی: با ئەمساڵ مەڕ و بزنەکان هەرچی ڕەش و سپییان هێنا هەمووی بۆ تۆ، یەعقوبیش هەموو بەران و خرتەکانی کە باز بوون، جیای کردنەوە و کردنییە لای مەڕ و بزنەکان، ئەو ساڵە هەمووی بازیان هێنا، فێڵێکی وایشی لە عیسۆی برای کرد لەگەڵ دایکیدا، بۆ بەدەستهێنانی پێغەمبەرایەتییەکە، دونیا هەر فرتوفێڵ بووە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: تەورات). لەپاش تەواوکردنی شەرتی شوانی بۆ ماوەی چل وپێنج ساڵ مایەوە لە میزۆپۆتامیا، ئەوجا بە ماڵ و سەروەتێکی زۆرەوە گەڕایەوە و بوو بە پێغەمبەری بەنی ئیسرائیل، ئەوەبوو یەعقوب چواردە ساڵ شوانی کرد بۆ خاڵۆی، هەردوو کچەکەی خواست، هەریەکەی بە حەوت ساڵ، چونکە ئەوەڵ مامەڵە لەسەر کچە بچووکەکە بوو، ئەو کچە بچکۆلەکەی خۆش دەویست، بۆیە حەوت

ساڵی تر شوانی کرد تا کچە بچووکەکەشی بهێنێت، لەبەرئەوە خاڵۆی گوتی: لەلای ئێمە باو و نەریت نییە هەتا کچی گەورە وەستابێت، کچی بچووک نادەینە شوو، ئەو نەریتەش لە کوردا هەتا ئێستاش باوە، مەبەستم لەم بەسەرهاتانە کۆنی و داهێنانی کورد و نەتەوەی کوردە، لە دواتردا بەڕوونی باسم کردووە.

بنەچەی ئیبراهیم پێغەمبەر لە ڕووهاوە هاتووە، بەڵام خۆ ئێستا بڵێ بەنی ئیسرائیل کوردە، لە وانەیە بتکوژن، ئەگەر قسەی خودا بێت، ئەوا گومانی تیا نییە، ئەگەر خۆیان نووسیبێتیان، ئەوە خۆیان نووسیویانە لە قورئان و تەورات و زەبوریشدا هاتووە، گوناهی کەسی تیا نییە، ئەگەر خوێنەر بەجوانی هەڵیسەنگێنێت، هەموو کتێبە ئاینییەکانی ئەو سەردەمە هەمان پەیڕەو و پرۆگرامی بەڕێوەبردنی ئەو سەردەمە و ئەو وڵاتانە بوون. بڕوانە ئەوەی باوەڕی پێ بووە لەگەڵیدا بووە، ئەوەشی باوەڕی پێ نەبووە بە زەبری کوتەک ملکەچ کراوە، وەکو ئەمڕۆ، ئەوەتا مارک دی میرۆپ لە کتێبی مێژووی خۆرهەڵاتی نزیکی کۆندا لە دەوروبەری (٣٠٠٠-٣٢٣) پ.ز ئەو ڕاستییەی سەلماندووە، کە دەڵێت سۆمەرییەکان و هۆرییەکان و گۆتییەکان لە هەموو ڕوویەکەوە ئەوان خاوەنی دەسەڵات و دەستوور و داهێنان بوون و دەسەڵاتیان بەسەر جوگرافیایەکی فراواندا هەبووە، ئەوان خاوەنی نووسین و سەرژمێریی و باج و دەرامەتێکی زۆر بوون، ئەو تاتە قوڕینانە کە دۆزراونەتەوە، هەمووی بە زمانی سۆمەری و هۆرییەوەیە، ئەوانە هەمووی بەڵگەن لەسەر دێرینیی قەومی کورد، من نامەوێت زۆر قسەی لەسەر بکەم، خوێنەری بەڕێز تۆ خۆت بڕوانە کتێبی ناوبراو (ل١٠٤، ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧)، باسی شکستەکانی پاشاکانی ئەکەد و بابلییەکان و ئاشوورییەکانیش دەکات بە بەڵگەوە، کە چۆن شکاون و ناچاربوون ڕێکەوتن بکەن و ژنیان بدەنێ، مەبەستم لە هۆرییەکان،

سۆمەرییەکان و لە گۆتییەکانیشە، هەروەها باسی ئەو سروودانەش دەکات لەو سەردەمەدا کە بە پاشاکان، بە خواوەندەکاندا گوتراون، ئەوەش دەڵێت کە لە هەموو گەلانی تر ئاشتیخوازتر بوون، چونکە خاوەنی دەوڵەت و یاسا و هێز و توانا بوون، ئەوەش لە توانا و بەهێزیدا بووە، ئایا گەلێک ئەوەندە دێریین بێت، هەروەها خاوەنی ئەم هەموو شوێنەوار و کلتوورە گەورەیە بێت، بۆ دەبێت کولتوورەکەی هی نەوەکەی نەبێت، بۆ بە تۆ ڕەوا بێت و بۆ من حەرام بێت؟ ئەی برای ڕۆشنبیری هونەرمەندی کورد، ساغی ناکەیتەوە بۆ دەیکەیتە موڵکی بێگانە؟ بڕوانە زەبوور و تەورات چۆن ئەو ڕاستییانە دەسەلمێنن کە ئێمە خاوەنی بناغەی داهێنان و کلتوورەکانین لەم وەڵاتەدا، بەڵام زوڵم و زۆری ئاشوور و ئەسکەندەری مەکدۆنی و جەنگیزخان و نەوەکانی وەکو هۆلاکۆ و تەیموری لەنگ و (لەنگ واتا شەل. نووسەر). بەدەستی کورد شەل کراوە، ئەگینا خۆ ئەو مەغۆلە و هەروەها تورکی خۆپەرست و هێرشی ئیسلام و تەنانەت خاچپەرستەکانیش چەندەها ساڵە ئێمە دەچەوسێننەوە، هەر باشە ئەمەشمان ماوە! پرسیارێک لێرەدا سەرهەڵدەدات: باشە ئەمانە، واتا ئەم گەلانە هەر هەموویان هێرشیان کردووە، ئەی ئەگەر بۆ وڵاتی کورد نەبێت، هێرشیان بۆ سەر کێ کردووە؟ دەتوانم ئەم پارچە شیعرە وەکو بەڵگەیەک پیشانی تۆی ئازیز بدەم، کە چۆن کوردیان چەوساندووەتەوە  بە بێ بەزەییانەوە و چ دڵڕەق و چ جەللادێک بوون، کەچی جاشە کوردەکان پاساویان بۆ دێننەوە زۆر بێوەی بوون، ئەمەش ئەو شیعرەیە وەکو شایەتحاڵ لەسەر ئەو ڕۆژگارە خوێناوییە، بڕوانە شیعرەکە چی دەڵێت :-

**هۆر مزگان ڕمان ئاتران کوژان**

**وێشان شاردەوە گەورە گاوران**

**زۆر کار ئارەب کردنا خاپور**

**کـنا ئـیپاڵـە هـــەتا شـارەزور**

**شــەن و کەنیکا وەدیـل بـشـینا**

**مـــەرد ئـانـیاوە وەڕوی هــوینا**

**ڕەوشت زەردەشت مانۆ وە بێکەس**

**پزیکا نیکا هۆرمز وە هـیچ کەس**

ئەم هـۆنراوەیە هـی سـەردەمی هێرشـی ئیسـلامە، بـۆ وڵاتـی ساسانیەکان واتا بەر لە (١٤٠٠) ساڵە.

**سروودەکانی زەردەشت لە خوارەوە**

بەداخەوە ئێسـتا کـورد خـۆی خەریکی لـەناوبردنی خـۆیەتی. لە دوژمـــنەکەی زیــاتر هەوڵـــی لەنـــاوبردنی شـــوێنەوار و کولتـــووری خۆیەتی، بەڵام خەیاڵیان خاوە کورد و خـاک و ئاو و کـەلتوورەکەی زۆر لەوە گەورەترن و بە هیچ دووژمنێک لەناو بچێت، هەر دەمێنن و بــەرەو پــێش دەچــن ، بێگومــان دیــن و ســروود و پێویســتییەکانی ڕۆژانەی مــرۆڤ هەمیشــە لەســـەر زمــانن و لەبیــر نــاچن، ئەمەش سـروودەکانی زەردەشـتە، کە لەپێش سـەدەکانی پێش پێنجـەمی پێش زایـین دایـناون و هەتـا ئەمڕۆش هەر مـاون، ئەویش: مەقامی گاتـایە، واتا گاز، یان بانگەواز، بۆ خـودای یەکتاپەرسـتی، کە بە هەولێری پێی دەڵـێن: گـازی کە، ئەوەتـا لە مزگەوتەکانـدا تـا ئەمڕۆش دەڵێت بانـگ دەدات، یان بانگ دەکات بۆ چاکەکردن، یان بۆ خوداپەرستی، بێگومان ناوی مزگەوتیش هەر پەیوەندی بە مەزداوە هەیە مەز+دا مەزدا+گاز، واتا بانگەواز بۆ ئاهورامەزدا، بۆیە بووەتە مزگەوت، کورتکراوەتەوە و عەرەب کردوویەتـی بە مـــسجد، بـڕوانە جیاوازییەکەیـان چەنـدە مزگەوت، عەرەب پیتی (گ) گۆ ناکـات، هەتـا ئەمڕۆش بەو نـاوەوەیە، نزاکـردن سـروودەکانی ئاڤێسـتاش ناویـان بـانگەوازە، ئەمـانەش ئەو سـروودانەن کە لەو سـەردەمەدا خوێنـدراون بە وێـنەی خوێنـدنەوەی

قورئـانی پیـرۆزی ئەمـڕۆ، نامەوێـت درێـژەی پـێ بـدەم، چـونکە لە خوارەوە باسم کردووە:

١- ئاهوند: لە حەوت بەند پێکهاتووە.
٢- ئاشتود: لە چوار بەند پێکهاووە.
٣- سپنتامینن: لە چوار بەند پێکهاتووە.
٤- وەهوخشتەر: لە یەک بەند پێکهاتووە.

وەهوخشــتەر پیـاوێکی هەتـا بڵێیـت ڕەوشــت بەرز و زانــا و خێرۆمەند بووە، لە مێژووەکاندا بەرچاوم کەوتە، بەتایبەت لە مێژووی دەوڵەتـی مـاد دا، پـێش دروسـتبوونی دەوڵەتـی مـاد دەسـتێکی بـاڵای هەبــووە لە شارســـتانییەت و یەکخســـتنی هێــز و وڵات و دیــن و دەستوور، تەنانەت لە ئابووری ئەو سەردەمەدا، بۆیە ئەو سروودەیان پێدا گوتووە، یان لەوانەیە هەر خۆی دایناببێت، بۆیە بە نـاوی ئەوەوە ناوزەنـد کـراوە، لەو ســەردەمەدا بە مەقامەکانیـان گوتـووە سـروود، چونکە مەقام لە مۆگاکانەوە هاتووە، بڕوانە مۆگام، ئەمەیان کوردییە، موقـام ئەمەیـان عەرەبیـیە، موغـام ئەمەیـان زمانەکـانی تـرە، واتــا هینـدۆئەورووپییە، تـۆ بـڕوانە پیتـی (غ) زۆر بەکـاردێنن، مۆغەکـان لە هیندۆئەورووپیــدا بـــووەتە موغـــام، لە عەرەبیـــدا بـــووەتە موقـــام، سەرچاوەکەشـــی مۆگاکـــانە، واتـــا ئایەتەکـــانی ئاڤێســـتا، ئەوانەش کە خوێندوویانە بانگخوازەکان بوون پێیان گوتوون مۆگاکان، لەپێش ئەم مێـژووەدا ئەم گەلانە خـاوەنی هــیچ دەســتوور و یاســا و ڕێســا و پرنسیپـێک نەبـوون، مێژوو لە هەمـوو ڕوویەکەوە شـایەتە کە کـورد خاوەنی شارستانییەت ، داهێنـان ، نووسـین ، کـورە ، کارگە ، سـوپا ، سکە، قەڵا و منارەی زەبەلاح بوون، هەمـوو کاتێک پێشکـەوتووخواز بوون، ئەوەشمان لەبیر نەچێت بۆ یەکەمجـار ئـاگر لەم وڵاتەی ئێمەوە دۆزرایەوە و بـووە هـۆی پێشـکەوتنی وڵاتـی ئارییەکـان، یـان وڵاتـی

ئێران لەپاشان بونە خۆرپەرس و بە ئۆرک، ناسران لەپێشدا بە میتراییەکان، میتر، یان ئاتەر، یان ئاتەش، ئایر، ئار، ئاگر ناوبانگی دەرکرد بە وڵاتی ئاگرییەکان، یان ئارییەکان لەڕاستیدا ئاگر بووە هۆی پێشکەوتنی وڵات بە وێنەی ئەلیکتریکی ئەمڕۆ، لە خواریشەوە ئاماژەم پێکردووە و هەتا دوایی...

٥- وەهیشتواشتی: لە یەک بەند پێکهاتووە.

وەهوخشتەر کێیە؟ بنیاتنەری شارستانی گەلی کورد بووە، لە زۆر سەرچاوەدا بەرچاوم کەوتووە، بەتایبەت لە مێژووی ماد دا، کە ئەو لە بنەڕەتدا گەلی کوردی لە ڕەوەند و کۆچڕەوییدا بۆ نشتەجێبوون هانداوە وەهوخشتەر پیاوێکی ئاینی خۆشەویستی ئەو سەردەمە بووە، بەڵێ هەر ئەم پیاوە بە جوامێریی و سەلاریی و ڕەوشت جوانی گەلی کوردی یەکخست و دایمەزراندن، سوپای لێ دروستکردن و ڕێکیخستنەوە و شارستانییەتێکی تۆکمەی لێ پێکهێنان لە پاش چەندەها ساڵ و دەست بەدەستکردن و گۆڕانکاریی لە ناوچەکەدا، ئینجا دیاکۆی مەزن پەیدابووە و دەوڵەتی مادی دامەزراندووە و سوپا و هێزی لێ دروستکردوون، لەپاش دیاکۆی مەزن، فرەوەرتیشی کوڕی لەدایک بووە، کە گەورە بووە و لەپاش مردنی باوکی، هێرشی کردووەتە سەر ئاشوورییەکان و بەداخەوە شکستی خواردووە و لەو شەڕەدا کوژراوە و تەرمەکەیان لە چەمی ڕەزان ناشتووە، کە بە مەردایەتی سەری ناوەتەوە، ئاشور پانیباڵ پایەختەکەی لەنێو ئاوان بووە، واتا لە نەینەوا و موسڵی ئێستا، وەنەبێت موسڵ خاکی ئاشوور بوو بێت، هەر خاکی کورد بووە و ئاشوورییەکان داگیریان کردووە، لە پاش خۆی، کەیخەسرەوی کوڕی فرەوەرتیش کوڕەزای دیاکۆی مەزن، کە لە ساڵی (٦٧٥)ی پ.ز لە ئەکباتانا، واتا هەمەزان، یان هەمەدانی ئێستا لەدایک بووە، کەیخەسرەو لە هۆزی کەڵوڕ بووە، ئەم پاشا مەزنە (١٨) ساڵ

هەوڵیداوە بۆ دروسکردنی دەوڵەتی ماد تا ئامادەی کردووە بە تەواوەتی بۆ ڕووخاندنی ئاشوورییەکان، یەکێک لەو هەوڵانەی ژن و ژنخوازییە لەگەڵ بابلییەکاندا، هەروەها لەگەڵ قیبتییەکاندا، واتا فیرعەونەکان، هەروەها لەگەڵ فارسەکاندا و یەکخستنی ناوخۆ و دەرەوە و نەهێشتنی هیچ ناکۆکییەک، ئەوەمان لەبیر نەچێت ئیلامییەکانیش هاوکاریێکی باش بوون لەوکاتەدا، ئەوانیش دەوڵەتێکی سەربەخۆبوون، چونکە یەک نەتەوە بوون لەگەڵ مادەکاندا و چەوساوەی ژێردەستی ئاشوورییەکان بوون، ئەم دەوڵەتانە هەموو باجیان داوەتە ئاشوورییەکان. ئەوە بوو لە کۆتاییدا ئاشوورییەکانی شکاند و تەفروتوونای کردن و دەوڵەتی مادی دامەزراند، بۆ ماوەی نزیکەی (٢٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی بەشی زۆری ئاسیای ناوەڕاستی کردووە، لەو سەردەمەدا کەیخەسرەو تەمەنی (٤٢) ساڵ بووە، واتا ساڵی (٦٣٣)ی پ.ز. هێرۆدۆت (٢٥٠٠) ساڵ پێش ئێستا باسی ئازایەتی و دامەزراوەی دەوڵەتی مادی کردووە، هەروەها لەبارەی چەک و پێداویستی سەربازی و یاسا و هەڵسوکەوتی شارستانییەتیان باس دەکات، کە لە ئاستێکی زۆر بەرزدا بووە، لە هەموو بوارێکدا ئەم گەلانەی کە ئێستا خاوەنی کەلتوور و دابونەریتی بەناو خۆیانن، بەڕاستی هەمووی موڵکی کوردن و ناوەکان، شوێنەوارەکان، مێژووی ئاینی، هەتا زانست و مێژووی جیۆلۆجیش ئەو گەواهییە دەدەن، ئەوەتا مێژوو دەڵێت: لە دامەزراندنی ئەم دەوڵەتەدا، بەپێی گوتەی مێژوونووسان بێت (پێغەمبەر زەردەشت) و دینەکەی ڕۆڵێکی باشیان هەبووە لە پتەوکردنی ئیمپراتۆرییەتی ماددا، بۆیە سەرکەوتنی بەدەسهێناوە.

بە کورتی زەردەشت قۆناغێکی تازەی هێناوەتە ئاراوە لە ناوچەکەدا، کە لەپاش هۆرییەکان پەیدا بووە و هاتووەتە دونیاوە و ڕێبازی زەردەشتی بڵاو کردووەتەوە، دینی ئێزدیش هەر پەرەپێدەری

هۆرییەکان بووە هەتا لە سەردەمی نەمروود پاشادا پەیڕەو کراوە و ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خوای لە سەربێت پەرەی بە دینەکە داوە ئەوکاتە گەل خۆریان پەرستووە نەمرود بتی داهێناوە بەدەستی باوکی پێغەمبەر ئیبراهیم درودی خوای لە سەربێت بتەکانی شکاندوە وهانی خەڵکەکەی داوە و خەڵکی لێی هەڵگەڕانەوە و لەگەڵ نەمروود پاشا بەشەڕ هاتن و شکستی خواردوو ، بۆیە بەرەوخوار بووەتەوە، ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خوای لە سەربێت کۆشکێکی بنیاتناوە بە ناوی جێ گەورە، عەرەب پێی دەڵێن زەقورە، واتا جێگای خودای گەورە، یان ماڵی خودا، کە ئێستاش هەر ماوە، یەکەم نوێژی جەماعەتی لەوێ کردووە، لە ئێستادا برا شیعەکان لە ڕقی سوننە پێ لەو ڕاستییە دەنێن، کەچی کورد بە درۆیان دەخەنەوە و پشتی عەرەبی سوننە دەگرن و شوێنەوارەکەی هەر ماوە، هەتا ئەوکاتەش خۆریان پەرستووە، لە قورئاندا ئاماژە بە هۆرییەکان کراوە، دەڵێت: پێغەمبەر ئیبراهیم درودی خوای لە سەربێت کە مانگ و ئەستێرەکان و خۆر دەبینێت، بیردەکاتەوە، بێگومان بۆی دەرکەوتووە ئەمانەش پەروەرێن نییە، دەڵێت: ئەمانەش خودا نین، خودایەکی تر هەیە ئەمانەی دروستکردبێت، بۆیە وەکو سیاسییەک و پیاوێکی هۆشیار و داهێنەر ویستوویەتی گۆڕانکاریی بەسەر دینەکەدا بهێنێت و گۆڕانکاریی لە دەستوور و یاسای دەوڵەتدا بکات، بەڵام بۆی نەچووەتە سەر و تووشی شەڕ هاتوون لەگەڵ نەمرودا، کە نەمروود پاشا بووە، لەو کاتەدا نەمروود حوکمی هەموو جیهانی کردووە، هەموو جیهان لەو سەردەمەدا حەوت شاری گەورە بووە، هەر حەوتیشی لە ئاسیادا بووە، (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاڤێستای زەردەشت).

ئێستاش لەم سەردەمەدا لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا باسی بەهێزیی و دەسەڵاتی نەمروود دەکەن، بەڵام ناڵێن لە چ نەتەوەیەک

بووە، نەمرووود ناوێکی کوردییە، واتا نەمر، خۆیشی گوتویەتی من نەمرم، من خودام، نەمرووود پایتەختەکەی لە شاری ڕوها بووە، لە زۆر سەرچاوەدا وا هاتووە ئیبراهیم کوڕی پەیکەرتاشەکەی نەمرووود بووە، واتا بت تاشەکەی نەمرووود بووە، لە سەرەوەش ئاماژەم پێکردووە، گوتووشیانە ئیبراهیم زەڕدەشتە بەڵام وانیە دینی ئیبراهیم خۆریانپەرستووە لەپێش نەمرودیش خۆرپەرسبون نەمرود وستویەتی بیانکاتە بتپەرس بەڵام زەڕدەشت یەکتاپەرست بووە و پەیوەندی لەگەڵ پێغەمبەر ئیبراهیم نەبوە درودی خوای لە سەربێت بەینیانیش زۆر دوربووە ، ئەوەش بەڵگەیە دینی بەنی ئیسرائیل هەمان دینی هۆریەکان بووە، چونکە ئۆرشەلیم بەواتای هۆر یان خۆر بۆیە ناویان ناوە ئۆرشەلیم واتا دینی برایەتی و سەلامەتی شەلیم واتا سەلیم یان سەلامەتی هەمان دینی هۆرییەکانە، تەنها ئاڵاکەیان گۆڕیوە، پێش ئەوەی لە نەمرووود جیابێتەوە، ئاڵاکەشیان خۆر بووە و بیستویەک پەڕەی ئاڵاکە گوزارشت لە بیستویەک ئیمبراتۆری حوکمڕان دەکات لە قەڵای کەرکوکدا، ئەم گەلە لە میتراییەکانەوە و لە هۆرییەکانەوە لە پاش ئەمان ئێزدییەکان، واتا یەزدان پەرست، پاشان زەردەشتییەکان، بەڵام زەردەشتییەکان بەسەر زاگرۆس و دەریای خەزەردا شۆڕبوونەتەوە و ئێزدییەکانیش بەسەر ناوچەی دوو ئاودا شۆڕبوونەتەوە، ئەمانیش واتا زەردەشتییەکان؛ بە تەواوەتی خودای یەکتایان ئاشکرا کردووە بۆ خەڵکی، بە یارمەتی پاشا گۆشتاسپ هاتوون پلە بەپلە دیانەت گۆڕاوە، باپیرە گەورەیان نوحە، لەم کتێبەدا لە خوارەوە ڕوونتر باسم کردووە، بۆیە گوتوویانە ئۆرک، یان ئۆرییەکان، یان ئۆر خودا، لە پاشان بووەتە ئاریخا، یان ئارەبخا، ئەوە لە زۆر سەرچاوەدا باسی هاتووە، تەنانەت لە قورئانیشدا هاتووە و لە گێڕانەوە کۆنەکانیشدا هەر گوێم لێبووە، بۆیە بە کەرکوکیان گوتووە ئەرەبخا، دەشێت لە

زمانەکانی تردا گۆڕابێت، بۆ نموونە لە زمانی ئاشووریدا، یان ئەکەدی و لە عەرەبی و زۆر زمانی تردا هەمان خودای خۆرەکەیە، جا ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خوای لە سەربێت ئەگەر بە شەڕ بێت، یان بە سیاسەت بووبێت، شکستی خواردووە و هەڵاتووە بۆ لای میسرییەکان، یان فیرعەونەکان، دەبێت لەو کاتەدا بەسەر زاگرۆسدا هاتبێت بەرەو خوار، بەڵام لەگەڵ ئێزدییەکاندا یەک نەتەوەن، ئێزدییەکان کۆمەڵەکەی دایە ئانانا بوون لە شەنگال و ئەو دەوروبەرە مانەوە، نەمروود لە ڕوهادا بووە، دەکرێت نەوە لەدوای نەوە شۆڕ بووبێتنەوە بۆ دەوروبەری کەرکوک و قەڵای کەرکوکیان دامەزراندبێت، ئیتر لێرەوە پەرەیان سەندووە و بەتەواوی گەشەیان کردووە، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: بنەچەی کورد، د. عەبدوڵڵا دارتاش)،

ئەوکاتە ئیمبراتۆرییەتەکەی لە قەڵای ڕووهادا بووە، زاڵمی و زۆرداریی نەمروود تێکەڵی کەلتووری کوردەواریی و کەلتووری گەلانی تریش بووە، جاران و ئێستاش هەرکەس زاڵم و زۆردار بووایە دەیانگوت نەمروودە، نەمروود گوتوویەتی من خودام نامرم، بۆیە ناوی بە نەمروود دەرکردووە، دیارە هەر ئەم نەریتەیە بووەتە کەلتوور بۆ پاشاکانی ئەو سەردەمە، زۆریان گوتوویانە ئێمە خوداین، ئەگەر بڕوانیتە مێژووی قبتییەکان، کاهنەکان خوداکەیان پەیکەری پاشاکانی پێشوویانە، کە بە گەلەکەیان ووتووە ئێمە خودای ئێوەین، هەتا لەم سەردەمەشدا لە دراما بەدەوییەکاندا ئەگەر ناوی زاڵمێک بێنن، دەڵێن چ نەمروودێکە، بێ ئەوەی بزانن نەمروود کێیە و چی بووە، دیارە نەمروود دەسەڵاتداری ناوچەیەکی فراوان بووە، سەلمێنراوە لە مێژوودا ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خوای لە سەربێت خۆی و لایەنگرەکانی جیادەبێتەوە و دینەکەی خۆی دەگەیەنێتە میسر و فەلەستین و دەوروبەری، لەپاشان دەبنە بەنی ئیسرائیل ئەو

هەموو هۆزەیان لێ پەیدا دەبێت. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: مێژووی ئاینەکان، میشیل مالرب).

مێژووی خوداپەرستیش لێرەوە دەستی پێکردووە، بەتایبەت لە باشووری ئاسیادا، بۆیە دەتوانم بڵێم خوداپەرستی و داهێنان و پێشکەوتن لە هۆرییەکان و ئێزدییەکان و زەردەشتەوە گەیشتە تەواوی ئاسیا و ئەفەریقا و بەشێک لە ڕۆژئاواش. دینی مەسیحیش پەرەپێدەری دینی زەردەشتە، ئیبراهیم پێغەمبەری کوردە، باوکی هەموو پێغەمبەرانە، لە قورئانیشدا وا دەڵێت، ئیبراهیمیش هەمان دینی ئێزدییە، کە پێموابێت تەواوکەری میتراییەکانە، میتراییەکان ئاگریان پەرستووە، با ئەوەش بزانین ئاگر بنەمای نورپەرستییە، واتا ئاگر هۆکاری دۆزینەوەی یەکتاپەرستییە، ئێستاش دەڵێن خودا نورە، لەپاشان هۆرییەکان هاتوون خۆریان پەرستووە، لەپاش هۆرییەکانیش زەردەشتییەکان هاتوون و گوتوویانە ئەمانەش خودا نین، بەڵکو ئاهورامەزدا خودای هەموویانە، ئەم هۆرە، یان ئەو خۆرە، نوری ئاهورامەزدایە، واتا خودای مەزن، واتا گەورە، ناوی خوداکان لەپێشدا لە چییەوە هاتووە، یەکەم نورپەرستی لە میتراییەکانەوە هاتووە، میتەر، یان ئاتەر، یان ئاتەش، ئەمانە هەر هەمووی ئاگرن، یان ئایەر، ئێستاش لە هەوراماندا دەڵێن ئایەر، ئێستاش لە باشووری کوردستاندا لەناو جافدا دەڵێن ئاهر، یان ئار، زۆر گەل و وڵات بە ناوی ئارییەوە ناویان دەرکردووە، بۆ نموونە ئارمینیا و ئازەربایجان، واتا ئاترۆپاتیان، ئاریڤان، یان یەریڤان، بە کرمانجی سەروو دەبێتە ئاریوان، پێموابێت ناوی ئەڵمانیا هەر لەم ناوەوە هاتووە، خۆی جەرمانیایە، واتا ئارماینیا، خۆ ئەوە ئینکار ناکرێت گەلێکی ئارین، هەموویان خواکەیان ئاگر بووە، لە پاشان لە وڵاتەکەیان بە شەوان هەموولایەکی وڵات ئاگر کراوەتەوە، لە وڵاتانی چواردەورەوە ئاگرەکان دیار بوون. بۆیە گوتوویانە وڵاتی ئاگرەکان، بە وڵاتی ئاری

و گەلی ئاری ناویان دەرکردووە، لە دواتردا باسم کردووە. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ئاڤێستای زەردەشت و تەوراتی یەهودییەکان).

بڕوانە یەهودییەکان، بە خودا دەڵێن یەهو برا، یارسانەکان دەڵێن یاهوو، عەرەب دەڵێن ئەڵڵا ئەلاهو، زەردەشتییەکان دەڵێن ئاهورا، ئێزدییەکانیش دەڵێن هێزدان، یان یەزدان، واتا بەهێز، بۆیە بە یەزیدییەکانیان ووتووە ئێزدی، واتا یەزدان پەرست ناویان بە ئێزیدیان دەرکرد، عەرەب کردنی بە شەیتان پەرست، لەبەرئەوەی ناشرینیان بکات، بۆیە هەتا ئێستا هەشتاوچوار جار ئەنفالی کردوون، ئێزدییەکان واتا، خوای بەهێز و بە توانایان پەرستووە، ئاهورامەزدا، واتا مەزن، بەهێز، گەورە. ئێزدییەکانیش پەیڕەوکەری بەشێک لە دینی زەردەشتییەکانن، ئیبراهیم پێغەمبەر لە ئێزدییەکانەوە جیابووەتەوە، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی تەورات و مادەکان، هەروەها زەبور و مرۆڤ و ئاینەکانی میشیل مالرب و کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکان).

تۆ بڕوانە هەموو پێغەمبەران لە ئاسیادا بوون، زۆر ئاین و پێغەمبەر لەم وڵاتەوە پەیدابوون و گۆڕانکارییی بەسەردا هاتووە، بەپێی چەرخ و ڕۆژگار دینەکان و بیروبۆچوونەکان لێراوە پەرەیان سەندووە و گەشەیان کردووە، هەروەها گەیشتووەتە وڵاتانی سەر گۆی زەوی، بۆ نموونە تۆ ئەمڕۆ لە ماڵی خۆتەوە دەتوانیت هەموو جیهان ببینیت، بڕوانە لە هەموو نەتەوەکانی سەر زەویدا وشەی کوردی و جلوبەرگەکەی و پەندەکانی ڕەنگیانداوەتەوە تیایدا، بەتایبەت هیند، ئەفغانستان، پاکستان، عەرەب، تورک، بگرە ئەڵمان و میسری ئەمڕۆ و قیبتییەکانی زوویش، ڕوسیش خۆ ئەوە ئەرمەن و ئازەر هەر خۆیان کوردن، گەرچی ئەمڕۆ خۆیان بە کورد ناژمێرن،

تەنانەت ناوی ئەرمەن لە ئارییەوە هاتووە، ئاگر هەر هەمان مانای ئازەر، بە ئاشکرا کەلتووری کوردیان تیادا دیارە.

ئەم وتانەی من نەبێتە خۆپەرستی و ڕەگەزپەرستی، ئەمە هەر بۆئەوەی کوردە خۆت بە کەم نەزانیت، خۆ تازە هیچ کوێ نابێتە مالّی من، هیچ نەبێت با ئەمەشمان ماوە لە دەستی نەدەین، بەهۆی خۆ بەکەمزانین و دلّساردیی، یان ئێمە لەبەر خاتری چەند خۆفرۆش و نەفامێکەوە مالّەکەمان نەڕووخێنین بەسەر خۆماندا، بۆ ڕاست و دروستیی ئەم گوتانەم، بڕوانە نەریت و ڕەنگدانەوەی دینی زەردەشتی و زمان و کەلتووری کوردی چۆن لەنێو گەلاندا ڕەنگیداوەتەوە، بەر لە هەزار سالّ پێش زایین ئەمە پەیڕەو و بەرنامەی زانایەکی کورد بووە، کە ئەویش پێشەوا زەردەشت بووە، ئاینەکەی کە زەردەشتییەتە، ئەم ئایینە لەسەر ئەم سێ شتە دامەزراوە، بڕوانە چی فەرمووە، ئایە ئەمە بیروباوەڕی چوار هەزار سالّ پێش ئێستا بێت، ئیتر بۆ کورد شانازی بە کەلتووری بێگانەوە بکات، ئیتر کاتی نەهاتووە بە زانا و فەیلەسوف و هەموو ئایینەکانەوە بێینەوە سەر خەت، بەسی نییە هیچ نەبێت با ساتێکیش خۆمان بنرخێنین، ئەوەتا زەردەشتی مەزن دەلّێت:

١- ئەندێشەی چاک.

٢- گوفتاری چاک.

٣- کرداری چاک.

٤- چوار شتی تریش زۆر پیرۆز بووە بەلای زەردەشتەوە، کە سەرچاوەی سەرەکی ژیانی مرۆڤن، ئەوانەش:

١- ئاو.

٢- خاک.

٣- ئاگر.

٤- بایە.

بۆیە بە ئاگرپەرستی توومەتباریان کردوون، ئەوەتا ئەمڕۆ ڕێزی هیچ سەرچاوەیەکی ژیان ناگیرێت، بڕوانە ژینگە حاڵی لە چ ئاستێکدایە، خوێنەری بەڕێز، بۆ زانیاری زیاتر دەتوانیت بڕوانیتە: (مێژووی ئایینەکان، نووسینی د.کەیوان ئازاد ئەنوەر، بەشی یەک، ساڵی ٢٠٠٩ی زایینی).

من تەنها مەبەستم بەڵگەی ڕاستییە، ئەوەش بەڵگە ئەی برای کورد، دەتوانم بڵێم هەموو شتێکی ئەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە کوردەوە داهاتووە، ئەی ئیتر بۆچی خۆم بەکەم بزانم و ببمە کۆیلەی خەڵک، لەژێر هەر ناوێکدا بێت ئێمە زیاتر لە ڕێی بیرو باوەڕەوە کۆیلەیان کردووین، بڕوانە لە پێش (١٧٠٠) ساڵ پێش ئێستا ئەمڕۆ چی هەیە ئێمەش بومانە و لە هیچمان کەمنەبووە و لە ئەمڕۆش پێشکەوتوتربوین خوا پەرسیش بوین زەرەرمان بۆکەس نەبووەو ، جا ئەگەر ئێمە بەر لە (١٧٠٠) ساڵ خاوەنی ئەم بیروباوەڕە و داهێنان و خاک و ئاو و ئەم دینە بووین، ئەی بۆ ئەنفال و تالانیان کردین؟ دیارە هەموو شتێکیان ئەنفال کردین و تەعریب و تەفریس و تەتریکیان کردین، بێگومان کەلتوورەکەشمان هەروایە، ئێمەی کورد وەکو ویلاتەیەکگرتووەکان چۆن چەک دروست دەکەن و دەیدەنە نەیارەکانیان و بەرەوڕووی خۆیان دەکەنەوە، ئێمەی کوردیش وامان بەسەرهات، بڕوانن کێ بوون ئەوانەی خوای یەکتایان بە مرۆڤایەتی ناساند بەر لە (١٧٠٠) ساڵ، ئەوانەی یاسای ژیانیان دامەرزاند و بونە ڕێپیشاندەری مرۆڤایەتی لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، گاورەکان بوون، گاور بە واتای دین گەورەکان دێت، یان میللەتە گەورەکە، پاڵەوانەکان، دین پاکەکان، وشەی گاور وەک گوتمان لە پێشدا بە واتای گەورە، عەرەب کردیانە کەفرە، کافر لە گاورەوە هاتووە، عەرەب هەر بە کورد دەڵێن کافر، بە بیری عەرەبەکان واتا بێ باوەڕ، بێ دین، بێ

ویـژدان، بـێ ڕەحـم و پـیاوکوژ، باشـە ئەوە ئـێمە بـووین ئاسـیا و ئەفەریقا و بەشێک لە ئەوروپامـان کاول و وێران و تـاڵان کـرد و بە قەولی خۆیان ئەنفالکرد بە ناوی خودا پـەرستییەوە؟ خۆ ئێمە زۆر لە پـێش ئەوان خوداپەرسـت بـووین، ئەگەر وایـان نەکـردایە، نەدەبـوونە خاوەنی ئەو دین و سـەروەت وسـامان و جوگرافـیا گـەورەیە، ئەگەر نازانیت هەرچی کچی جوان و ژنـی جـوان و کـوڕی دە دوازدە سـاڵان بـوو، کردیـانە کەنیـزەک و غـولام، هەرچییەکیشـیان کوشـت، کوشـتیان و هەرچـیش مـایەوە، کردیـانە کۆیـلە لە ماڵەکانی خـۆیاندا، دەتوانم بڵێم هەرچی ژنی عەرەب هەیە، لە ئێمە و قەومەکانی تـرن، تۆ بڕوانە ژنیـان چەنـدە جـوانن، چـونکە لەکاتی ئەنفالدا کـامە ژن جـوان بـووایە بۆ خۆیـان گلیـان دەدایەوە، ناشـرینـەکانـیان دەفـرۆشت، یـان دەکـرانە کەنیـزەک، یـان کـۆیلە بە قەولـی خۆیـان، وە زێـڕ و زیـو و سەروەت و سامانی وڵاتـانیان فەرهوود کرد، بە ناوی غەنیمەوە هەتـا کولتوورەکەشمانـیان بـرد بـۆ خۆیـان، ئەم وڵاتـانە هیچیـان عەرەب نەبوون، بڕوانە چۆن عەرەب هەڵیلوشـیـون بە نـاوی ئیسـلامـەوە، بـــڕوانە مێژونـــوس ئەلـــتەبەری و د.عەبدولحســـێن زەڕینکـــوب دووسەدەبێدەنگی جا وەکو: مـیسر، سودان، سـوریا، لیـبـیا، جەزائـیر، مەغـریب، تـونس، سـۆماڵ، فەلەستـیـن، لوبنـان و عـێراقـیـشی هــاتە سەر، خـێراتی ئەم وڵاتانە لـەلایـەن خـەلیـفە کانەوە  هەمووی بەتـاڵان بران بۆ جەزیرەی عەرەبی بە ناوی فتـوحـاتـەوە، خـەڵکەکەشی کران بە کـۆیلە و کەنیـزەک و منداڵـەکانیشــیان کران بە غـولام، واتـا بــۆ نۆکـەری و هـەتیـوبازیـی، دەسەڵاتدارەکانیـان ئـەمان ئـەم هــەموو دەوڵـەتـەیــان سڕیـیـەوە و تەعریبیـان کـردن، بـڕوانە چەنـد وڵات بوون، هێشـتا کـورد ئازا بووە بەم شێـوەیە مـاوەتەوە، (بۆ زانیاری زیــاتر، بــڕوانە: کـــورتە مێژوویەکـــی نێربازیـــی لە ڕۆژ هەڵاتـــی ناوەڕاسـتدا، بەتایـبەت لەو سـەردەمەداولەم وڵاتـانەی چواردورمانـدا،

نووسنی کوردیار. بڕوانە: عەبدولڕەزاق جوبران، کتێبی چەتەکانی خودا)، کە خۆی عەرەبە و چۆن باسی زوڵم و زۆری ئەو سەردەمە دەکات کە خۆی تێیداژیاوە ، کە بە چەتەکانی خودا ناویان دەبات، نەک بە پیاوی خودا، بەداخەوە ئەمڕۆ ئێمە خۆمان لە خۆمان بە عیلمانی و بە ئاینییەوە بووینەتە چەتە.

بەداخەوە ئێستا هونەرمەندێکی خاوەن ئەزموونی وەکو مامۆستا مەزهەری خالقی دەڵێت من بڕوام بە مەقاماتی کوردی نییە، کە بەندە لە بەرواری (٢٠١٩/٦/٢٧) ڕۆژی پێنجشەممە، چوومە خزمەتی هونەرمەندی گەورەی کورد. مامۆستای دەنگخۆش و سەنگین مەزهەری خالقی، بەڕێزیان کە ئێستا بەرپرسی گشتیی ئەنیستیتیوتی کەلتوور و کەلەپووری کوردە لە سلێمانی، بەندە بەبێ کاتی دیاریکراو چوومە خزمەتی، لەبەرئەوەی زۆر سەرقاڵ بوو، نەمتوانی زۆر لە گەڵی دانیشم و گفتوگۆ بکەین، بەداخەوە، بەڵام چارەکە کاتژمێرێک لەگەڵی دانیشتم و گفتۆمان کرد، لەپاش چاکو چۆنی و باوەش بەیەکداکردن، فەرمووی مامۆستا عومەر کارتان چییە و چی دەکەیت و بە چییەوە سەرقاڵیت؟ بەندە لەبەر خۆشەویستی هونەر و خۆشەویستیم بۆ کەلتووری گەلەکەم، سەردانیم کرد، لە وەڵامی پرسیارەکەیدا گوتم: سەربەخۆ کار لەسەر کەلتوور و مەقاماتی کوردی دەکەم. مامۆستا مەزهەر گوتی: من دژایەتی جەنابتان ناکەم، بەڵام من وەکو خۆم ئیمانم بە مەقامی کوردی نییە، مەقام هی هەموو گەلانە، ئەگەر بڵێین مەقام هی کوردە، دەبێت لەپێشدا بڵێین هی فارسە، ؟باشە گەلی فارس کۆنە یان کورد سەلمێنراوە لەمێژوودا کورد کۆنترین گەلە لەمرۆڤایەتیدا فارس هەرخۆی لەکورد جیابونەتەوە جا بۆ وتەکەی مامۆستا ئەمە خۆی لەخۆیدا دانپێدانانە کە مەقام موڵکی کوردە، باشە فارس، واتا پارس بریتییە لە پەهلەوی، واتا پاڵەوانەکان کە سەلمێنراوە

کوردن، پاشماوەی پەهلەویش فەیلییە و پالانییە، کە ئێستا وەکو دوو هۆزی گەورە ماونەتەوە لە باشوور و باشووری کوردستاندا دەژین وێنەیەکیشمان گرت بۆ مێژوو لە هەمان ڕۆژدا لەناو شوێنی کارەکەی بەڕێز هونەرمەندی گەورەی کورد کاک مەزهەری خالقی خۆشەویست، دوو کتێبیشم پێشکەش کردن، کە دوو کتێبی شیعریی بەندە بوون، بە خۆشحاڵییەوە لێی وەرگرتم و سوپاسیی کردم و زۆر بەڕێزەوە بەڕێی کردم.



پاڵەوانەکان، یان پەهلەوی وەکو دوو هۆز ماونەتەوە. نموونەیەکی تری زیندوو، کە دەڵێت مەقامی دەشت مەقامێکی کوردییە، مامۆستای میوزیکژەنی کورد خاوەنی دکتۆرا لە بواری میوزیکی گشتیدا د. نەسیر شەممە، عود ژەنی بەتوانا باوکی کوردە و دایکی عەرەبێکی خەزرەجییە و خەڵکی باشووری عێراقە، کە دانشتووی میسرە، دەڵێت: مەقامی دەشت، کوردییە، مامۆستا نەسیر شەممە دەیەها کۆنسێرتی میوزیکی لە زۆربەی وڵاتانی جیهاندا سازداوە و

زۆریش سەرکەوتوو بووە و زۆریش شانازیی دەکات بە میوزیکی کوردییەوە، من لە زۆر شوێنـدا لەم کتێبەدا باسم کـردووە پێویست بە بەڵگە ناکات، هەر خۆی بە ناوەکەیدا دیارە، مامۆستا مەزهەر دەڵێت هی هەموو گەلانە منیش وەکو نووسەری ئەم کتێبە دەڵێم: بەڵێ، بێگومان وایە، بەڵام پەیژەی قورگی مرۆڤ و ئاژەڵیش (٧) پەیژەیە، هەموو گەلانی دونیا لەسەر ئەم (٧) پەیژەیە گۆرانی و مەقام دەڵێن و قسەش دەکەن، بەڵام ئایا هەموو گەلان وەکو یەک مەقام و گۆرانی دەڵێن، ئایا هەموو مەقام و ئاوازێک وەکو یەک کاریگەرن بۆ هەستی مرۆڤ؟ بێگومان نەخێر، لە وانەیە بڵێیت چۆن؟ من دەڵێم مەقامی گاز یان قەتار دەگەڕێتەوە بۆ پێش (زەردەشت) هەرچۆنێک بە ئایەتەکانی گاتا خوێندراوە، بەڵام ئاوازەکە کۆنترە، ئایا کام لەم گەلانەی چواردەورمان بەم شێوەیە گوتوویانە، منیش لاریم لەوە نییە کە میوزیک، زمانی هەموو گەلانە و زمانی ئاشتییە و یەک زمانیشە، بەڵام هەریەکەو بە ویست و شێواز و ئارەزووی خۆی دەیڵێتەوە، لێرەدا دەمەوێت ئەوە بڵێم، ئێمەی کورد کۆنترین گەلین لە ناوچەکەدا و هەموو شانازییەک بۆ ئێمە دەگەڕێتەوە، خاوەنی هەموو داهێنانێک بووین بە درێژایی مێژوو، بڕوانە تەورات چۆن ئاماژە بە دەوڵەمەندیی کورد و وڵاتەکەی دەکات، تەنانەت ناوی وڵاتی سوورەکان دەهێنێت، واتا سۆمەرییەکان، واتا سوورە مێردەکان، یان سۆمەرییەکان، کە لە پێشتردا بەڕوونی باسم لێوە کردوون. سۆمەرییەکان بەر لە (٤٠٠٠) ساڵ لە هۆرییەکان جیابوونەتەوە، ئەگەر بڕوانیتە ناوەکان و شوێن هەوارەکان، بە جوانی بۆت دەردەکەوێت شوێنی سۆمەرییەکان لە کوێوە بۆ کوێ بووە، لە چیای سورێنەوە هاتوون بەرەوخوار و بۆ سوریا، پێم وایە چیای حەمرینیش هەر بە ناوی ئەوانەوە بووە، حەمرین واتا سوور، بە هەمان ناوی سورێن دێت، یان سوورەکان لە سنووری ئەوانیشدا

بووە، بۆ نموونە کاتێک سلێمان پێغەمبەر درودی خودای لەسەربێت پاشای بەنی ئیسرائیل قودسی بنیادناوە، وەستا و کەرەستەی وەکو زێڕ و مس و برۆنز و زیو و هەموو کەرەستەیەکی خاوی تری لە وڵاتی سوورەکانەوە بردووە بۆ ئەوێ هەتا قودس دروست بکات، پێمـوایە سـووریایش هەر پەیوەنـدی بە سـۆمەرییەکانەوە هەیە ودینەکەشیان هەر هۆری بووە لە ئەفسانەی عەشتارو گلکامشدا بەجوانی ئاماژەبە هۆریەکان و وڵات و داب و نەریتیان دەدات ڕێک ئاماژە بەوڵاتی مێزوو پۆتامیاو ناوچەی ئێستای کوردەواری دەدات، جـا حەزرەتـی سـلێمان درودی خـودای لەسـەربێت کە قودسـی تەواوکرد، لە پاداشتی ئەو هەموو کەرەستەیەی بەکەشتی دەیەها تەن ئاڵتوون و برۆنز و مس و زیوی بۆ سلێمان پاشای ئیسرائیل نارد، ئەویش دەیەها دێهات و شارۆچکەی لە خاکی جەلیل بەخشییە حیرام پاشای وڵاتی سوور، ئەویش چووە بۆ سەیرکردنی ئەو خاکە کە پێی درابوو، بەدڵی نەبووە و چووە بۆ سەردانی سلێمان پاشای یەهودی. حیرام پاشای سوورەکان پێی گوت ئەوانە خاکن بەخشیوتە بە من براکەم، دیارە کەسی یەکتریش بوون، ئەو خاکە کاڤڵە، واتا بێفەڕە، ئەم وشە وشەیەکی زازۆکیە لەو ڕۆژەوە ناویان لێنا کاڤوڵ، واتا کاول، یان بێفەڕهەر ئەفغانستانی ئێستا دەکات،کاتی خۆی پێیان وتووە خاکی کاول کە وڵاتی ئێستای ئێران بووە بڕوانە جل وبەرگیان هەر هەمان جلوبەرگی کوردین، تەنانەت زمانەکەشیان، ئەفغانستان، چـۆن دەڵـێن کوردسـتان، ئەویـش لە سـتانەکانە، واتـا نـاوی نیشتمانەکەیان هاوناوی کوردستانە، بڕوانە ئەم ناوانە: هیندستان، ئەفغانسـتان، تورکمانسـتان،بێگومان تورکمانسـتان بەتـورک کـراون بەزۆر ئەرمەنستان، پاکستان هەر کوردن و لە میتراییەکانن، یان ئارییەکان، کورد حوکمی ئەم وڵاتانەی کردووە و هەموو موڵکی کورد بوون، تەنانەت لە سەردەمی شاعەباس و نادرشا و کەریم خانی زەند

و زۆر له پاشاکانی تری ئێراندا کوردن و کورد حوکمی ئەم وڵاتانەی کردووه، بڕوانه مێژووی پاشاکانی ئێران و زۆری تر له تەورات و زەبووریشدا ناوی فارس نەهاتووه، زۆر له نووسەر و ئەدیبەکانی کورد و غەیری کورد دەڵێن: بۆ ناوی کورد نەهاتووه، بەپێی زۆر له سەرچاوەکان کورد لەو سەردەمەدا به ناوی ترەوه حوکمی کردووه، بۆ نموونه: میترایيەکان، هۆرییەکان، یان ئەشکانیەکان و هەورامییەکان، مادەکان، سورەکان، سۆمەرییەکان، ساسانییەکان، ئیلامییەکان، ئارامییەکان، ئەیوبییەکان، مەروانییەکان، شەدادییەکان، گودییەکان و زۆری تر ئەی خۆ دەوڵەتی بەنی ئیسرائیل دەگەڕێنەوه سەر کورد، ئەگەر کیانمان نەبووه، چۆن تائێستا ماوین، چۆن وەکو ئەو ده پانزه دەوڵەتەی که کران به عەرەب، تیانەچووین که له سەرەوه ناویانم هێناوه. دیاره که دەسەڵاتمان هەبووه له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بۆیه هەتاوەکو ئێستا ماوینەتەوه بەم شێوەیه، بۆ نموونه له هێرشەکەی ئەسکندەری مەکدۆنیدا هیچی بۆ ئێمه نەهێشتەوه، له کەلتوور و له دەوڵەت و له دینیش هەموو نووسراوەکانی زەردەشتی سووتاند، ڕاسته لەو کاتەدا دەسەڵاتی کورد تۆزێ ساردبووه بەڵام زۆربەی هیزو گەلەکەش کوردبون داب ونەریتیش هەرکوردی بووه ، بەڵام با ئەوەش بزانین هەموو داب ونەریتێک و دەستووری ئەوکاتەی ئێران سەرپاکی هی مادەکان بوو، بەڵام که داگیرکاریی ئەسکەندەر هات، زەرەرێکی زۆری به مێژوو و کەلتووری کورد گەیاندووه له ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، کورد خاوەنی هەموو نەریت و داهێنانێک بووه، هەر زلهێزێک هاتووه با دەسەڵاتیش بەدەست کوردەوه نەبووبێت، بەڵام زیانی به مێژوو و کەلتووری کورد گەیاندووه، قەڵا و شار و شوێنەواری کوردی وێرانکردووه، بەڵگەیەکی سەلمێنراو بۆ ئەم وتەیەم لەم ڕۆژانەدا شارەوانی کەلار یان شێروانه له گەرمیان ویستیان شەقامی سەرەکی

سەنتەری شار نۆژەن بکەنەوە شوێنەوارێکیان دۆزیەوە و کارەکەیان ڕاگرتـــووە و دەســـتیان کـــرد بە پشـــکنین کە دەڵـــێن مێـــژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزاران ساڵ پێش ئێستا کە ڕۆژی (٢٤- ١٠- ٢٠٢١) ئەم شوێنەوارانە بە قوڵایی دەیەها مەتر لە ژێر زەویدان هەموی هی ڕۆژانی کاول کاری داگیرکەرانـن کە ناویانم هێنـاوە لە سـەرەوە لە پاشـــان فـــارس و نەتەوەکـــانی تـــر دەستکـــاری دیمۆگرافیـــا و جوگرافییـــان کـــردووە بـــە ئـــارەزووی خۆیـــان شـــێواندوویانە لە بەرژەونـدی خۆیـان ، بـا ئەوەش بـزانن نەوەی داهـاتوو و بۆ هەمـوو کوردێـــک لە ســـاڵی (٢٥٠) پ.ز، کە ئەمـــڕۆ (٢٠٢٠)ە، هەمـــوو ئەم گەلانەی کە ئێسـتا لێرەن بە هەر هەموویـانەوە هەتـا ئێسـتا لە کـورد دەکـوژن و لە کەلـــتوورەکەی دەســـڕنەوە و پاکـــتاوی دەکەن لەگەڵ جاش و خۆفرۆشەکان و گێل و نەفام و خۆشباوەڕەکاندا نەیانتـوانی لەنـــاوی بەرن، وەکـــو چـــۆن گیبتییەکانـــیان پاکتـــاو کـــرد، کە میسرییەکانـــن، وە دەیەهـــا نەتەوەی تـــری وەکـــو ئەوان هەر لەم کتێبەدا باسم کردوون، بۆچی نەیانتـوانی لەناوی بەرن، چونکە دار و بەردی ئەم ڕۆژهەڵاتە مۆرکی کوردی پێوەیە و ڕووچووەتە نـاخی زەوییەوە، بە هیچ زلهێزێک دەرنەهـات و دەریشنایەت، ئەسکەندەر و سەدەهای وەکو ئەسکەندەر هەوڵیان دا کورد بسڕنەوە، ئەسکـەندەر کردیشی، بەڵام خۆ نەیتوانی خاکەکەی ببات، یان بیگۆڕێـت، بۆ دیـن و کەلتوورەکەش هەر زوو لە پاش ئەسکەندەری مەکدۆنی جارێکی تر لەلای ئەم و ئەو ئاڤێستـایان کۆکردەوە و دیسانەوە لە سەردەمی ساسانییەکاندا هـەتا سەردەمی ئیسلام جارێکی تر دین و دەوڵەتـی زەردەشتـیان ئەنفـال کـردەوە، بەڕاسـتی نەریتـی کـورد هەتـا سـاڵی (١٩٧٠)ز بـەم جـۆرەی ئێســتا قـڕ نەکرابـوو، کە بەنـاوی گـاورو کوفرەوە کە هەموڕۆژێ بە فتوای  پیاوە ئاینییەکانی کورد، کـە لە لایەن تەیـــارە ئاینیـــە جیاجیاکـــانەوە هەرجـــارەو بە فتوایـــەک

شوێنەوارێک یان یەکێ لەکەلتورە دێرینەکانی نەتەوەکەمانیان حەرام دەکردوو و بەدەستی خۆمان لەناومان دەبرد بەناوی بیدعەوە بە فیتی نەیارەکانی کورد، کە ئێستا هەر لە ترسی جاشەکانی کورد ناوێرین ناویشیان بێنین، کەهەزارەها ساڵ پێشی مەسیح و ئیسلامیش بووە کەشایەت حاڵبون بۆ زەبونیماڵوحاڵی ئەمڕۆی کورد بەناوی کوفرو بیدعەوە هەمویان وێرانکردوو لەناویان برد جا نمونەیەکتان بۆ بێنمەوە لەولاتی ئەردەن ماوەیەک لەوێبوم هەزارەها شوێنەواری سەردەمی موسا و پێغەمبەرەکانی بەنی ئیسرایل ومەسیح و ڕۆمەکانی لێیەو ڕۆژانە هەزارەها دیناریان لێ دەسدەکەوێ وخەڵکی دەچنە زیارەتیان و ولاتی ئەردەن زۆر لاوازە لەڕووی ئابوورییەوە و ئەمرۆ بەو شوێنەوارانە دەژێت و کەسیش ناتوانێ بڵێ لەل بە داخەوە هەموشتێ بۆ ئێمە بیدعەو حەرامە و بۆئەوان حەلاڵە چی کەلتوور و نەریتی جوانی ئێمە بوو بە خیانەت ڕادەستی خوێنمژەکانی بیابانەکان و فارسە ڕەگەزپەرستەکان کرد و ئەوانیش بنەبڕیان کرد و نانەکەی خۆیان نایە داوێنی ئێمە، بڕوانە هەرچی نەریتی بەدووە دەوارنشینەکانی عەرەبستانی نەجد و حیجازە بۆ ئێمەیان هێناوە، ئەوە کەی نەریتی کوردە؟ کورد لە کوێ و نەجد و حیجاز لە کوێ، هاوار بە ماڵم هەتا ئەمڕۆش ڕۆنی خۆمان دەدەن لە سمێڵی خۆمان. (بڕوانە:کتێبی باوکانی سەلەفی، سەلەفییەت دەروازەیەک بۆ سەلەفیناسی، محەمەد هەریری) چۆن باسیان دەکات، چۆن ئاراستە دەکرێن بۆ سڕینەوەینەریت و کەلتوری ولاتانی تر بە ناوی بدعەو دینەوە، ئەوجا ئێمەی کورد بە فشاری پێویستییەکانی ژیانی ڕۆژانەمان و ڕەنجی هەزارەها ساڵمان بووە داهێنانمان کردووە، ولاتانیتر سودیان لێ بینیوین لە زانست و داهێنانەکانمان بۆنمونە دەوڵەتی ساسانی بەزانست و توجارەت عەرەبی کردە ئەودەوڵەتە لەنتیجەش هێرشیان کردەسەریان و

ئاوەهایان بە سەرهێنان ئێمە شەڕخواز نەبوین، ماڵی کەسمان داگیر نەکردووە، وەکو گەلانی تر لە هیچ کوێوە نەهاتووین بۆ ئێرە، ئەوە گەلی عەرەب و تورک و فارس بوون ماڵی ئێمەیان داگیرکرد و کەلتووری ئێمەیان ئەنفال کرد، بڕۆ مێژووی فارس بخوێنەوە، فارس واتا پارس، پارس واتا پەهلەوی، پەهلەوی واتا پاڵوانەکان، پاڵەوانەکان، واتا گەورەکان، گەورەکان واتا گاورەکان، واتا گاتاکان، واتا بانگەوازخوازەکان، بەڵێ فارس هەر وشەی خودی فارسیش هی ئەوان نیە لە پەهلەویەوە وەریان گرتووە جا بانگەوازخوازەکان ئەم پیتانەی لێ دەرکە، بۆ نموونە بانگەواز. گاز بە هەولێری واتا بانگی بکە، بە شێوەزاری گۆرانیش واتا بانگ دەکات، یان بانگی بکە، یان بانگت دەکات، پیتەکان بلکێنە بە یەکەوە دەکاتە بانگەواز، جیایان بکەرەوە دەبێت بە گاز، واتا ئایەتەکانی (ئاڤێستا)، واتا ئەوانەی گازی خوداپەرستییان کرد بەر لە (١٧٠٠) ساڵ پ.ز، بەداخەوە ئێستا زۆر لە ڕۆشنبیران فارس لە کورد بە کۆنتر و خاوەنی شارستانییەت دادەنێن، هەتا ئێستاش خاوەنی زمانی فەرمی خۆیان نین، ئەوە ئێمە خۆمان بووین فارسمان کردە خاوەنی شارستانییەت، ئەوان هەتا ساڵی (٢٥٠)ی پ.ز کەلوپەلیشیان لە بەردا نەبوو، مێژووی فارس لە چاو مێژووی مادوو هۆرێکان یان ئاریەکان دوێنێیە کەسانێک دەڵێن فارس خاوەنی شارستانییەتە دوو کتێبیان نەخوێدۆتەوە و خۆیان دەکەنە فەیلەسەف و بڕیاری نابەجێ دەدەن باشە بۆ لەخۆتان ناپرسن نوسەران زانایان ئەدیبان شوێن و ماوای فارس کوێیە کورد شاخەکانی زاگرۆس و ئارەراتە ئەی ئەوان لەکوێبون ئێرانیش واتا خاکی ئاریێکان باشە جێو مەکانی فارس کوێیە کاتێ باسی خۆی دەکات باسی باوباپیری من دەکات من هەقم نیە ئەمڕۆ خاوەنی دەوڵەتن من باسی مێژوو دەکەم ئەوان هەرچییان هەیە، دابونەریتی کوردە هەڵیانگرتووە، هەموی ئارپاک

ڕادەستیکردن لەچاو مێژوودا دوێنێ بوو بڕوانە مێژوو، مەڕوانە ئێستا کە خاوەنی دەوڵەتن، دەوڵەتەکەشیان هی کورد بوو، ئایە ڕۆشنبیران پێ لە حەق و ڕاستی نانێن، یان دەترسن لەوەی ئێران لێپرسینەوەیان لەگەڵ بکات، بەرژەوەندییان هەیە لە ڕاستی نەگوتن، ئەگەر ڕاستیت دەوێت بنەچەی کورد گاورە، واتا پەهلەوی، یان پاڵەوانەکان، ئەگەر بپرسیت لە فارسەکانیش خۆیان دەبەنەوە سەر پەهلەوییەکان، بۆیە بێگومان دەتوانم بڵێم؛ عەرەب ئەو وشەیەیە تەنها بە کورد دەڵێت کافر، لە وشەی گاورەوە هێناوییەتی، ئەگینا خۆیان لە هەموو دونیا کافرترن، چونکە عەرەب پیتی (گ)ی نییە وردە وردە کردیانە کافر، بڕوانە گاور، کافر خەڵکی حاڵی نەبوون لەوشەی گاور لە گاتاکانەوە هاتووە گاتا واتا گازاکان ئەوانەبون بانگەوازیان دەکرد بۆ خواپەرستی لە سەردەمێکدا عەرەب دەیانگوت کورد دێوە، بەتایبەت ڕۆشنبیرەکانیان ماشەڵڵا لە ڕۆشنبیرەکانیان! عەرەب هەرچی ناشیرینی بوو دایانە پاڵ ئێمە، هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، بەڵام بەداخەوە ئێمە هەموو ڕۆژێک خەڵکانێک هەن لەکوردستاندا مێشکیان شۆراوەتەوە بەخەیاڵ پلاوی وبەمێشکێکی دزراو و ئەنفالکراوەوە یان بۆ دوو فلس دوژمنەکانی کوردیان کردۆتە فریشتەو هەتابێت قوڕەکە بۆ کورد خەست تر دەکەنەوە و باو و باپیرانمان بە کافر دەکەن و کافریش مانای ناشەرعیە و ئاسەواریشی کوفرە بۆیە هەرچیمان هەبوو خۆمان وبەدەستی خۆمان و هانی بەکرێ گیراوان هەمومان سفرکرد ئەم هەمو پێچ و پەنایە بۆ لەناوبردنی شوێنەوارو کەلتوری ئێمەی کوردە هەرچی کوفرو ناشرینیش هەیە هەمووی هەر مەبەستیان ئێمەیە خۆ ئەگینا شەش کیشوەری ترهەن بەوتەی ئەمانبێ کافرن کەچی ماڵوێرانیەکە هەر بۆ ئێمەیە هەر بە کورد وتویانە کافر وشەی کافر واتا چی؟ کێ کافر و پیاوکوژ و

تاڵانکەرە، یان داگیرکار ؟ لە سەردەمی بڵاوبوونەوەی دامەزراندنی ئیسلامدا، لەو بیابانی حیجازەدا کە دەچوونە سەراو ئاو نەبوو، بە بەرد کۆمیان دەسڕی و دەچوون نوێژیان دەکرد، جا بەراوردیان بکە لەگەڵ وڵاتێکی وەکو میزوپۆتامیا، یان کوردستاندا، بەو هەموو جوانی و خێروخێراتەوە. هەرچی ڕەوشتی ناشرین هەبوو لە دونیادا، لەواندا هەبووە، بەداخەوە ئەو کەلتوورە بۆگەنەیان تێکەڵ بە کەلتووری کورد کرد مەبەستم بەرناوەو قورئانی پیرۆزنیە مەبەستم کەلتووری عەرەبە کەلتورەکەیان کۆنترە لە دینی ئیسلام ئەوان قورئانیان پیشاندایـن و کەلتورە خوێناوێکەی خۆیان سەپاندە سەرئێمەدا خۆ قورئانی پیرۆز فەرمویەتی بەبێ پرسی هەر خاوەن ماڵێک بچیتە ناو هەر ماڵێک یان هەر خاکێک نوێژو و ڕۆژوی قبوڵ نیەو کەچی ماڵ و وڵاتی دونیایان کاولکرد بەناوی فتوحاتەوە بۆ شاهیدی ئەم وتەیەم بڕوانە لەئەمڕۆدا هەرچی شوێنەوار دەدۆزێتەوە بە دەیەها مەتر لەژێر زەویدایە چونکە کاتی خۆی هەمو شارو قەڵابون وکاولکراون کەچی جاشە خۆفرۆشەکانی کورد ،کردوویانن بە فریشتە لەئێمە هەموو داگیرکەران نەک هەر ئەوان بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی کەلتووره بۆگەنەکەی بەر لە (١٤٠٠) ساڵی پێشی ئێستای عەرەب، (بڕوانە: کتێبی مێژووی خوێناویی ٩١ ساڵەی ئەمەوییەکان، لە نووسینی مامۆستای بەڕێز حەسەن بارام)، چەندە دڕندانە و ناشرین بووە کە ئێستا پیاوانی بەناو ئاینی کورد دەیانکەنە فریشتە، هەتا ئێستاش بۆنی خوێنی لێدێت بۆ لەخشتەبردنی نەوەکانی گەلەکەمان، دەتوانم بڵێم ئەمانە سەرچاوەی هەرچی ناشرینی هەیە، پیشەی ئەم گەلە بوون لە پێش هاتنی ئاینی ئیسلامیش پیشەیان تاڵان و ڕاو ڕووت بووە، هەتا ئێستاش خۆ ئێمە بەپێی مێژوو و شوێن هەوارەکان بێت هەزارەها ساڵە ئێرە جێگامان بووە و هەر ئێرەش جێگامانە، بۆ

نموونە بڕوانە حەزرەتی نوح درودی خودای لەسەربێت، لەسەر کێوی گودی بەوتەی ئایەتی قورئانی پیرۆز سەفینەکەی گیرساوەتەوە و شاری شەرناخی ئاوەدان کردووەتەوە، بە بۆچوونی من، پێموابێت شەڕناخ بە واتای شاری نوێ دێت، واتا ژیانێکی سەرلەنوێ دەست پێ دەکەنەوە، چونکە لە خنکان ڕزگاریان بووبوو نوح، یان نوو، نوێ. عەرەب کردوویانە بە نوح، شاری شەڕناخ واتا شاری (پێغەمبەر نوح، درودی خودای لەسەربێت)، ئەم گەلانەی چواردەورمان هەموویان نەورۆز بەو شێوەیە باس دەکەن، یان دەیکەن بە هی خۆیان، بەدڵنیاییی وشەی نەورۆزیش لە سەردەمی نوحەوە هاتووە، ئێستاش هیچ کام لەم دەوڵەتانە نازانن نەورۆز واتای چی، چونکە هی ئەوان نییە نەورۆز هەر لەو ڕۆژەوە هاتووە کە لە لافاوەکە ڕزگار بوون، دیارە بێگومان سەری ساڵیش بووە و کۆتایی بەفر و بەستەڵەک بووە، سەرماو سۆڵە نەماوە و بەهار هاتووە و کردوویانە بە جەژن و خۆشی، ئەو ناوەش لەوەوە هاتووە کە ڕزگاریان بووە و دووبارە ڕۆژێکی نوێیان دەست پێکردووەتەوە، بۆیە گوتوویانە نوێ ڕۆژ، واتا هەموو شتێکیان سەرلەنوێ دەستی پێکردووەتەوە، ناوی نوحیش هەر لە نوێوە هاتووە، واتا لە تازەوە هاتووە، ناوی ، زودزوودرایە لە ئەفسانەی سۆمەریدا لەکتێبی گلگامشدا هاتوە لەوێ دەڵێ زودزودرا هێشتا ماوە واتا نوح یان نوێ عەرەب، پیتی حا هەمیشە ها دەکاتە حا جا حا کەیان بۆ زیاد کردووە، نوو، یان نۆ، واتا دەستووری نوێ، ژیانی نوێ، جەژنی نەورۆزیش لەو کاتەوە هاتووە، بۆیە زۆربەی گەلان بە هی خۆیان دەزانن، چونکە هەموویان لە کورد جیابوونەتەوە، بەڵام زۆری بەسەردا تێپەڕیوە و کۆن بووە و لەبەر بەرژەوەندیی تایبەتی هۆز و گەلان شێواندوویانە، هەرکەسە و دەیکات بە هی خۆی، بۆ نەتەوەی کورد ناوەکە گەواهی دەدات، دووەم شوێنەکە کە

چەقی کوردستانە، با ئەوەش بەبیرتان بهێنمەوە هەمان باس و خواس بووە لە پێش نوحدا بە ناوی جەمشیدەوە، بەڵام جەمشید باخی دروستکردووە، نەک کەشتی، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە ژوانی یەسنا، بەشی یەکەم، پێم وابێ زودزوودرا ڕاسترە چونکە کۆنترە لەگلگامشدا باسی دەکات هەروەها لە کتێبەکەی داروینداو ئەو کتێبانەی شیکارییان لەسەری کردووە؛ باس لە دەیەها ملیۆن ساڵ دەکەن کە مرۆڤ هەبووە، بەڵام بەسەرهاتەکەی نوح، یان جەمشید دەگەڕێننەوە بۆ حەفتا هەزار ساڵ، بە بۆچوونی من لەپێش لافاوەکە کورد ناوی تری هەبووە، بەهەمان زمانەوەئەویش ئارەراتیەکان بونە یان زاگرۆسیەکان ئەم دووسلسلە کێوەیش زۆرترین شوێنەواری مرۆڤەکۆنەکانی تیادایە واتا جێگای زاووزێی مرۆڤایەتی و تەواوی زندەوەران هەتا گەیشتۆتە بەرزبونووەی لافاوە گەورکە لە عەشتارو گلگامشیشدا باسی دەکات سەردەمی بابلی وسۆمەریەکان دەڵێن لافاوە مەزنەکە تۆبڕوانە وشەی نوو ئەو نوێ یان شار بۆنمونە ناوی شاری شەرناخ یان ناوی بۆتان واتا باشان خوێنەری ئازیز ئەم وشانە هەمان وشەکانی کوردی ئەمڕۆن بێگومان ئەم ناوەی ئێستا لە گودییەکانەوە هاتووە، پێموابێت ئەو ناوەش میترایيەکان بێت، شوێنەکەشیان ئارەراتە واتا ئاریەکان یان هەر ناوێکی تر بێت، چونکە ئاگر لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە دۆزراوەتەوە بێگومان بەر لە لافاوەکە بووە بەڵگە چیە باشە نوح و گەلەکەی کەشتییەکەیان بەچی دروستکرد بێگومان بەئاگر و بەقیر بە پیک بە کێردو قەڵەم هەروەها چەقۆ و بسمارو هەرە دیارە سەردەمی ئادەم وحەواش کورد هەرلێرەدابووە جا ناوی گود یان کورد هەر لەگودیەکانەوە هاتووە بڕوانە گود، گوودی، گوود، یان گوردی، لە پاشان بوو بە کورد، ئێستاش گەلانی تر بە کورد دەڵێن کوردی، بەڕاستی هەموو گەلان گەواهی ئەوە دەدەن کورد لە

هەموو ڕوویەکەوە زۆر لە گەلانی تر باشترن، چونکە ئەم گەلە لە بنەچەدا خۆڕسک پێگەیشتووە، هەتا زیادیان کردووە و کۆمەڵ کۆمەڵ جیابوونەتەوە و دوورکەوتوونەتەوە لە یەکتری، هەمیشە بەدوای داهێنان و دەشتی باش و لەوەڕگای باشدا گەڕاون، خۆ کەس نەبووە ڕێگرییان بکات، مەگەر لەگەڵ خۆیاندا پێویستی تازەیان دۆزیوەتەوە و دیارە خۆیان ناویان ناوە، هەروەها نەوە لەپاش نەوە هەڵسوکەوت و گفتوگۆشیان گۆڕاوە و بەپێی ڕۆژگار ئا بەو شێوەیە بنەماڵە و هۆز و نەتەوەیان لێ دروست بووە، بە شەڕ و خوێن ڕشتن نەبووە، لەگەڵ کێدا بیکەن، واتا ڕکابەریان نەبووە، هەر سەرقاڵی ژیان و داهێنان و گەڕان و گوزەرانی ڕۆژانەی خۆیان بوون، چەندە زیادیان کردووە، بنەماڵە بەدوای شوێنی باشدا گەڕاون بۆ خۆیان و ئاژەڵەکانیان وایان لێهاتووە ئیتر یەکیان نەناسیوەتەوە هەر زیادیان کردووە و جیابوونەتەوە و دوورکەوتوونەتەوە، وردە وردە گەورەکانیشیان نەماون، بۆیە خەڵکی وەکو نەناسی لێهاتووە، بۆ زمانەکەشیان ئەگەر بڵێی چۆن گۆڕاوە، ئەوا بەهۆی دۆزینەوەی ناوچەکە و بەروبوومەکەیەوە بووە شتی تازەیان دۆزیوەتەوە و بەگوێرەی شێوە و قەبارەکەی ناویان ناوە، بۆ نموونە ئێستاش لەم سەردەمەدا ئێمەی کورد لە هەندێک ناوچە بە سەوزەیەک دەڵێین ترپ، ئەو شتە خڕەیە سەری لەناو زەویدایە و گەڵاکەی لە سەرەوەیە، لە زۆر ناوچەشدا پێی دەڵێن توور. یان شووتی، شامی کوودی، کوولەکە، باینجان گونەڕەشەو زۆری تر، بڕوانە جیاوازییەکان وا دروست دەبێت، نموونەیەکی تر لە باکووری کوردستان دەڵێن هەڕە، لە باشووری کوردستان دەڵێن وەرە، لەناو عەرەبەکاندا بە بەڕوو دەڵێن بەڵووت، بڕوانە چۆن گۆڕیویانە، هەمان ماناش دەبەخشێت، بەم شێوەیە زۆر زمان و زاراوە و نەتەوە و شێوە پەیدابووە تائێستاش لەبەرەو پێشچووندایە، بەڵام کورد هەر

به ماڵه گەورە ماوەتەوە، ئەمرۆش مێژوو و شوێن هەوارەکان گەواهی دەدەن و تەکنەلۆژیا ئەوەندە پێشکەوتووە، هیچ شتێکی بە شاراوەیی نەهێشتووەتەوە، هیچیشی لێ وننابێت، کوردستان بەڕاستی دیارە وڵاتێکی ئارام بووە و لە هەموو ڕوویەکەوە باش بوون، واتا لە بنەماڵەی باشەکان، گوود واتا باش، هەمان گوودی هیندۆئەوروپییە، بەدرێژایی مێژوو هەزاران گۆڕانکاریی بەسەر ناوچەکەدا هاتووە، داری بەسەر بەردەوە نەماوە وەکو کورد دەڵێت. بەڵێ، هەروەکو گوتم مێژووی ئێمەیان شێواندووە و خۆشیان شتێکیان نەبووە بیخەنە جێگای، ئەوەشمان لەبیر نەچێت، گەلی کورد زۆرینە بوون لەم ناوچەیەدا لە پاش نەمانی دەسەڵاتی، بۆیە نەیانتوانیوە کەلتوورەکەی بگۆڕن، وەک گوتم لە پاش نەمانی دەسەڵاتەکەی ئەگینا، دار و بەردیان هەڵدەتەکاند وەکو قیبتییەکان و ئەوانی تر، ئەوەش بزانن بیروباوەڕەکان ئەزەلی بوون، بیروباوەڕەکانی تریش هەمان بیروباوەڕی دایک بوون، هەرکەسەو لە بەرژەوەندیی خۆی دەستکاریی کردووە، چ سیاسی و چ ئاینی، تەنانەت لە ڕووی پیشەسازیی و ئابوریشەوە هەمان بیروباوەڕی نەتەوەی دایکیان بووە، کە ئەویش کوردستانە، تاکە سەرچاوە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا ئەو کەلتور و داب ونەریتە بووە کە نوح و بنەماڵەکەی هەڵیانگرتووە، لە پاش لافاوەکەش لە شەڕناخەوە دەستیان پێکردووەتەوە، ئەگەر نوح هەرچی بووبێت، هەموومان لەو نەتەوەیەین. بەپێی ناوەکان و شوێنەوارەکان بێت، کورد بوون، تۆ بڕوانە ناوی خودی نوخ لە نوێوە هاتووە، لە باکووردا بە جێگا و مەئوا دەڵێن ئاخ، واتا نیشتمانی نوێ بووە بە نوخ، نوێ ئاوا ناوی دەرکردووە، ناوەکەش سروشتییە، وڵاتی نوێ لە پاشان گەلانی تر کردوویانە بە نوح، واتا ژیانێکی سەرلەنوێ، پیتی (نە) بەهەمان ماناوە، هەرشتێک نەبێت کورد دەڵێت نابێت، نەبووە و

نەکراوە، واتا هەموو شتێک لە نوێبوونـەوەدایە، تەنانەت نەوی، یان نەو ئەوروپیش هەمان مانای هەیە، چونکە هەمـان سـەرچاوەی ژیـانی پاش لافاوەکەیە، هەرچی بوو نەما، ئەوەی مایەوە سەرلەنویّ دەستی پیّ کـردەوە، نەورۆزیـش هـی ئـەوکاتـەیـە، بۆیە پیرەمێـردی نەمـر دەڵێـت: (جەژنـێکـی کـۆنی کـوردە، بە خۆشـی و بەهـاتەوە)، واتـا ژیانێکی خۆشتر و بەپیت و بەرەکەت و بە هاتەوە، واتا بە خێـرو خۆشییـەوە دیارە ڕزگاریان بووە و هەموو شتێک نوێبووەتـەوە و جەژنی نوێبوونەوەی ژیانی تازەیە، بۆیە گوتوویانـە نـەورۆژ، واتا ڕۆژی نوێبوونـەوە و ڕزگـار بوون لە مردن و لە زاڵـمەکـان، دیارە ئاووهـەواش خۆش بووە و خۆریـش تاوی سـەندووە بەهـۆی نەمانی ئەو ئـاوەزۆرەی کۆبوبـووە لە دەریـاچەکانـداو تـەمومـژ نەمـاوەو خۆریـش بەتـەواوی لە ژێـر هـەور بەدەرکەوتـەوە و سـەرزەوی بـوژاوەتەوە و ژیانـی پـیّ بەخشیونەتـەوە، بێگومـان زۆریـش پیـرۆز بـووە بەلایانەوە و لەپاشـان گەیشـتـووەتە ڕادەی پەرسـتـن، ئەم ڕاستیـیانەش لە هەر چوار کتێبـە ئاسمانییەکەشـدا ئەوەیـان سەلماندووە، بەپێی مـێژووو شوێـنەوارەکان لافـاوەکە دەگەڕێتـەوە بـۆ بەر لە (٧٠٠٠٠) سـاڵ پێـش ئێسـتا و بـگرە زیاتریـش، بۆیە ئێسـتا دووژمنانـی کـورد و خیانـەتـکاران دەیانەوێـت بە نـاوی حەرام و بیدعـەوە بیسڕنـەوە، زۆری تـریان سڕیوەتـەوە، بـا ئـەوەش بزانیـن هـەر پـاشایەک، یـان هەر حاکمێـک، یـان هەر زۆردارێـک هاتبێتـە سـەر دەسـەلات، بە بەرنامەیـەکی تـرەوە هاتووەتـە سـەر دەسـەلات، هەر هەمـووی گۆڕیـوە بە دیـن و دەستوور و بەناوەکانیشـەوە، هەروەکو فارس ناوەکەشـی هی خۆی نییە کە هاتوونەتـە کوردسـتان، کەلوپەلیشـیان لەبـەردانە بـووە، بـەر لە دوو هەزار و دووسـەد و پەنجـا ساڵـە بوونـەتـە خاوەنـی دەوڵـەتـی بـا بڵێیـن بـەناو خۆیـان، کە هەر هەمـوو دەوڵەتەکە بە

خاکەکەشەوە هی ئیمپراتۆری مادەکان بوو، لە زۆر شوێندا لەم کتێبەدا باسم کردووە بە ڕوونی و بەدورو درێژیی، بەڵام چی دەڵێیت ئیتر دونیایە و ئاوی زۆردار بۆ سەرەوە دەچێت و ڕۆژگاریش لە گۆڕانکاریدا بووە، بە هەموو جۆرێک گۆڕاوە و هەر بەردەوام دەبێت لە گۆڕان، کورد بەر لە سێ هەزار ساڵ خاوەنی دەوڵەت و شارستانییەت بووە، خاوەنی خوێندن و نووسین و سوپا و باج و دەرامەت بووە و لە هیچی کەم نەبووە، خاوەنی زانایەکی وەکو سیتاما زەردەشت بووە، کە شەترەنجی داهێناوە، کە هەموو بوارەکانی ژیان لەخۆ دەگرێت: لە فەلسەفە، زانست، سەربازی، ڕامیاری، کشتوکاڵ، بازرگانی و واتا بەگشتی لە هەموو بوارێکدا ئەویش بۆ پاشا گۆشتاسپ دروستیکرد، پاشا هێندە دەوڵەمەند ببوو، ببووە خاوەن دەسەڵات و سەروەت و سامانێکی زۆر، بێهیوا ببوو، واتا بێ ئەمەل، وای دەزانی دونیا تەواو کۆتایی هاتووە و شتێک نەماوە هەوڵی بۆ بدات، تووشی خەمۆکی ببوو، بۆیە زەردەشت شەترەنجی بۆ دروستکرد، بۆ ئەوەی تێبگا لە ژیان چۆن هەمیشە لە سوڕاندایەو بەردەوامە بۆ ئەوەی خۆیشی پێوە خەریک بکات و کاتی پێ بگوزەرێنێت و فێری زانستیش بێت، کە ئێستا گەلانی جیهان شانازیی پێوە دەکەن. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ژوانی یەسنا، بەشی یەکەم، هەنگاوێک بۆ دۆزینەوەی بەشێک لە جوگرافیای ونبووی ئاڤێستا).

بێگومان شەترەنج زانستی گشتیی تێدایە، فەرماندە گەورە سەربازییەکانی وڵاتە زلهێزەکان بۆ پلانی سەربازیی سود لە شەترەنج دەبینن. بەڵێ کورد خاوەنی زانایەکی وەکو زەردەشت بووە، خاوەنی ئەو زانستە گەورەیە بووە، بۆیە ئەو پێشکەوتنەیان بەخۆوە بینیوە و لەو سەردەمەدا ئیمپراتۆرییەتێکی گەورەی

وەکــو ئاشـــوور پانیبالـــی تێکشکانـــد، دەمەوێـــت ئەوەش ڕوون بکەمەوە کە زۆربەی گەلان چوون چاویان بڕیبـووە وڵاتـی کـوردان و هەرکاتێک هەلیان بۆ ڕەخسابێت هێرشیان کردووە و تالانیان کــردووە و خـەڵکەکـــەیان پاکتـــاو کــردووە، کولتوورەکەشـــیان سڕیوەتـــەوە، ئـــەوە هـیچ کــە کوردسـتان لانکەی مرۆڤـایەتی بــووە، هـەرچی دابونەریت و ئاین و کـەلتووره لەم وڵاتەی ئێمەوە سـەری هەڵـداوە، بەڵگەشــت دەوێـت، ئەوەتـا تەکنەلــۆژیا پێشکەوتـــووە و هەموو شتێـکی ڕوون و ئاشکرا کردووە، برۆ بگەڕێ و ببینـە بە چاوی خۆت، مەبەستی من تەنها لێرەدا ئەوەیە مرۆڤ تێبگات دونیا چـۆن دەسـتی پێکــردووە و پێشکەوتـــووە و چـی بەسەرهاتـــووە، هـــەروەها چـۆن وای لێهاتـــووە تێبگەیـــت و وردی بکـەیتـــەوە و شیکاریی بۆ بکەیت و پێم خۆشـە بزانیت ڕەگی پێشکەوتنەکـان و داهێنانەکـان لە کوێـوە هـاتوون و بنـەمایـان لەسـەر چ بناغـەیـەک دامەزراوە و دامەزرێـــنەری بـــۆ کـــێ دەگەڕێتەوە،بێگـــومان هەموبینایەک لـە بنـاغـەوە دەسپێدەکات هیچ شتێک بێ بنـاغـە نیە ئەو داهێنانـەش تـاکو ببێتـە جێگـای شانازیـی بۆ بنـەماڵـە و هـۆز و گەلەکـەی و هەمـوو مرۆڤایـەتـی، نەوەکو هەرکـەسە و هـەڵسێت خـــۆی پێوەهـەڵکێشێـــت و مافیـــشی بەســـەرەوە نەبـــێت و داهێنـەرەکـــەشی بسـڕێتـــەوە، بێگـــومان بـەپێـی مێـژوو و شــوێن هەوارەکـان و زانسـت و تـەکنەلۆژیـاش بێـت؛ ئەو مافـەش پێـش هەمـوو گەلێـک دەگەڕێتـەوە بۆ گەلەکـەی مـن، کە گـەلی کـوردی چەپاوکراوە، بەڕاستـی ئـەم هـەویرە ئاو زۆردەکێشێت..

بـا لێــرەدا ئاوڕێـک لە مەقـام و ئاوازەکـان بدەینـــەوە، بێگـومان بنـەڕەتـی هەر هەموو داهێنـانـەکان لێرەوە دەستی پێکـردووەتەوە، هەروەکو چۆن ژیان دەستی پێکردووەتـەوە، ئیتـر هـەریـەکـە و بۆ خـۆی شتێکـی بـۆ زیـاد کـردووە و داهێنـــانی تـازەی کـردووە، تـا

گەیشتووەتە ئەمڕۆ، ئەوەش بزانە کورد خۆی خۆی لە ناوبردووە، ئەگەر دوژمن خاکەکەی داگیرکردبێت، سیاسییەکان و پیاوە ئاینییەکان مێشکی لاوەکان دەفرۆشن و کەلتوورەکەشی ئەنفال دەکەن، ئەنفال واتا فەرهوود. بە شانازییەوە ئەگەر بە مەبەست بێت، یان لە نەفامیی بێت بەرەبەرە لە ناویان بردووە و لەناویشی دەبەن، بەداخەوە کورد لە دوژمنەکان زیاتر دوژمنی خۆیەتی، کورد ئەمەشی ماوەتەوە هی فیداکاران و دلسۆزان و دەوڵەمەندیی کاتی خۆیەتی، ئەمەشی ماوەتەوە، لەو سەردەمەدا ژیان بە سروشتی ڕۆیشتووە. ئەمڕۆ دەمی زانست و خێراییە، دونیا وەک ئەمڕۆ نەبووە، تەکنەلۆژیا هەر ڕۆژە و داهێنانێک دادەهێنێت، هەموو پێویستییەک بەردەستە، کەس دانامێنێت، بۆیە بەو شێوە تێکەڵ و پێکەڵیان کردووە، تۆ بڕوانە تورک، کورد خۆی هێناوێنێتی بۆ ئێرە، واتا کوردستان، ئەوانیش کەلتووری ئێمەیان پەیڕەوکردووە و داب ونەرتی ئێمەیان هەڵگرتووە، کە جێ پێی خۆیان قایم کرد و تێکەڵاوی گەلی کورد و سوپا و سیاسەتەکەی و کەلتوورەکەی بوون، لە پاشان سوودیان لە گۆڕانکاریی ناوچەکە و ناکۆکیی ناوخۆیی بینیوە و هەلیان بۆ ڕێککەوت و هەر بە یارمەتی ناحەزانی وڵات و زلهێزە جیهانگیرەکانی ئەو سەردەمە، دەستیان گرت بەسەر کیشوەرەکەدا بۆ ماوەی (٥٠٠)ساڵزیاتر فەرمانڕەوایی کیشوەرەکەیان کرد، واتا کیشوەری ئاسیا و بەشێک لە ئەفریقاشیان داگیرکرد تورک، لە بنەڕەتدا لە نەتەوەی تەتارن لەگەڵ نەتەوەی مەغۆلدا هەمیشە شەڕیان بووە. لە فیلمەکەی جەنگیزخاندا باسیان دەکات چۆن تەعەدایان لە بنەماڵەی جەنگیزخان کردووە، لە کتێبی (مێژووی جەنگیزخان)یشدا

باسـیان دەکـات و لەگـەڵ تـەواوی هـۆز و نەتەوەکانـی چـین و قەفقازدا ناتەبا بوون، جەنگیزخان بۆیە وا توند وتیـژ و بـێ ڕەحـم بـوو زۆر چەوساندبویانەوە هۆزو تیرەکانی ترلەدواییدا بونە ئەو دەوڵـەتە داگیرکـەرە و دونیـایان وێرانـکرد تورکیـش هەرهەمـان بەرنامەی پەیڕەو کرد جا کورد چونکە خاوەنی دەوڵەتی خـۆی بـوە پێویسـتی بەشـەڕ نەبـووە بەڵام بەرگری لەخـۆی کـردووە بـۆیە لە ئەنجامـدا ئەمە دەیبینیـن جـا تـورک ناوەکەشـیان لە تەتـارەوە هاتـووە، بەڵام بۆچـونی ترهـەیە کە بـووە تـورک، بەتایـبەت لە دوورک-ەوە هاتووە، ئەم ناوە لە نـاوی سێ مللەوە هـاتووە وەکـو لە سەرچـاوە کانـدا باسیـان دەکـەن لە بـا کـووری کوردستانـدایە، ئەمانیـش کڵاوقۆڕیەکـیان لەسـەردا بـووە لەو قـوتانە چـووە، ئەو قـوتانەش ناویـان دوورک بـووە، ئیتـر گوتـوویانە ئەمـانە دەڵێـی دوورکن، پاشان بووە بە تورک و ئیتر کیانیان دامەزراند و هەلیان بۆ ڕەخسا بە بۆنەی ناتەبایی پاشاکانی ئۆرکەوە، یان هۆرییـەکان و هاتنی چەندەها زلهێزی جیهانگیر، بۆ نموونە وەکو: ئاشوور، جەنگیزخـان، هۆلاکـۆ، تەیمـووری لەنـگ، ئەسکەنـدەر و هەتـا سەرهەڵدانی ئیسلامیش ئەمانە نێوانیان زۆربووە من وەکـو بەڵگـە دەیهێنمـەوە یان بۆنمـونە لە خـوارەوە بەدرێژی باسـم کـردووە جـا تـورک خۆیـان گـرت و بەهێـز بـوون و هەتـا وایـان لێهـات زیـاد لە (٥٠٠) ساڵ حوکمڕانی ئاسیا و دەوروبەریـان کرد و دەستـیان کرد بە گۆڕانکاریـی و سڕیـنەوەی کەلتـوور و نـاو و شوێـنەوار و هەرچـی پەیوەنـدی بە مێـژووی وڵاتەکـەوە بـووە و زۆریشـیان کـردووە بە هـی خۆیـان، بـۆ نمـوونە کـورد لە پێشـدا مانـگ و ئەستێـرەیان پەرستـووە، وەک لەسـەرەوە باسـم کردووە بە جوانی، بۆزانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی عەشتاری بابلیەکـان و گلگامێش کتێبی سۆمەریەکان چۆن مانگو خۆرو زۆرشتی تریان پەرستووە

حوکمەکەش حوکمی سۆمەریەکان بووە بەگشتی ئێستاش بڕوانە ئالاکەی تورک مانگ و ئەستێرەیە، هەتا زۆر لە گەلانی تر ئالاکەیان مانگ و ئەستێرەیە، بە بۆچوونی من، ئەو ئالایە هێمای بیروباوەڕەکەیانە کە بیروباوەڕی کۆنی سەردەمی پێش خۆرپەرستی و خودا پەرستییە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی نەمرود پاشای هۆریەکان کە دایە ئاینانا و ئەنکی کوڕی کوشت لەبەر ئەوە ژنێکی باشو دڵسۆزی خەڵکەکە بوو ڕێگای بە خەڵکی پیشان دەدا و کۆسپ بوو لە ڕێگای نەمرووودا نەمرود کوشتی لەپاشان بە مروری زەمەن لەلایەن گەلەوە دایە ئاینانا کراوەتە خوا و بەمانگیان گوتووە ئەمە ئەوە بۆتە ڕێپیشاندەرمان و خزمەتی ئێمە دەکات جا نەمروودیش لەدژی دایە ئاینانا و لاینگرانی ئەنکی ئەکاتە خوای سەر بەخۆی چونکو کوڕی خوای مانگە کە هەر خۆیشی کوشتی جا نێخواوەندوو مێخواوەند هەر لەم دوانەوە پەرەی سەندووە بۆزانیاری زیاتر بڕوانە ئەفسانەی سۆمەریەکان گلگامێش و عەشتارو کتێبی پیرۆزی ئێزیدیەکان جوانتر تێدەگەی جا حەزدەکەم ئاماژەیەک بدەمە دینەکانی ولاتانیتر لە دونیادا هەموی دێتەوە سەر دایە ئاینانای هۆری کە سەردەمی دایک سالاری بوو کە بوە مێنگە خواوەندی سۆمەریە کان و تەواوی سەرزەوی هەر دایە ئاینانایە عەشتارو بەعل و عزو لات و هەتا ئلهامی مەریەمی مەسیحیش دێتەوە سەر هەمان ڕێگا هەرهەمویشی ئەوکاتە هۆریبونە واتا خۆرپەرس هەموی لە هۆریکانەوە داهاتووەو سەرچاوەی گرتووە چونکو سۆمەریەکان لە هۆریەکان جیابونەوە لەسەرەوە ئاماژەم پێکردووە ئەو خۆرو مانگ پەرسیشە لە هۆریەکانەوە بۆ سۆمەریەکان و گەلانیتر داهاتووەو واتا لە کوردستانەوە بڵاوەی کردوە بەجیهانە

ئەوکاتە وڵاتی هۆربووە ناوی کوردستان نەبووە، ئەگەر بڵێیت چۆن بڵاوەی کردووە، بەو وڵاتانەدا، خۆ دینی مەسیح و ئیسلامیش هەر لێرەوە گەشتووەتە وڵاتان، لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتووەتە وڵاتانی جیهان، لە سەردەمی ڕابردوودا ئەو هێمایە مەبەستم مانگەکەیە لەسەر منارەی مزگەوتەکەی گوندی حاجی خەلیل مابوو، کە ناوچەی بنکورەیە سەر بە شاری خانەقین کۆنترین شارە جێگای هۆزێکە بەنێوی باجەڵان و لە ئەسڵیشا هۆریبونەو ئێستایش شوێنەواری هۆری زۆر ماوە لەوێ ئەوهێمایەی باسی دەکەم هەرماوە لە سەر منارەی مزگەوتە کۆنەکان کە ئێستا بۆتەوشەیەکی عەرەبی، ئەم ناوە یەک پیتی بۆزیاد کراوەم ئەمەش لە کەلتووری زەردەشتەوە وەرگیراوە، مەنارە واتا نار، ئار، ئایەر، ئاگر، ئەوکات لە مزگەوتەکاندا هەمیشە ئاگر گڕاوە، خۆ دەبێت نەفەسی هەبێت بۆ دەرچوونی دووکەڵەکەی، کەوابێت منارەکە بۆ دووکەڵەکە بووە، لوولەی دووکەڵکێش بووە، ئەم شوێنی دووکەڵکێشە لەناو پەرستگاکانی سەردەمی گاتاکاندا، یان گاورەکاندا بووە، واتا لە مزگەوتی زەردەشتییەکاندا بووە، بڕوانە ئێستاش لەسەر مزگەوتەکانی ئەم سەردەمەدا هەر باوە، ئەو گومەزەییە کە لەسەرئەم مزگەوتە دەیبینی مەبەستم مانگ و ئەستێرەکەیە بەڵام ئەستێرەکەی نەماوە هەتا ساڵەکانی حەفتاکان مابوو بۆ چی ؟ چونکە سەردەمی حوکمی عوسمانی بوو هەرچۆنێ دینی ئیسلامی پەیڕەو دەکرد بەڵام کەلتورەکەی خۆی دەسەپان هەرچۆنێ لە بنەڕەتدا کەلتوری ئەونیە بەس کەهاتۆتە وڵاتی هۆریان و ئەو کەلتورەی هەڵگرتووە وەکو مێژینەی خۆی شانازی پێوە ئەکات و دەیپارێزێ و بێ ئەوەی هیچ دژایەتیەک بکرێت

لەلایەن پیاوانی ئاینیەوە دین واتا دەستورو یاسای ئەو وڵاتە یان پەیڕەو بەرنامەی وڵات جا لەهەر وڵاتێکەوە دەرچوو هەرکەسێ پەیڕەوی بکات هەر خزمەتی ئەسڵەکەی دەکات تورکیش چون حکوم بەدەستی خۆیەوە بوو خزمەتی خۆی پێدەکرد هەموو دین و ڕێبازەکان هەر بۆ خزمەتی وڵاتانی خۆیانن بڕوانە مەسیح بووزا یەهودی و نەسرانی هەروها ڕێبازەکانیش وەکو دیموکراتی و کۆمۆنیستی و سۆسیالستی و هەزارەهایتر هەر لە خزمەتی خۆیاندا بووە بەس کورد نەبێ هەمیشە بۆتە خزمەتکاری خەڵکی زۆر بەموخڵیسی و ئەنجامیش هیچی بۆنەماوەتەوە و ئەویش کۆتاییەتی و پەندیش وەرناگرێت جا ئێمە کاتی خۆی خاوەنی مزگەوت و پەرستگا بوین زۆر دەوڵەمەندبوین لە هەموو ڕویەکەوە جا مەبەستمان مزگەوت ومنارەکەی بوو بۆچی ؟ ئەومنارانە



دروســـــتكراوون لە سەرمزگەوتەکـــــان و پەرستگاکـــــان . بـــۆ دەرچوونی دووکەڵی ئاگرەکە بووە، کە هەمیشە دەبووایە بگڕێ و نەکوژێتەوە، چونکە بە نووری خودایان زانیوە، بۆیە گوتوویانە ئاهورامەزدا، واتا ئاهری مەزن، یان ئاگری مەزن، ئاهور، ئاییر، ئایەر، کە ئێستاش ئاگرە، پەرستگاکەش ناوی مزگەوت بووە، واتا شوێنی زیکرکردنی ئاهورامەزدا، لە وێشەوە بانگیان لە خەڵک کردووە بۆ ئەم ئەمزگەوتــە مزگەوتــی ئاوایــی ساڵــح ئاغــای جمــورە لەبنکــورە ئێستــا ناحێیــە ســـەر بــە قــەزای خانەقینــە دروســتکراوە بــۆ خوداپـــەرستی و نــوێژکردن، ئێســـتاش ئەو گـــوومەزیەیە لەســـەر مزگەوتەکـــان دەکەن، کە ئاگرەکەشـــی نەمـــاوە، مـــاوەیەک مەلاکـــان دەیانگــوت منــارەی ناوێــت، خەڵــکی گوتــیان ئــاخر کەس نازانێــت مزگــەوت لە کوێیــە و ناناسرێــتەوە، کاتێــک کەسێــک بییەوێــت بڕوات بۆ مزگەوت، شکیان کردبوو کە ئەم نەریتە زەردەشتییە باشە، ئەوجا دووکەڵکێش بوو، ئەی ئێستا بۆ چییە؟ ناشێت بڵێن بۆ بڵندگۆکانە، کەواتا هەمان کەلتوورەکەی زەمانی زەردەشتە، کەچی لە ئێمەیان شێواندووە و ئێمەش بە خەیاڵماندا نایەت و بە هــی عەرەبــی دەزانیــن، بــا ئەوەش بڵێــم خــۆ عەرەب لە پێــش ئیسلامدا شوێنێکی نەبووە نوێژی تیادا بکات، یان سوجدەی تیا ببــات، ئــەم وشــەیە لە چییــەوە هاتــووە؟ لە ئاهورا مەزداوە، واتــا ئاگری مەزن، لە میترایەکانەوە هاتووە بەر لە دە هەزار ساڵ، واتا (٨٥٠٠) ساڵ پێش ئیسلام و (٦٥٠٠) ساڵ پێش زەردەشتیش بوونە میترایییەکان، یان ئاتەرییەکان، یان ئارییاییەکان هەتا سەردەمی زەردەشــت، زەردەشــت ئەو بیــروباوەڕانەی پووچــەڵ نەکــردەوە و قەدەغـــەی نەکـــردن، زەردەشـــت فەیلەسوفێکـــی مەزن بـــوو، نەیدەویست زۆر لە مرۆڤ بکات بۆ گۆڕینی بیروباوەڕەکەی، چونکە بیــروباوەڕ بە قەناعەتــە، نەک بە زۆری شمشێــر، وەکو دینەکانی

تـر هەر بە زەبری هێز و کوتەک و شمشێر خەڵکیان هێنایە ژێربار، لە سەردەمی زەردەشتدا مرۆڤ ئازاد بووە، چی دەپرسێت و بیروباوەڕی چییە، بەڵام خراپەکار نەبێت دەرهەق بە ژینگە و ژیان و مرۆڤایەتی.

زەردەشت هەمیشە هانی خەڵکی داوە بۆ ئاهەنگگێڕان و شایی کردن و گۆرانی وتن و خۆشگوزەرانی، فەرموویەتی: با هەمیشە ڕووتان گەش بێت، چونکە خۆشبەختی هەمیشە لە ڕووگەشیدایە، ڕووگرژیی کاری ئەهریمەنە، وا تا خراپەکاران. هیچ کاتێک دژی ئاهەنگ و شایی و خۆشی نەبووە، بەپێچەوانەی دینەکانی ترەوە بووە، هەمیشە لە هەوڵی داهێنان و خۆشگوزەرانیی مرۆڤایەتیدا بووە و بەشێوەیەکی ئاشتیخوازانە هەڵسوکەوتی کردووە بۆنمونە وەکو هیندستان بڕوانە چەند دیانەتی تێدایەو کەس کاری بە سەر کەسەوەنیە ئەگەر ناحەزبیانتێڵێ هەر هەمان ڕێبازی زەڕدەشتیەکانە، بۆیە لە وڵاتی کوردەواریدا هونەر و هونەرمەندان هەمیشە لە پێشکەوتندا بوون و هەمیشە داهێنانیان کردووە، هونەر بە شێوەیەکی نیزامی ڕێکخراوە و سەدەها گرووپ هەبووە و هەریەکەیان لە بوارێکدا کاریان کردووە و برەویان بە کارەکانیان داوە، ئەم فەیلەسوفە خاوەنی زۆر داهێنانی مەزنە، کە هەتا ئێستاش جیهان پێی سەرسامە و کاری پێدەکەن، بۆ نموونە شەترەنج، یان تەختە نەرد، تاوڵە کە گوزارشت لە تەواوی ژیان و پێویستییەکانی مرۆڤایەتی دەکات، هەرچی سودی هەبووە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی باسیکردووە و دایهێناوە، باسی لە سودەکانی ئاگر و خۆریش کردووە، گوتویەتی: ئاگر و خۆریش نوری خودان و پیرۆزن، بڕوانە: میتر، ئاتر، ئاهوڕ، ئاگر، (ئا)کەیان لاداوە و بووەتە هۆر، واتا خۆر، کە

ئێستاش خۆره و هەر ئاگره، چونکە لەپێشدا ئاگر دۆزرایەوه گەرم و سووتێنەر بوو، ڕۆشنا بوو بە وێنەی خۆر، مزگەوتیش لە ئاهۆرامەزداوه هاتووه، واتا خودای مەزن، دەبێت سەری بۆ دانەوێنیتەوه بۆیە شوێنی ستایشکردنەکەیان ناونا مزگەوت، واتا ستایشکردنی یەزد مەزدا، واتا یەزدانی مەزن، یەزدانی گەوره، ئەوشوێنە بووه مزگەوت، بڕوانە عەرەب تەنها پیتی (گ)کەیان گۆڕیوه کردوویانە بە جیم هەر لە مزگەوتەکەوه هاتووه، مەسگەوت، مەسجد، مەزگەت، مزگەوت، مەسجەت، بڕوانە هەر مزگەوتەکەیە عەرەب هەمیشە (گ) دەکاتە (ج)، بۆ نموونە وەکو گودیان کرده جود، مەنارەکەش هەر ئارەکەیە، وەک لەسەرەوه باسم کردووه. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: ژوانی یەسنا، بەشی یەک و دوو، (ل١٦٥-١٧٧)، یان ئەو کتێبانەی کە باسی دینەکان دەکەن لە مێژووی مرۆڤایەتیدا لە کۆتایی ئەم کتێبەدا وەکوسەر چاوه ناوکانیانم نووسیوه).

بڕوانە مسرییەکان عەرەب نین (ج) دەکەنە (گ)، بۆ نموونە جەواد دەکەنە گەواد، تەنانەت ئەردەن، لیبیا، سوریا، لوبنان و زۆری تر لە وڵاتە عەرەبییەکان،

چونکە ئەمانە ئەسڵیان عەرەب نین بە زۆری ئەوڕۆژگارە کرانە عەرەب، نموونەیەکی ترتان بۆ دەهێنمەوه، جەوەنە ئەو شتەیە ئاوی خواردنەوەی تێدەکەیت و بچووکە بۆ سەفەر و بۆ کاروباری سەرپێیی دەیکەیت بە شانتدا، یان بە قەی وڵاخدا، بۆچی پێی دەڵێن جەوەنە، واتا پێستی جوانە ئاژەڵ، وەکو گیسک و بەرخ، کە چی بە هەمان شت عەرەبی بەدوو دەڵێن جود، واتا جەوەنە. بێگومان ئەمانەش لەو سەردەمەدا لە جەزیرەی عەرەبیدا دەستنەکەوتوون و پێموابێت ئاژەڵی بچووکیش نەبووه، وەکو: مەڕ، بزن، گیسک و بەرخ، چونکە جوگرافیاکەی

ئەوان زۆنگاو و چەم و دارستان و بیابان بووە، ئاژەڵی سپی، یان ئاژەڵی وردەی تیادا نەژیاوە، ئەوان زیاتر وشتر و گامێشیان بەخێو کردووە، بۆیە زۆر شتی وەکو ئەم پێویستیانە لێرەوە چووە بۆ ئەوێ، چونکە وڵاتی ئۆرک، یان هۆریان خاوەنی شارستانی وپیشەسازی و ڕۆشنبیری بوون، دەیەها داهێنانی پێویستییەکانی ژیان هەبووە، وەکو ئەم مەشکە بچووکە کە خۆمان پێی دەڵێین جەوەنە، ئەوان ئێستاش پێی دەڵێن جوود، واتا جەوانە، ئەو جوانە جەوەنە وەنەبێت ئەوان نەیانتوانیبێت دروستی بکەن، یەکەم ئاژەڵی وردە نەبوە لە وێ لەپێشدا دووەم خۆشەکردنی مەشکە و جەوەنە و کونە کۆمەڵێ پێوستی خۆی هەیە بۆ خۆشەکردنی وەکو کڵاوە جەوت و توێکڵە هەنار، یان بابڵێین خۆ ئاژەڵی گەورە بۆ جەوەنە نەبووە و بە کەس هەڵنەگیراوە، بۆیە لە کوردستانەوە بە شێوەی بازرگانی ڕۆیشتووە و ناوەکەشی لێرەوە چووە بۆ ئەوێ، بێگومان ئەگەر هەموو وشەکان بە جوانی هەڵبسەنگێنین، بە ماناکەیاندا دەردەکەون کە کوردییە، خاک، شوێنەوار، وڵات و سەرچاوەکان دەیسەلمێنن، من مەبەستم ئەوەیە ئێمە وڵات بوین و خاوەنی شارستانیەت و پیشەسازیی بوین لەبەر ئەوەی بازرگانی لە نێوانیاندا بووە بێگومان لەهەموڕویەکەوە ئاڵوگۆڕکراوە چ سیاسی و چ کۆمەڵایەتی و هونەر و مۆزیک ئەتوانم بڵێم وشەی میوزیک لە مۆغیکەوە وەرگیراوە یان مۆگیک واتا مۆگا یان گازا ئەو گاتاکان گازاکانە واتا بانگ خوێنەکان کە نوسینەکانی ئاڤێستایە مۆگاکنیش خوێندیانەو بەوانیش گوتویانە مۆگ عەرەب کردوویەتی بەمۆق دیارە وشەی مۆق بۆتە مۆسیقا کەوابێت هەمان مۆگاکانە بەڕونی لەسەرەوە باسم کردووە هەروەها پیشەسازی و هەتا ئاینیش لە هەموو ڕوییەکەوە

دان و وەرگرتن بووە بنەڕەت دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی ئۆرک هەتا سەردەمی ساسانیەکان هاتنی عەرەب بۆ ڕۆژهەڵاتی ئاسیا کە چی ئێستا ئەم گەلانە حاشا دەکەن لە بوونی کورد، نەزان و نەخوێندەوارەکانی کورد خۆی لە گشتی خراپترن داخی گرانم، لە بێخاوەنی کورد ئێستا ئەمانە بوونەتە خاوەنی هەموو شتێکی ئێمە و حاشا لە بوونی ئێمە دەکەن، لە هەمان کاتدا زەبوور و تەورات و ئینجیل و قورئانیش ئاماژەیان بە خاکی دایک داوە کە کوردستانە وزۆریش پیرۆزە و ئاڤێستاش سەرچاوەی هەر هەموویانە، کەچی گەلەکانیان حاشا دەکەن لە باوک و دایکی خۆیان، باوک و دایکی خۆیان ناشرین دەکەن و هەزار ناو و ناتۆرەیان لە کورد دەرکردووە، ئەگەر بچووکترین شت بڵێین دەربارەی قورئان، خوا نەخواستە پەرژین بێت کافرت دەکەن و فتوای کوشتنت دەردەکەن، بەڵام هەر قورئان دەفەرموێت: میللەتی کورد پاکترین گەلە و خاکەکەشی پیرۆزترین خاکە، بڕوانە قورئانی پیرۆز کاتێک باسی حەزرەتی نوح پێغەمبەردەکات درودی خوای لەسەربێت کەچی بە هەر هەموویانەوە دەیانەوێت لەناویبەرن، هەرچی خوداحەز نەکات بە کوردستانیان کردووە، هیچ دەستەیەکی ئاینی نەهاتۆتە گۆ هەزارەها جار بەدەستە پیسەکانیان کوردستانیان گڵاو کردووە، کوردستان دایکی هەموومرۆڤایەتیەو کانگای هەموو داهێنانەکانە بەقسەی خوای گەورە کە قورئانی پیرۆزە خیتامی هەمو دینەکانە و کوردستان لانکەی هەموو مرۆڤایەتییە، کەچی دەمانکەن بە دێو و درنج هەزاران ناووناتۆرەی ناشرین دەدەنە پاڵمان ئایە ئەمە خۆی لەخۆیدا پێچەوانەی وتە پیرۆزەکانی خوای گەورەنیە کە قورئانە بڕوانە لە قورئانە خوای گەورە چۆن

وەسفی خاکەکەمان و گەلەکەشی دەکات کە گەلی نوح ی پێغەمبەرە لەلایەکی ترەوە بە زاراوەی خۆیان لە قەڵەممان دەدەن دەی باشە ئیتر بۆ ئێمە لەنەوەی دێوو درنجین . ئێمەی کورد لە هەموو ڕوویەکەوە زۆر لەوان باشترین خۆ با ئەوەیشە بێژم هەموو پێشەوا کانی دینی ئیسلام کوردن و فارس و قەومەکانیترو زەردەشتین ، بۆ هەموو دونیاش دەرکەوتووە، خۆ ئەوەتا شوکور ئەمڕۆ گۆی زەوی لە سایەی تەکنۆلۆژیاوە بووەتە یەک ماڵ، لە زۆر کەناڵ و سەرچاوەدا دەبیستم و دەبینم، نەک جارێک، بە دەیان جار دەڵێن پێدەچێت کوردستان یەکەم لانکەی مرۆڤایەتی بووبێت لەسەر زەوی، هەر وەهایشە چونکو شوێنەوارەکان وتاتە قوڕینەکان دەیسەلمێنن و سلماندویشیانە ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموویت: هەموو پێغەبەرەکان لە نەوەی ئیبراهیمن، باسم کردووە ئیبراهیم پێغەمبەر لە کویێ لەدایک بووە، کەچی هێشتا ئەوان دەمانکەنە کافر و پیاوکوژ و دێو و درنج و گێل و نەفام، بەڕاستی هەرکەسە بە بچووک و نەفام و نەزان سەیری کورد بکات، گومانی ناویت هەر زۆر زۆر خۆی نەفامە، چونکە غەدر لە باپیرەی خۆی دەکات و حاشا لە قورئان و ئەوانی تریش دەکات، چونکە کتێبە ئاسمانییەکان ئاماژەیان بە پاکی و پیرۆزیی و دایکی نەتەوەکان داوە کە کوردستانە جارێ عەرەب و ئیسلام زۆر قەرزاری کوردن چونکو بەیارمەتی کورد بونە ئەو دەوڵەتە، سەرەڕای هەموو ئەمانە داگیری دەکەن و دەیانەوێت لە ناوی بەرن، ئەوان داگیرکەرن و هاتوونەتە سەر ماڵ و خاکی ئێمە، ئێمە ناوی خۆمان بە خۆمانەوەیە، گاور واتا گەورەکان، ئەی ئێوە چی بوون لەناو زۆنگاوەکان و بیا بانەکاندا دەژیان، ، ئەوە هەموو کەس

دەزانێت، ئاخر کافر کامەیە؟ کافر، یان گاور بە واتای گەورە دێت، بزانە خوێنەری بەڕێز، ئەوان هەر بە (زەردەشتی) دەڵێن کافر. خۆ یەکەمجار (زەردەشت) بوو کە خودای یەکتای بە مرۆڤایەتی ناساند، ئیتر بۆچی (زەردەشتی) کافر بوو، زەردەشت بوو عوودی دەژەند و ژەنیاریش بووە، دەنگیشی خۆش بووە و بە ئاوازەوە گاتاکانی خوێندووە، ئەم گوتەیەم زۆر دووپاتم کردووەتەوە، گاورەکان ئەگەر یەکێکیان بمردبایە لە دونیادا، چی هەبووایە لەگەڵیدا دەیاننێژا، چونکە دەیانگوت ماڵی خۆیەتی بۆ کەسێکی تر حەرامە، تەنانەت قیبتییەکانیش، یان فیرعەونییەکان هەمان دەستووری ئێمەیان هەبووە بەر لە (٤٠٠٠) ساڵ، ئەوەتا لە دراماکانداو لەمیدیاکاندا بە چاوی خۆتان دەیبینن ئەو هەموو خشڵ و هەموو شتە گرانبەهایانەیان بووەتە چ سەروەتێک بۆ نەتەوەکەیان لە ئەمڕۆدا، کە لەگۆڕەکان دەریان دێنن بەڵێ دەتوانم بڵێم هەمان دەستووری هۆرییەکانە، گەواهیت دەوێت بۆ ئەم گوتەیەم، ئەی بۆچی گۆڕەکانمان هەڵدەدایەوە، بڕوانە لەو سەردەمەدا کەس ماڵی کەسی نەخواردووە و هەرچییان هەبووایە دەیانخستە ناو گۆڕەکانیانەوە، دەیانگوت ماڵی خۆیانە پێویستیان پێی دەبێت، گەر باوەڕ ناکەیت، بڕوانە گاورتەپەی شێرەوەن چۆن هەڵدڕ هەڵدڕ کراوە بۆ شتە گرانبەهاکانی نێو گۆڕەکان، لەم سەردەمەدا کە ئیسلامەتییە و بەپێی شەرعی خۆیان دژی هەموو حەرامێکن، بەڵام بێینەوە سەر میللەتە شڕەخۆرەکەی بیابانەکان کە ئیماندارەکانی ئێمە کردوویانن بە فریشتە، دار و بەردی جیهانیان هەڵلوشی بە ناوی دەسکەوت و غەنیمە و غەزا و فتوحاتەوە، ئەمانە بیابان نشین بوون، واتا بەدوو، بەدووش ئەسڵی عەرەبە، ئەمانە خۆیان گەواهی لەسەر خۆیان دەدەن، چۆن

یەکیـان فەرهـود کـردووە، هەر خەریکـی غەزووی یەکتـری بـوون، تەنـانەت دەتـوانم بـڵێم هەرچـی مـاڵ و سـەروەت و ژنەکانیشیـانە تالانی ولاتـانن، بەتایبەت کورد، تا (پێغەمبەر، محەمەد (ﷺ) گـەیشـتە فریایان، ئەگینا ئەمان خاوەنی هیچ نەبوون، ئەوەتـا قـورئانی پیـرۆز دەفەرموویت: ئێمە بۆیە ئەم قورئانەمان بە عەرەبی دابەزاند، بۆئەوەی ئێـوەی عەرەب ئاقـڵ بـن. ئەوەش کـردەوەی ڕۆژانەیـانە و بە چـاوی خۆتان دەیانبینن، ماشەڵڵا چەندە ئاقڵن، کە چی پیاوە ئاینییەکانی کورد کردوویانن بە فریشتە، ئایە ئەمانە مەقام و میوزیکیان لە کوێ بـوو، کە ئێـستا بـوونە خـاوەنی هەمـوو کەلتـووری ئەم نـاوچەیە؟ لێـرەدا پرسیارێـک سـەرهەڵدەدات، بـۆ نمـوونە داود پێغەمـبەری یەهـودی بـاوکی سـولەیمان پێغەمـبەر، هەمـوو ئایەتەکـان و دووعـا و نوێـژ و نزاکانیـان بە میوزیکەوە خوێندووە، بە میوزیکی قیـسارەوە، لەکاتی زەردەشتیشدا هەروەها بووە، بڕوانە زەبـوورەکان و تەورات چۆن ئەم گوتانەم دەسەلمێنن، دابونەریتی کورد و کەلتووری کورد چەندە کۆنە و هەر لێرەوە چووە بەرەوخوار، بۆ کۆنی کورد بڕوانە، ئەم وێنەیە بـۆ خـۆی شـایەتحاڵە، هەم ناوەکەشـی کە گـاورە، واتـا گەورەکـان، نـاوچەکە و بیناسازییەکـەشی بەر لە هەزاران سـاڵ خـاوەنی چ هەندەسـە و بیناسازییـەک بـوون، بـڵێ کـامە مـیللەت لەمانەی دەورمان خاوەنی چی بوون، بەڵگەم زۆر هێناوەتـەوئەگەر بە جوانی بیخوێنیتەوە هەر لە سەرەوە، ئەوجا بۆت دەردەکەوێت هەمـوو شتێک هەر لێـرەوە چـووە بـۆ ولاتـانـی دەوروبەری.بەڕێـز خوێـنەری ئـازیز وا تێنەگـەیت مـن دەمەوێـت دینـی زەردەشـت بگەڕێنمەوە ئەمە زۆر ڕەوایە باسکردنی چونکە مێژووی گەلێکـەو دەبێـت باسـبکرێت بێگـومان شـتێک چـوو ناگەڕێـتەوە ئەگەر بیشگەڕێتـەوە مـن نایپەرستـم ئەوەبـاش بـزانن مـن لە گەڵ مـافی مرۆڤـدام حەزدەکەم هەمـو مرۆڤێک بگـاتە مافەڕەواکـانی خـۆی. جا

ئەم کەلتوورە بەدین وداب ونەریتەوەو هونەرو مۆزیکیشەوە گەیشتۆتە وڵاتانی دەوروبەرمان.



**وێنەی گاورتەپە لە ناوچەی بنگورە دێی شێرەوەن سەر بە شارۆچکەی قۆرەتوو، شاری خانەقین بەر لە هەزاران ساڵی پێش زایین.**

له ڕێی حەزرەتی ئیبراهیمەوە چووە بەرەوخوار، زمانی عەرەبی سێکوتی عیبریـیە، واتا یەهودیـیە، نووسینەکەشیان هەمان خەتی زەردەشتییە، زمانی عیبریش زۆربەی کوردییە، چ جای فارسی، لەچاو مێژوودا دوێنێ بوونە خاوەنی کیان و دەوڵەت، بڕوانە: تەورات ڕاستییەکەت بۆ دەردەکەوێت، بۆ نموونە کاتێک ئیسحاق، یان ئەسهاک دەیەوێت ژن بێنێت، باوکی کە پێغەمبەر ئیبراهیمە دەڵێت: بڕۆرەوە بۆ لای کەسوکارەکەت لە مێزۆپۆتامیا و لەسەر ئاوی فورات، واتا لای مام و خاڵەکانت لای ئەوان ژن بهێنە. ئەویش سەری خۆی هەڵدەگرێت و دێت کچی مامی مارە دەکات و لە پاشان دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتی خۆی، کە وڵاتی کەنعانە. یەعقوبیش کە کوڕی ئیسحاقە بەهەمان شێوە دوو خاڵۆزای خۆی دەخوازێت و دەگەڕێتەوە، لە پێشتردا بە درێژیی باسی یەعقوبم کردووە: پێش ئەوەی یەعقوب و بنەماڵەکەی بڕۆن بۆ میسر لە کەنعاندا و دەورو بەری دەژیان ئەوێیان بەموڵک و شوێنی خۆیان دەزانی کاتێک موسا لەمیسر بە خۆیو قەومەکەیەوە دەردەچن لەمیسر دەچێتە کێوی سینا و لە وێ یاسا و ڕێسا دادەنێت و سوپایەک دادەمەزرێنێت بۆئەوەی هێرش بکات بۆ سەر ناوچەی کەنعان کە ماوەیەک بوو بەدەستی ئەوانەوە نەمابوو خۆی هەر شوێنی فەڵەستانێکانە کە ئەمە وەسێتی یەعقوبی باپیرەگەورەیان بوە ئەوێ پیرۆزەو هەرلەوێ سەقامگیردەبن بەنی ئیسرائیل ، هەموو سەرکردەکانی سوپاکەی لە بنەماڵەی ئیسرائیلە، واتا یەعقوب پێغەمبەر، جا هێرشیان کردوو ئەوناوچانەیان کۆنترۆڵ کردەوەو هەرلەوێوە سەدو چل و چوار هەزار پێغەمەرسەری هەڵداوەو هەم وەکو پاشاو وەکو پێغەمبەر حکومڕانیان کردوەو هەموشیان لەبەنی ئیسرایل بون بە پێغەمبەری ئاخرزەمانیشەوە کە(محەمەدە ) درودی خودای لەسەر بێت)ئەگەر بڕوانیتە تەورات ڕاستی ئەم وتانەم

دەسەلمنێنێت هەتا زمانەکەیان زۆربەی کوردییە، بۆ نموونە کورد بە دەسکی دروێنە دەڵێن سواڵە، کۆی دەکەینەوە دەبێتە مەڵۆ، ئەوانیش هەر دەڵێن مەلو، یان بە نۆ، بەن، دەڵێن جوانەگا، یان بە ساورێن دەڵێن تەگە، ئێمەش هەر دەڵێین تەگە، بەتایبەت گەرمیان، چونکە نزیکبووین لێیانەوە، بۆ نموونە کوڕەکەی یەعقوب ناوی لاڤیە، واتا لاوی، یان گەنجۆ، چونکە ئیبراهیم خەڵکی ڕووهایە، زمانیان کرمانجی ژووروە ، واتا گۆکردنیان هەمان گۆکردنی زمانی کوردییە بە هەردوو شێوەزارە کوردییەکەوە؛ سۆرانی و بادینانی، یان زازایی. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: تەورات، کتێبی پیرۆزی موسا). لە سەردەمی موساشدا باسی کەڕەنا دەکات، جەژنی میوزیکیان هەبووە، باسی قیسارە دەکات، کە لەپێشتردا باسی قیسارەم کردووە بە باشی و باسی دەف و زۆر شتی تریش، تا ئێستاش باوە لە کوردەواریدا. لەو سەردەمەدا موسای پێغەمبەر درودی خوای لەسەربێت سوپایەکی پێکەوە ناوە هیچی لە نیزامی ئەمڕۆ کەمتر نەبووە، بێجگە لە هێزی پاسەوانی چادرگەکان و پاسەوانی پەرستگاکان، خۆی داوە لە (٧٠٠) هەزار کەس، هەمووی گەنج بووە لە بیست ساڵ تەمەن بەرەوسەر، خۆ ئەمانیش هەر لە گەلی کورد جیابونەتەوە دەیەها هۆزو تیرەو نەتەوەو پاشاشی لێ جیابووتەوە کورد هەریەکەو بەناوێکەوە دەتوانم بڵێم کورد خاوەنی ئەم هەموو هێز و توانا و داهێنانە بووە وهەر یەکەو خاوەنی بیرو باوەڕێک بوون و دەسەڵاتیان بەسەرهەر ناوچەیەکدا ڕۆیشتوە و وڵات وکیانی خۆی لێ دامەزراندەوە لەژێر ناوی تازەو جیاجیادا لەخوارەوە بەدرێژی باسی ئەو دەوڵەتانەم کردووە بەناوی جیاجیاوە کەلە کورد جیابونەتەوە کە خاوەنی دین و دیانەت و یاسا و دابونەریت بونە لە دەریای ناوەڕاستەوە هەتا دەریای خوێ، یان دەریای مردوو حوکمی

کــــردووە، هەمــــووی لەژێــــر دەســــەڵاتی کــــورددا بــــووە،یەکەم ئیمبراتۆریشـیان نەمرود پاشـا بووە کە چی ئێسـتا هــەر خۆمـان بچووکی دەکەینەوە، بێگـومان ئەم ناوچـەیـەش وڵاتـی کوردەواری بـووە، ئــەوە پێویسـت بە بەڵگــە ناکات، بەڵگــەش زۆرە بۆ مـاوەی چەنــد ســەدەیەک ئەم بنەمـــاڵەیە حــوکمڕانی کەنعــان و میســـر و فەڵەستینــیان کــردووە تاکــو لە ســەردەمی حەزرەتــی موســـادا فیرعەونێــکی تــر هــاتووەتە ســەر دەســەڵات و عیبرانیــیەکانی چەوساندووەتەوە، ئەوانیش شۆڕشیان لە دژی فیـرعەون ڕەمسیس کــردووە و لە پاشــان شکستــیان هێــناوە و دەری کــردوون، ئەو ڕاستییـــــەش ناشاریـــــنەوە موســـــای پێـــــغەمبەر لە نەتەوەی عیبرانییەکــانە و عیبرانییەکانیــش بــۆ مــاوەیەکی دوورودرێــژ فەرمانڕەوای میسر بوون و فیـرعەونی تازە ویستوویەتی بنبڕیان بکات لە میسردا، بەپێی مێژوویش بێت موسا لە ماڵی فیـرعەوندا گەورە بووە و شارەزا بووە لە سیاسەتدا، شەڕی موسا و فیـرعەون زیاتر سیاسی بووە هەتاوەکو ئایینـی چونکـە بۆماوەیـەکی زۆر بەنـی ئیسرایـل حوکمی میسـریان کردووە و لەپاشـان گوبتیـەکـان سەیتــەرەیان کــردۆتەوەو ویســتویەتی لەناویــان بەرێـت جـا بــۆیە موســـای پێغەمبەردەســتیداوەتە شۆڕشێــکی کــودەتایی بــووە بە سەرۆکایــەتی موســای پێغەمــبەر، گەلەکانیــش لە بەرژەوەنــدیی خۆیـان یاریـیان بە مێژووەکە کردووە بەپێـی ویست و ئارەزووی خۆیان چۆنیـان بۆ گونجابێت، ئەو سـەردەمەی موسـای پێغەمبەر سـڵاوی خـودای لێبێـت، ئەوەتـا دەوڵــەتی ئیسـرائیـل لە نەتەوەی ئیبراهیم پێغەمبەرە و نەتەوەی کوردن، بەپـێی گوتەکـانی زەبوور و تەورات و ئنجیـل و قورئانیـش لێکـیان دەیتەوە، وایە، بەڵام کەس ناوێرێت پێ لە ڕاستییەکـان بنێـت، کەچی بە هەر هەموویان زوڵـم لە نەتەوەی باپیرەگــــەورەیان دەکەن و خۆشــمان هێشـــتا زیاتــر

وەسفی ئەوان دەکەین، ئەوەندە وەسف و پیاهەڵدان بە ئەواندا دەکەین، نیو هێندەی ئەوان بە هیچ شێوەیەک باسی خۆمان ناکەین، یان نەک هەر نایکەین، بەڵکو گۆڕی مردووەکانی باو و باپیرانمان دەردەهێنین و دڵمان نائێشێت، چونکە وا تێیان گەیاندووین ئەمانە گاورن، واتا کافرن، زۆری تریان پێوە لکاندووە، هەر لەم ڕووەوە بوو هەموو کەلتووری خۆمان لەناوبرد بە دەستی خۆمان، گوایە ئەمە شوێنەواری گاورە، بێئەوەی دڵمان بۆی بەئازاربێت، داخی گرانم بۆ مرۆڤی کورد خۆی لە خۆیدا ئەمەش گەواهییەکی ڕاستین بۆ ئێستا کە ئەم وڵاتە چەندە دەوڵەمەند بووە، ئێستاش هەموو گۆڕەکانی کوردستان پڕن لە بەڵگەی مێژوویی و زێڕوزیوی گرانبەها، بێجگە لە ژێر خاکەکەی، ئەمڕۆ دەرکەوتووە چی لەژێردایە، ئەگەر دڵسۆز هەبێت بەجوانیی بگەڕێت، سەدان شوێنەواری قەڵاو شار دەدۆزێتەوە، بێگومانم هەزارەها کەلوپەلی مێژوویی بەنرخی تێدایە و دەبێتە مایەی شانازیی بۆ گەلەکەمان، بە هەموو جۆرەکانییەوە، بۆ نموونە وەکو ئاشەکان، یان ئاسیاوەکان و کورەکان کە لە هەموو ڕوویەکەوە داهێنان و دروستکراویان هەبووە لە ڕێی فکرییەوە، بۆ نموونە دەتوانم بڵێم کارەبا لەسەر فیکری ئێمە داهاتووە، بڕوانە ئاشی ئاو، یان ئاسیاو بە ئاو دەسووڕێتەوە، دوو بەردی گەورەیان بەیەکەوە بەستووە و بە ئاو سوڕاندوویانەتەوە و گەنمەکەی هاڕیوە، خۆ ئێستاش کارەبا هەروەها بەبەرهەم دێت، ئەمانە بەڵگەی زیندوون بۆ هۆشیاریی ئەم وڵاتە. بڕوانە لە خوارەوە سینۆهە چیدەڵێت دیارە وڵاتی ئێمە لەو کاتەدا لە فیرعەونەکان پێشکەوتووتربووە بەگوێرەی وتەکانی دکتۆر سینۆهەی گوبتی سینۆهە، دکتۆری فیرعەون دەڵێت کە بە دکتۆریی هاتووم بۆ دەوروبەری سوریا وتکریت بەرەوژوور پەلەوەرێکم بینیوە شتێکی خڕی کردووە، بە

یانیان بە نانەوە خواردوویانە، مەبەستی لە مریشک بووە، کە لەلای ئەوان نەبووە، لەبری هەقدەست پێیان داوە، ئەوجا لەلای ئەوان زیو و مس و جۆرەها شتی تر هەبووە، دەڵێ بەڵام لە سوریادا ئاسنیان پێدام، زۆر بەلایەوە جێی سەرسوڕمان بووە، لەو کاتەدا قیبتییەکان چەندە پێشکەوتوو بوون، هێشتا کوردستان لەپێش بووە لە هەموو ڕوویەکەوە، تەنها پێشکەوتنێک بووبێتە هۆی بەناوبانگیی میسرییەکان، هەڕەمەکانە، هەڕەمەکانیان بۆ مایەوە بووە هۆی شورەت و ناوبانگیان، هەزارەها کۆشک و تەلار و شتی سەرسوڕهێنەر لە کوردستاندا هەبووە لەوانە پێشکەوتووتر، بەڵام زلهێزە داگیرکەرەکان لە ڕیشەوە دەریان هێناون، هەرچی زلهێزی دونیایە ئەسپی خۆیان لێرە تاوداوە و بە ویستی خۆیان کاریان کردووە، ئێستاشی لەگەڵدابێت، بێگومان لەم وڵاتەدا هەموو کانزاکانیان دۆزیوەتەوە و دەریانهێناون زۆربەیان، ئەمە هۆشیاریی وڵاتی هۆرییەکان، یان ئۆرک دەردەخات لەو کاتەدا کورەی ئاسنیان هەبووە، کە لە میسردا نەبووە، بە گوتەی سینۆهە پزیشکی فیرعەون زۆر ئاژەڵ و پەلەوەر لێرە هەبووە و لەوێ نەبووە لەپێشتر باسم کردووە. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی سینۆهە، پزیشکی فیرعەون).

هەموو شتێک لێرەوە وەکو بازرگانی ڕۆیشتووە بۆ ئەوێ و ئێستا دەیانەوێت بمانسڕنەوە و شوێنەوارمان نەمێنێت، ئەم تێکدانی کولتوور و شوێنەوار و دژایەتیکردنەمان و ئەم هەموو سەروەت و سامانانەمان گەواهیدەری دەوڵەمەندیی ئەم وڵاتەی ئێمەن لە هەموو ڕوویەکەوە، چونکە ئەم وڵاتە خۆشگوزەران بووە، دەوڵەمەند بووە لە ڕووی: ئایینی و پیشەسازیی و میوزیک، ئەدەب، سەربازیی، کشتوکاڵ و جوگرافیاشەوە بووە بە جێی سەرنجی دەوروبەرەکەی، بۆیە هەمیشە لەژێر هەڕەشەی دوژمناندا بووە و

هێرشیان بۆ هێناوه و داگیریان کردووه، کە زۆر کەوتە دەستیان هەموو شتێکیان گۆڕی لە بەرژەوەندیی خۆیان، هەتا ساڵی حەفتاکان شوێنەواری زەردەشتی یان مەگۆسەکان واتا گازاکان لە بنکورەدا زۆر مابوو، وەکو کێلی گۆڕ و منارە و گومەز و زۆر شتی تر، لە تەنیشت تەپەی ئیمام حەمە گۆڕساتنێک هەیە وابزانم هەربە گۆڕستانی گاورەکان ناسراوە هەر هەموویان بە خشتی گاوری دروستکرابوون، خشتەکە بە کورەی ئاگر برژابوون، پەنجا سانتیمەتر چوارگۆشە دەبوو بە مەرجێ بەرگەی هەزارەها ساڵی گرتووە، دەیەها سەدە لەپێش زایینندا تا بە ئەمڕۆ هەر ماوە لە ناوچەی بنکورەدا، دیارە هەموو خشتی قەڵای شێروانە و دەوروبەری لەوێوە هێنراوە لەشوێن هەوارەکان دەریان هێناون ئەگینا وەکو قەڵای شێروانە ئەمەی ئێستا هەیە تازەیە ، هەموو خشتەکانی قەڵای شێروانە خشتی گاورییە، هەتا شاری شێرەوەن یان گاورتەپە لەو خشتە دروستکراوە لەپێش دەیەها سەدە ئێستاش هەروەک خۆی ماوەو دیارە بەڵێ کورد خاوەنی یاسا و ڕێسایەکی پتەو بووە لە ڕووی سیاسی و ئابووری و ئاینیشەوە دەتوانم بڵێم جارێ دەستوور و دین و دینداریی و خوداپەرستی لە وڵاتی هۆرییەکانەوە وەرگیراوە، لە ڕێگای بازرگانەکانیانەوە، بەتایبەت ناوچەی کەنداو، واتا جەزیرەی عەرەبی، دیارە هەرچی ئەمڕۆ هەیە لەو سەردەمە بە زیادەوە بووە، لە کوردستاندا، یان لە وڵاتی ئۆرکدا، واتا هۆرییەکان، چ سیاسی و چ ئاینی لەو سەردەمەدا ڕێز لە هەموو یاسایەک گیراوە، وەک ئەمڕۆ بێ سەرەو بەرەیی نەبووە، ئەوان خاوەنی یاسا بوون، خاوەن ڕەوشتی بەرز بوون، زۆر بەزەبر و توندوتۆڵ بوون، بۆیە هەمیشە لە پێشکەوتندا بوون، هەموو چین و توێژەکانیان بە یاسا ڕێکخستووە، ڕۆژانە لە پێشبڕکێدا بوون، لەو سەردەمەدا

خاوەنی پیشەسازیی بەتوانا بوون، خاوەنی هێزی سەربازیی هێزی پیادەو هێزی دەریای خاوەنی سەدەها کەشتی گەورەی دەریایی بەتوانا بوونە، لە هەموو ڕوویەکەوە بە یاسای بەرز بەڕێوەچووە، بەتایبەت یاسای میوزیک، بۆچی هێندە پێشکەوتوو بووە لەو سەردەمەدا، چونکە زیکری پێکراوە لە پەرستگاکانی ئاینی زەردەشتیدا، ئەم مەقامانە بوونەتە وێردی سەر زمانی هەموو زەردەشتییەک، هەموڕۆژێک پێش برکێ بوە کێ ئاوازی تازەو خۆشترو غەریبی داهێنابێت خەڵات کراوە ئەم بەرنامەیە بەردەوام بووە تا گەیشتووەتە ساسانییەکان و سەردەمی ئیسلامیش هەر بەردەوام بووە، یەکسەر نەیانتوانیوە کۆتایی پێ بهێنن، وڵاتێکی وا گەورە و گران چۆن لە ماوەیەکی کەمدا دەتوانێت کۆتایی بە هەموو کەلتووری بهێنێت، ئەوە مەلاکان بوون وردە وردە کنەیان کرد لە سڕینەوەی دابونەریتی گەلەکەیان، تا گەیشتە ئەمڕۆ. بەداخەوە بە بۆچوونی من فارس زیاتر لە هاتنی ئیسلام سودیان وەرگرتووە و بەهێزبوون، چونکە لەو کاتەی لەشکری ئیسلام هاتوون هێرشیان هێناوە بۆ سەر ڕۆژهەڵات، دەسەڵات بەدەست ئەردەشێری ساسانییەوە، یان یەزدان گورد بووە، ئەوە مێژوو سەلماندوویەتی. من خۆم لە کۆتایی ساڵانی حەفتاکاندا زۆر شوێنەواری زەردەشتیم دەبینی،

بەتایبەت لە ناوچەی بنکورەدا ، لە تەنیشت تەپەی ئیمام حەمە ئێستاش شوێنەواریان هەرماوە لەسەرەوش ئاماژەم پێکردووە هەرچۆنێک زۆریان بردوو زۆریشیان ڕووخاندووە وەکو کێلی گۆڕ و کەرەستەی بیناسازیی و قاپ و قاچاخی ناوماڵ، بەداخەوە کێلی گۆڕ هەبوو چوار پێنج گەز دەبوو بە نووسراوەوە، بەڵام داخەکەم بەناوی گاورەوە گوایە کافرن گاوریش باوباپیری خۆمانن و هەمووی لەناوچوو. بێینەوە سەر مۆزیک لەو سەردەمەدا

میوزیـک بەشێـکی سـەرەکی بـووە لە کاروبـاری ڕۆژانەدا، بـۆیە پەرەی سەندووە و چەندەها میوزیک و ئاوازیان داناوە، تا ئەمڕۆش هەر مـاون و نەمـردوون و ناشـمرن، ئەگـەر دەتەوێـت زیاتـر لەو بارەیەوە بزانیت، (بڕوانە: مێژووی دەوڵەتی ساسانی)، دۆزراوەکانی ئەمڕۆ و شوێنەوارەکـان گـەواهی دەدەن کە کوردستان هەمـووی شوێنـەوارە، شـایانی باسـە ئەشکـەوتی شـانەدەر و ئەشـکەوتی هەزارمێرد لە زۆر سەرچاوەدا هاتوون، بەتایبەت لە مەسحەفەڕەشی ئێزدییەکانـداو دەیەهاسـەرچاوەی تـر هـاتووە، دەڵێت: هەزارمێـرد جێگـای سـەردەمی ئـادەم و حەوایە، هەتـا بـوونەتە هەزار کەس، یـان هەزارمێرد، واتا پیاو هەر لەو ئەشکەوتەدا بوون، یان لەو دەروبەرەدا ژیـاون. ئەشـکەوتی جاسـەنە و قزقاپـان ئەم وشـیە تەتـریکە)بەڵام شوێنەکـە زۆر کـۆنە لە چەمـی ڕێـزان و دەیەهـا ئەشـکەوت و شوێنـەواری قەڵا و گـرد و تـەپۆڵکـە و کـورە و شوێنەوارەکـانی نـەمـروود پـاشا، بەتـایبەت لە دەشـتی خانەقیـن، زەهـاودا و لە کرماشـان، سنە و مەریـوان و دەتـوانم بـڵێم لە تـەواوی گـەرمیانی باشـووری کوردسـتان و ڕۆژهەڵاتـدا، سـەدەها شوێنـەواری کـۆنی بەنرخـی هەزارەهـا سـاڵە هەیە و حکومـەتەکـانی تـورک و فـارس و عەرەب پشـتگوێـیان خسـتوون و هەمـوو لەناوچـوون، لەبەرئەوەی شوێنـەواری کـوردە سـەدەها شوێنـەواری تـر تـا ئێسـتاش مـاون داخـەکەم پشتگوێخـراون وە چەنـدەها دروستکـراوی تـر لە باشـووری کوردسـتان، هەروەهـا شوێنـەواری حەوشکـوڕی لە نـاوچەی خانەقـین، ئەم قەڵایە کۆشکێکـە لەکۆشکەکـانی سـەردەمی کەیخـەسرەو شایە، باوکی ئەستیاکە، دواین ئیمپراتـۆری مادەکان بـووە، بەداخەوە ئەم شوێنـە مێژوویـیە کـاری بـۆ نەکـراوە بەتەواوەتی لەناوچووە، خەڵکی بەردەکەی دەبەن و پێویستـیەکانی خۆیانی پێدابین دەکەن مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (٦١٠) ساڵ پ.ز

لەسەر ڕێگای ئاورێشمە حەوش کووڕی، بە زمانی کەڵهوڕی واتا کۆڕێ، یانی چوار ڕێیان، (بڕوانە: مێژووی ماد، ئەلیکساندەر میخایلۆوچ). قەڵای زووحاک، یان ئەستیاک لە شارەزوورە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی مادەکان، ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی کەشتییەکەی نوح، کە لەسەر کێوی جودی، یان ڕاستتربڵێین کێوی گوودی، واتا کێوە باشەکە، یا جێگای باشان، کە دەکەوێتە باکووری کوردستان، شاری بۆتان، یان شەڕناخ، نوحی پێغەمبەر بیری کردەوە چۆن لەو ئاوەی هەڵساوە، یان هەڵدەستێت خۆیان ڕزگار بکەن، بیری کردووەتەوە کەشتییەک دروست بکات، چۆن دروستی کرد، پێغەمبەر نوح کەشتییەکی وەکو قەڵا لە دۆڵێکدا دروستکرد، کە لە سەردەمی بە فر و بەستەڵەکدا ژیاوە، ئەوکاتە هەموو ناوچەکان وەکو حەوز وابوون، بۆ نموونە بڕوانە حەوزی کەلار، یان حەوزی قەڵاچوالان، یان شارەزوور، یان حەوزی حەمرین، هەمووشیان یەک دەرگایان هەیە، ئەویش سیروانە، بێگومان لای خۆرئاوایشەوە دەرگای سەرەکی ئاوڕێژی یان ئاوەڕۆی کوردستان، مەبەستم دەرگای ئاوەڕۆیە لەوێشەوە دیجلەو فوراتە، واتا (فرەهات)، بۆیە هەموو ئاوی ئەم ناوچانە لە کۆتاییدا یەکدەگرنەوە و دەبن بە یەک دەرگا، دەرگای تریان نەبووە،جگە لەو ئاوانەی کەدەڕژێنە دەریای سپی ناوەڕاستەوە بێگومان پلەی گەرماش لە بەرزبوونەوەدا بووە، ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ئاو زیادی کردووە و بەرزبووەتەوە، بۆیە نوح ی پێغەمبەریش درودی خودای لەسەربێت خەڵکی ئاگادار کردووەتەوە و بیری کردووەتەوە کە کەشتییەک دروست بکات بۆ ماوەیەک هەتا ئاوەکە سەرڕێژ دەکات و ڕێڕەوێک دەکاتەوە و ڕزگاریان دەبێت لە خنکان و تیاچوون، بێگومان دەیەها خەڵکی لەگەڵدابووە لەبیرو بۆچوونی ودروسکردنی کەشتیەکەدا بەڵام زۆریان بە قسەیان

نەکردووە، بۆ بەڵگە ئەگەر بڕوانیتە دەشتودەر و شاخەکان، ئەو ڕاستییەت پێدەڵێن، هەمووی وەکو حەوز وایە، هەموویشی لە یەک ئاستدا شکاوە، کەواتا بڕوانە لە ئاستی کوردستانی گەورەدا هەموو ڕووبارەکان بەرەوخوارن، دیارە کوردستان لە ئاستی ناوچەی ڕۆژهەڵاتدا بەرزترین شوێنە، بۆیە یەکەمجار ئێرە دەرکەوتووە و بووەتە جێی ژیان، دەتوانم بڵێم ئەو ئاوە زۆرەی شکاوە و بەرەوخوار چووە ژیانی لە هیچ کوێ نەهێشتووە، هەتا گۆڕانکاریشی بەسەر گۆی زەویشدا هێناوە، بەڵگەیەکی تر بڕوانە مەبەستم، هەموو ئاوی دونیا بەرەوخوار دەڕوات، دەریاکان و ئۆقیانوسەکان هەموویان دەکەونە خوارووی کوردستانەوە،ئەتوانم بڵێم هەر لەو ڕۆژەوە زەوی سەقامگیربووە لە ڕوی ژیانەوە خۆریش دەرکەوتوەو تێنی سەندوەو ژیانی بەخشیوە بەمرۆڤەکان بەڵگەیەکی زۆر جوان زانای بەناوبانگی فەڕەنسی (قوبتان کستۆی فەڕەنسی) لە هەشتاکاندا شارێکی لەبن دەریاکاندا دۆزییەوە، شارەکەش زۆر پێشکەوتوو بوو، کەواتە ئەوکاتە ئەوێ ژیانی تیادا بووە، واتا بەپێی جیۆلۆجی ئەمرۆ دەری دەخات دەریاچە سروشتییەکانی ئەو سەردەمە سارێژیان کردووە و ژیانی سروشتی دارشتووەتەوە لە نوێ دەستی پێکردووەتەوە،ئیتر نیزامی ئەم ئەستێرەیە لەو ڕۆژەوە سەقامگیربووە ئەوەش بەپێی شوێن هەوارەکان دەریخستووە و مێژووش لە زۆر سەرچاوەدا باسی دەکات، هەروەک چۆن باسی نوح پێغەمبەر دەکات، کە کەشتییەکەی لەسەر کێوی گود گیرساوەتەوە و گوتوویەتی: شوکر بۆ تۆ خودایە، ئێرە جێگایەکی باشە، واتا گود، بۆیە یەکەم بنەچەی کورد لە پاش نوح ی پێغەمبەرەوە، یان جەمشید لە گودییەکانەوە دەستی پێکردووەتەوە و بووە بە گود، یان گورد، یان گوردی، لە پاشان لەسەر ناوی کورد جێگیر بوو، کە ئێستا خاکەکەی

کوردستانە و گەلەکەشی کوردە. وەلەپاشان سەدەها تیرەو هۆزو و شارو پاشاو دەوڵەتیان لێ جیابۆتەوەو بەناوی جیاجیاوە



**نەمروود پاشا و هاوسەر و کوڕەکەی**

بێگومان گەلێک هێندە دێرین بێت، دەبێت خاوەنی داهێنان و مامۆستای ژیان بێت، بۆیە دەڵێم ئەم وڵاتە یەکەم جێگا بووە بۆ ژیان، چونکە یەکەمجارلافاو لێراوە هەستاوەو کەش و هەوا تێک چوەو هەر لێرەشەوە سەقامگیربۆتەوە بەهۆی کێوە بەرزەکانەوە مرۆڤەکان خۆیان پاراستوەو نەجاتیان بووە یەکێ لەو کێوانەش کێوی گودی بووە کە ناوی دیارە لەمێژوودا هاتووە جا ئەوتەوژمە بەهێزەی ئاوبەرەو خواربۆتەوە هەرچی بیابان و زۆنگاوەکان بووە ژیانی تیا نەهێشتووە خۆ کێوی زۆربەرزیش هەیە لە ئەوروپادا مەرج نیە هەموکێوەکان یەک ئاست بن و هەمویان لە یەک ساتدا کەوتبنە ژێرئاوەوە چونکە ئاوەکە سروشتی بەرزبۆتەوە بەهۆی پڕبونی دۆڵ و دەریاچەکانەوە بووە چونکە ئێستا دەرکەوتووە پشکنین دەکەن ئێسکی مرۆڤ دەدۆزنەوە زۆر لەپێش زاییندایە مانای وایە لەوێش ژیان هەبووە بەپێی مێژوو و دۆزراوەکان لێرەش کێوی گودی دەرکەوتووە، دیارە

لە هەمــوو جێگــایەک بەرزتــر بــووە، بــۆیە کەشتێــکەش لەوێ گیرساوەتــەوە ، واتــا کێــوی گــودی، واتــا گــوتیــیــەکان، بە واتــای باشــەکان، یــان شوێــنە باشــەکە، گــود، ئەم نــاوە تــازەیەش هەر لەم بەســەرهات و ڕووداوەوە هاتــوە ئەگێــنا هەمــان نەتــەوەو گــەلن کە ئەوانیش هەر هەمـان نەتەوەو زمـانن کە لەپـاش لافـاوەکەوە بەکودی ناسران، ئەگەر بڕوانیتە قورئانی پیرۆز، ئاماژە بەو مێژووە دەکات کە کوردســتان لەو ســەردەمەوە ئــاوەدانەو، کە واتــا لەو ســەردەمەوە خوداپەرستی و ڕۆشنبیری لێ نەبڕاوە هەرچۆنێک بێت لەسەروە باســـم کـــردووە چیـــان پەرســـتووە لەو ڕۆژەدا چونکـــە مێـــژوو سەلماندویوتی لەسەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیم وە خۆریان پەرستووە ولەزەڕدەشتەوە خودای یەکتایان دۆزیوەتەوە ، دیارە ئەم وڵاتە هەر لە پێشکەوتندا بووە و گەشەی کردووە و لە هەموو ڕوویەکەوە لە ڕۆشنبیری، هونەر، کشتوکاڵ، پیشەسازی، ئاژەڵداری و هتــد........، بەپێــی ئــایەتەکە لەو ســەردەمەدا ســەر زەوی سڕاوتەوە ، یــان لە ئاسیادا کەسی تیادا نەماوە، جگە لە کەشتییەکەی نوح پێغەمبەر و ئەو خەڵکەی لەگەڵیدا بــوون، کەواتە ئەم نــاوچەیە ســەرچاوەی هەمــوو پێویستیەکانی ژیان بووە وەکو قورئانی پیرۆزیش دەفەرموێت: لە پاش لافاوەکەی نوح هەموو پێغەمبەرەکان و مرۆڤایەتی هەمووی لە نەوەی نــوحن و منــداڵەکانی ئەون. ئەوە مێــژوو سەلمانــدوویەتی نوح لە کوردستاندا بووە و کوردیشە. بێگــومان نــوح و هاوەڵەکانی هەڵگری کەلتووری پێش خۆشیانــن، مەبەستم پێــش لافاوەکەیە، تۆ بڕوانە لەو سەردەمەدا گەلەکەی نوح هۆشیاریــیان چەند بەرز بووە، چەند بەلێهاتوویی ئەو کەشتییەی دروستکردووە، تۆ بیر بکەرەوە ئەو چەک و چۆڵانــە و کەرەســتانە چی بوون کەشتییەکــەیان پێ دروستکــردووە، کەوابێــت لەپێــش لافــاوەکەدا کــورد خــاوەنی شارستانییەتێکی گەورە بووە بە هەموو داهێنانێکەوە، بۆ نموونە

لە کتێبی (مێژووی مرۆڤ)دا ئەوەی سەلماندووە هەسارەی زەوی لە پێش (٥,١٣) ملیار ساڵەوە دەستی پێکردووە و لە پێش (٧٠,٠٠٠) ساڵەوە زیندەوەرەکانی توخمی مرۆڤە هۆشمەندەکان هۆمۆ ساپینس بەرە بەرە زیادبوون و بە بونیادی چڕوپڕتر، کە پێی دەوترا کولتوور، بەرەوپێشچوونی یەک لەدوای یەکی ئەم کەلتوورە مرۆییانە پێی دەگوترێت مێژوو، هەست و هۆشی مرۆڤ پەرەی سەند و شۆڕشی کشتوکاڵی قۆناغێکی نوێی بە خۆیەوە بینی ، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ژیان دەگۆڕا و دەچووە پێشەوە، هەتا گەیشتە ئەمڕۆ، دەتوانم بڵێم ئێمەی کورد لەو مرۆڤە کۆنانەین و خاوەنی کەلتوورێکی زۆر کۆنین، هەر بەپێی مێژوو و شوێنەوارەکان و کتێبە ئاسمانییەکان ئەوە سەلمێنراوە کوردستان کۆنترین شوێنی مرۆڤایەتییە، ئەم گەلانەی چواردەورمان هەرچی مێژوو و شوێنەوار و شارستانییەتی پێش خۆیان بووە، هەموویان تەفروتوونا کردووە بۆ سەرگرتنی مەرامەکانی خۆیان، بەتایبەت لە سەردەمە جیاوازەکاندا، بۆ نموونە هەرچی زلهێزێک هاتووەتە ئەم وڵاتە، دەوڵەمەند بووە، تالانی کردووە و کەلتوورەکەشی سڕیوەتەوە و قەڵاکانیشی خاپوور کردووە، وەک نموونە یەکێک لەوانە پاشای ئاشوورییەکان تیگلاتەسەری یەکەم، ئەم پاشایە هەم خوداشیان بووە، هەموو وڵاتی هۆریەکانی وێران کرد، یەکێک لەو شارانە ئارمان بووە، لە تەنیشتی شاری کفری، ئێستا بووە هەروەها دووەم شاری لوبدو لە شوێنی شاری کەلاری ئێستا، واتا قەڵای شێروانە، شاری سیروان بووە، کە خاوەنی قەڵایەکی گەورە بووە وەکو قەڵای هەولێری پایتەختی ئێستای کوردستان و دەیەها شاری گەورەی کوردستان، بڕوانە بارا خاکی ( زاموا واتا سلسلەی زاگرۆس)ناوی یەکەمی شاری سلێمانییە، ئاشوور ناسر پانیباڵ وێرانی کرد، شوێنی سلێمانی ئێستایە، لەبەر گرنگیی

ئاووهەواکەی و جوگرافیاکەی کە پڕ پیت و بەرەکەت بووە، هەمیشە جێگای سەرنجی داگیرکەران بووە و گرنگترین شاری خاکی زاموا بووە لەو سەردەمەدا، پێموابێت تاکە وڵات بووە دەوڵەمەند و بە ڕەنجی شان نانی پەیداکردبێت، کورد بووە، ماوەیە گەلەکانی تر هەر خەریکی کوشتن و تالان و کاولکاریی بوون، زۆرجار کوردستان خاپوور کراوە، دووبارە هەلیان دەستکەوتووەتەوە و شار و قەڵاکانیان بنیاتناوەتەوە. ناوی ڕووباری سیروان ئەوکاتە ناوی ڕادانوو بووە، ئێستا شوێنەوارەکانیان دەدۆزنەوە، ئەوکاتانە هەر قەڵاکان شار بوون، کە لە زۆر سەرچاوەدا هاتووە، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی ئاکۆ میرزادەیی، مێژووی دێرینی کورد، ل٢٥٨)، لەپێشتردا ئاماژەم پێ کردووە، کەواتە هەموو داهێنانێکی بنەڕەتی لەو سەردەمەدا لێراووە گەیشتووەتە دەوروبەری ناوچەکە، ئەگەر شتێکیشمان لەناوچووە، ئەوە بەهۆی شەڕوشۆڕی داگیرکەران و وەحشیگەرییەکانەوە بووە کەلتووریان لەناوبردووین، بۆ ئەم باسەش بەڵگە هەیە کوردستان چەندە دێرینەو بەڵگەی زۆرتریش هەیە، کە لە ساڵی (١٩٨٣) تیمێکی ئەمریکی هاتن لەسەر کێوی جوودی لە باکووری کوردستان، واتا لە شەڕناخ، واتا شاری نوێ، ئەو شارەی نوح، چەند پارچەیەکی کەشتییەکەیان دۆزییەوە، دیارە ئەم ناوچەیە پێغەمبەر، یان پیاوی زانای لێ نەبڕاوە، یان پیاوی هۆشمەندی هەر هەبووە، چونکە کورد لە پێشتریشدا هەر بوونیان هەبووە، جا بە هەر ناوێکەوە بووبێت، تۆ بڕوانە نوح پێغەمبەر چۆن بیری کردووەتەوە و هەستی بە مەترسی کردووە و هەستاوە بە دروستکردنی کەشتییەکە، بێگومان ئەم کارەساتە لە سەردەمی بەرزبوونەوەی پلەی گەرمادا بووە، پلەی گەرما بەرزبووەتەوە و ئاو زیادی کردووە و هەموو دۆڵ و دەریاچەکان پڕبوون، ئەوە دەیسەلمێنێت ئەم

نـــاوچەیە هەر بەرەوپێشچـــوون و هەر لە گەشـــەکردندا بـــوون، بێگـومان خـاوەنی هەزارەهـا داهێـنان بـوون، پێشکەوتـنی باشیان بەخۆیانەوە بینیوە، کەواتە ئەم ناوچەیە خاوەنی پێگەیەکی سیاسـی و ئاینی و ئابووری بەهێز و سەربەخۆ بووە، هەر لێرەشەوە بەرەو وڵاتانی دەوروبەر گەشەی کردووە و ڕۆیشتووە، بۆ سـەلماندنی ئەم گوتەیەم، بڕوانە زمـان و جلوبەرگی وڵاتـانی چواردەورمـان، گومـانی نیـیە زانسـت تەشـەنە دەکـات و وڵاتـی گەورەش وڵاتـی لـێ جـیا دەبێتەوە، بۆ نمـوونە بڕوانە وڵاتـانی دەوروبەری چین، یـان وڵاتـانی دەوروبەری هینـــد و ئەفریـــقا و ئەوروپـــا، ئەوان زمانیـــان و شێوەشیان لە یەکترەوە نزیکن، دابونەریت و میوزیکیشیان هەر لە یەکەوە نزیکن، وڵاتانی دەوروبەری ئێمـەش بە ئاشکرا دیـارە جل وبەرگ و داب ونەریتـــیان و زمـــان و میوزیکیشـــیان بـــۆ خـــۆتان بڕوانن، خۆ مێژووش سەلماندوویەتی ئێمە کۆنترین میللەتـی ئەم ناوچەیەین، بۆیە دەتوانم بەو پـەڕی شانازییەوە بڵێـم میوزیـک و مقاماتی ئەم ناوچەیە خاوەنەکەی گەلی کوردە، بڕوانە زمـانی فارسـی لە سـەدا حەفـتای کوردیـیە، کـاریگەری زمـانی ماچـۆ بە ئاشـکرا لەسەری دیارە، بـۆ نمـونە فارس دەڵێـت (ئیـمروز ئاغـای ئەهەمەدی سەفەر کەردەن)، یان ئیمشـەب فـلانەکەس موردەن، یـان دەڵێـت: هـا ئاغـا چکـارکەردەنی، ئەمـانە هەمـووی ماچـۆ زمانیـیە و ئەوەیشـی کـوردی نەبێـت، عەرەبییە، زمـانی عەرەبیش زۆری عیبریـیە، یـان ئنگلیزیـیە، پاکتریـن زمانێـک کە بێگـەرد بێـت و خـاڵـس بێـت، کوردییە، بەتایبەت مـاچۆ، زمـانی دەوڵەتـی هۆرییەکان و مادەکانیشـە کە ئاڤێسـتاییە، واتـا هەورامییەکـان نموونەیەکـی دیکـەتان بـۆ بهێنمـــەوە، هەر ڕووەکێـــک، یـــان هەر داهێنانێـــک، یـــان هەر دروستکراوێـکی تـر لە هەر جێگایەکـەوە ڕۆیشتبێـت بـۆ هەر وڵاتێکی تر بە ناوەکەی خۆیەوە ناوزەند کراوە، بۆ نموومە: گوێـز لە

هەورەمانەوە ڕۆیشتووە بەرەو با شووری عێراق، ئەوەتا عەرەب پێی دەڵێن جۆز، واتا گوێز، یان بەڕوو، کردوویانە بە بەڵوت، یان مستەدەس، یان مشتەدەس، یان دەمانچە، هەرسێکی یەک مانایان هەیە، عەرەب کردوویانە بە مسەدەس، واتا مستەدەس، هەر هەمان مانا دەدات، دیارە ئەم چەکە لە کوردستانەوە ڕۆیشتووەبۆنمونە ئالەتی جۆزەهەیە لەدارگوێز دروستکراوە لەکوردستانەوە ڕۆیشتوە بۆ لای ئەوان هەر پێی دەڵێن جۆزە واتای گوێزەکە دەگەیەنێ، هەروەکو سەیارە، خۆ دروستکراوی ئەوان نییە، چونکە لە لای ئەوانەوە هاتووە بە سەیارە ناوی دەرکردووە، لە کوردستاندا، یان وەکو سەلاجە، یان پایسکیل وە زۆری تر لە پێویستییەکانی ڕۆژانەی مرۆڤ لە هەر وڵاتێکدا، بێگومان مقامەکانیش ناوەکانیان شایەتی دەدەن، ئەم هەموو نموونەیەم وەکو بەڵگە هێناوەتەوە، بەڵام خۆ ئێمە هەرچیمان بوو لەدەستمان داو ئێستاش شورەییە بڵێین هی ئێمەیە، یان هی ئێمە بوو، ئەو نانە نانە، ئەمڕۆ لەخوانە، هیوادارم ئەوەشمان ماوە لە دەستی نەدەین، پیاو بەدوای ماڵی دزراوی خۆیشیدا بگەڕێت خراپ نییە و بەهۆی تێکەڵاوییەوە گۆڕانکاریی بەسەردا هاتووە، بۆ ناسینیان، دەتوانم ڕوونکردنەوەیەک بدەم ، نەوەی بنەماڵەیەک دەتوانیت بە دەموچاو و خوێنیدا بیناسیتەوە، کە لە چ بنەماڵەیەکە، بێگومان تۆش دەتوانیت ئەی برای هونەرمەند بە گوێگرتن لە ئاواز و مقامی کوردی خۆت بناسیتەوە، ئەگەر زانیاریت هەبێت لە هونەردا، تەنانەت یۆنانیش سودیان لە کەلتووری ئێمەی کورد بینیوە، چوار پێنج میوزیکیان لە کوردستانەوە بردووە و چەندەها ئاوازی گۆرانیش لە سەردەمی هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا براون بۆ یۆنان، یەکێک لەو گۆرانیانەش گۆرانییەکی خاتوو شەهێن تاڵەبانییە گۆرانییەکی کۆنی کوردە، لە چاوپێکەوتنێکدا

لە یەکێک لە کەناڵە کوردییەکاندا خۆی باسی کردووە، بەداخەوە بەندە خۆم بەرنامەکەم نەبینیوە، هاوڕێیەکم بۆی گێڕامەوە، بەداخەوە ناوەکەیم لەبیر نەماوە تا ناوەکەی لێرەدا بنووسم، بەڵام مامۆستای بەڕێز کاک محەمەدی حەمە باقی لەو بارەیەوە لەسەری دواوە. مەبەستم ئەسکەندەر چۆن کەلتووری ئێمەی بردووە، خاتوو شەهێن گوتوویەتی من لە ئەورووپا لە شوێنێکدا گۆرانی خەوم گوت، کابرایەکی یۆنانی لە لاما بوو، گوتی: ئەوە ئەو ئاوازەت لە کوێ هێناوە، ئەوە ئاوازی ئێمەیە، خاتوو شەهێن لە سەرەتای حەفتاکاندا گوتوویەتی، خۆ ئەوکاتە خاتوو شەهێن لە ئەورووپا نەبووە، ئەمە بۆ خۆی دەیسەلمێنێت کە لێراوە براوە بۆ ئەوێ، بڕوانە مێژووی میوزیکی کوردی حەمەی حەمە باقی. لە هەموو ڕوویەکەوە دەیانەوێت ئێمە سفر بکەنەوە: د. کتۆر کەمال مەزهەر، نووسەری گەورەی کورد، دەڵێت: فارسەکان دەڵێن زمانی کوردی زاراوەی ئێمەن، وەکو ئەوە وایە بڵێن ئەم باوکە کوڕی کووڕەکەیەتی، ئەگەر کورد ببێتە دەوڵەت، ئەوکاتە دەردەکەوێت ئەم داڵە کەرخۆرانە چۆن سەریان کردووەتە جەستەی کوردی هەمیشە ئاشتیخوازی بێ چەک و بێ دیفاع، دوو شت کوردی وا بەدبەخت کردووە، یەک: ئاشتیخوازی دوو: سەرکردە چاوچنۆکەکانمان. بڕوانە و ببینە ئەوەتا بەم نزیکانە لە شارەزوور شوێن هەوارێکیان دۆزیوەتەوە لە بێستان سوور، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی سەرەتای چاخی بەفروبەستەڵەک، تیمێکی ئەورووپی لە سەردەمی ڕژێمی بەعسی فاشیدا دۆزیویانەتەوە، بەڵام لە (٢٠١٢) دەستیان بە کار کردووە، ئێستاش بەردەوامە، بۆیە بەدڵنیاییەوە دەڵێم کەلتووری ئێمە هێندە مۆرکی کوردی پێوە دیارە، بە هیچ زاڵم و زۆردارێک ناسڕێتەوە، هەر بەردەوام دەبێت ئەو شوێن هەوارانە و دەیەها شوێن هەواری تری هەزارەها ساڵ پێش زایین،

ئەمانە دەیسەلمێنن کە ئێمە کۆنترین نەتەوەین لە ناوچەکەدا، چونکە کوردستان ناوچەیەکی ستراتیجییە و جێگای کاروانسەرا بووە، کە لە هەموو ولاتەکانەوە وەکو: ئێران، ئازەربایجان، ئەرمینیا، تورکیا، شام، جەزیرەی عەرەبی، عێراق، هیند، پاکستان و لە ئەفغانستانەوە هاتوون بە کوردستاندا ڕابووردوون، هەموشتێکیان ئاڵوگۆڕکردووە بەهونەرریشەوە ئەم مێژوووە باسی دەکەم لەپاش نەمانی دەوڵەتی ئۆرەک بوەو لەسەردمی ئۆرکیشا لە گەڵ دەوڵەتە گەورکانیشدا هەبووە هەردەوڵەتێ بووبێت لەو سەردەمەدا لە هەمو سەردەمێکدا بازرگانی هەبووە ئەوەتا کاک شوکوری حەمەی هەیەریش کە خەڵکی کفرییە و کفریش هەر لە زووەوە کانی مقاماتی ڕەسەنی کوردی بووە بە ئێستاشەوە، هەموو جارێک پێ لەوە دەنێت ئەم مقامانە کوردین، کاک شوکور پیاوێکی زۆر کوردپەروەرە و کوردێکی پاکە، دەڵێن: لە ولاتانەوە هاتوون بۆ خوێندنی مقامات لە لای مەلا وەلی لە کفری، وە دەگێڕنەوە ئەم مەلا وەلییە بانگدەر بووە لە شاری کفریدا، دەنگێکی زۆر خۆشی هەبووە، هەمیشە لەپێش بانگدا بە چارەکێک، یان نیو سەعات بووتلێک عارەقی پێ بووە لە پاڵ مەنارەکەدا دایناوە و خواردوویەتییەوە، هەمیشە ئەمە کاری بووە، چونکە بەبێ سەرگەرمکردن نەیتوانیوە بانگ بدات، لەکۆتایدا پێیان زانیوە و شکاتیان لێکردووە و دارودەستەی مزگەوت دەریان کردووە، ئەویش سەری خۆی هەڵدەگرێت و دەڕوات بۆ بەغداد، لەوێدا لەبەر دەرکی مزگەوتێکدا وابزانم کارێک دەکات، بەرێکەوت ئەو ڕۆژە ڕۆژی هەینی دەبێت، بانگدەری مزگەوت نەخۆش دەبێت نایەت، لە ماڵەوە دەبێت و کەس نییە بانگ بدات بێگومان وەزیریش زانیوێتی وا بانگ دواکەوت و بانگدەریش نەخۆشە لە

ماڵەوەیە، مەلا وەلیش لەوێ دەبێت یەکسەر دەچێت بانگ دەدات، ئەو ڕۆژە وەزیری ئەوقاف لەوێ نوێژ دەکات، دەڵێت ئێوە نەتانگوت بانگدەر نەهاتووە؟ لە وەلامدا دەڵێن: بەڵێ قوربان، ئەی دەڵێت باشە ئەو دەنگە خۆشە کێیە؟ دەڵێن: وەڵڵا نازانین کێیە، دەڵێت: مەهێڵن بڕوات دەمەوێت بیبینم، لە پاشان وەزیر دەیبینێت وەزیر پێی دەڵێت تۆ ئیشت چییە؟ دەڵێت من ئەو ئیشە دەکەم، وەزیر پێی دەڵێت: ئەی بۆ بانگمان بۆ نادەیت؟ دەڵێت: قوربان من خۆم بانگدەر بووم دەریانکردم لە کفری لەسەر کارێکی وەها، وەزیر دەڵێت: لە ئەمڕۆوە تۆ بانگدەری و عارەقەکەشت لەسەر من، بەهۆی دەنگە خۆشەکەیەوە مەلا وەلی بوو بە بانگدەری فەرمی لە بەغداد، من ئێستاش چەند قورئانخوێنێک دەناسم بەبێ خواردنەوە ناتوانن قورئان بخوێنن، دەنگیشیان زۆر خۆشە. چەندەها مقام بێژی بەتواناتر لە کفری و دەوروبەریدا هەبوون، وەکو مامۆستا شەڵتاغ وزۆرلەو هونەرمەدانەی نەگەیشتونە میدیاکان وەکو ئەوبەڕێزانەی لە خوارەوە ناویانم نوسیوەو چەندان مقام بێژی گەورەی تری کورد، بەڵگەی تریش هەن بۆ سەلماندنیان، ئەوەش چ ناوی شوێنەوار بێت، یان ناوی کەرەستەکان بێت وەکو زەنگاوات، بە واتای شوێنی زەن و زەنگەنەکان، (زەنگەنە واتا رەشەکان لەزەنگیوەهاتوە دیارە زۆربەیان ئەسمەرن) یان وەکو کرمەشان لە پێشدا گەرمیان شار بووە، ئێستاش گەرمەسێرە، یاخود هۆرماتوو ئێستا بووەتە دووز، واتا کارگەی خوێی خورماتوو، بنکوورە بە واتای ناوکرۆکی کوورەکان، بێگومان هەر وایشە هەمووی کورەیە، من باسەکەم لەسەر مقاماتی کوردییە، لە هەمان کاتدا مقامەکانیش ناوی خۆیان هەیە، وەکو مقامی دەشت کە بیسەلمێنێت کوردییە، ئەم مقامە ئەوەندە بەرزە دەبووایە لە

دەشتدا بگوترایە ڕەحمەتی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی قەت گۆرانی لە ماڵە نەگوتووە، بە وتەی بەڕێز حەمەی حەمەباقی نووسەر، بڕوانە کتێبەکەی سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، لێکوڵینەوەی مەیدانی کردووە، چووەتە ماڵی خۆیان وەکو مقامی حەیرانی سەرچیایی، لقێکە لە بەیاد، لەم سەردەمەدا کراوە بە بەیات، خۆی لە کۆندا بەیاد بووە، مقامێکی دەشتی هەولێرە تێکستەکانی هەمووی بەسەرهاتە، دەبووایە لەسەر چیاکان بگوترایە، چونکە عەیب بووە لەبەر نەریتە ئاینییەکانی ئیسلام، لە سەرهەڵدانی ئیسلامەوە میوزیک و ئاهەنگ و شایی حەرام کراوە، بەتایبەت لەفتوحاتی سەردەمی خەلیفەکاندا، چونکە ئەوان کاریان پێ نەبوو، ئەوان زیاتر کاریان کاری سەربازیی بووە، دەستووری دینەکەیان ئاهەنگ و شایی ورەشبەڵەکیان حەرامکردووە هیچ کاتێ ڕێیان نەدەدا لە ماڵاندا گۆرانی بگوترێت، مقامی خاوکەر دوور نییە مقامی سروودی خۆر بووبێت، یان گوێگرانی بە خەو کردووە لە خوارەوە باسم کردووە، ئێستا ناسراوە بە خاوکەر، بە بۆچوونی من دوور نییە لە خۆرەوە، وەکو خورشیدی لە زۆر سەرچاوەیشدا هاتووە، وەکو قەسیدەی دینی ئێستا وا بووە لە پەرستگاکانی ئەو مزگەوتەکانی زەردەشتیدا خوێنراوە، لەپێش زەردەشتیشدا مقامی قەتار هەر هەبووە وەکو ئاوازەکەی، لە خوارەوە ئاماژەی زیاتری پێدەدەین، بێگومان بە ناوێکی ترەوە لە سەردەمی زەردەشتیشدا زیکری گاتاکانی پێکراوە، واتا ئایەتەکانی ئاڤێستای پێ خوێندراوە هەروەکو ئێستا چۆن قورئان لەسەر خورشیدی و دەشت و حیجاز و سەبا دەخوێنن، قەتار لەگەڵ مقامی خاوکەردا دەگوترێت،

دوو مقامن قەتار و خاوکەر، واتا دەتکاتە خەو، بە زمانی ماچۆ، یان ئاڤێستایی. خاوت دەکاتەوە، مادام خاوی پێوەیە، یان زکری خۆری پێکراوە، ئەمانە مقامی ڕەسەنی کوردن. بێگومان ناوەکەی و شێوازی گوتنەکەی دەیسەلمێنێت کوردین، دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ژیانی مرۆڤی کورد، تەنها بە ناوی ئایەتەکانی ئاڤێستای زەردەشتەوە ناوی دەرکردووە، چونکە تێکستەکەی گاتاکان بووە و سەلمێنراوە بەپێی لێکۆڵینەوەکان، (بڕوانە کتێبی: مێژووی دەوڵەتی ساسانی سەردەمی کێرەوییەکان- لەو سەردەمەدا زۆر پەرە بە میوزیک دراوە، نووسینی: مفید ڕائف مەحمود، وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا گەرمیانی). یان مقامی خورشیدی بە بۆچوونی من، ناوی ئەم مقامە لە خۆرییەکانەوە هاتووە، یان هۆرییەکان، چونکە سەردەمانێک خۆریان پەرستووە و زیکری خۆریان کردووە بەو سروودانەیان ووتووە هۆرە .

هۆرە، ئەم هۆرەیەش هەتا ئێستاش ماوە و گوێگر و هەواداری زۆرە، هەروەها ئەم بیروباوەڕەش دەگەڕێتەوە بۆ گەرم بون و دەرکەوتنی تینی خۆر و نەمانی بەفر و بەستەڵەک، پێموابێت لە پاش لافاوەکەوە دەستی پێکردووە، هەر لەبەر ئەوەشە بەم ناوچەیە دەڵێن ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کە ژیانی بەخشیوە بە مرۆڤایەتی بەهۆی نەمانی تەمومژەوە دیارە تیشکی خۆریش بەدەرکەوتووە لە ڕۆژهەڵاتدا، بۆیە هەموو بەیانییەک زوو نوێژیان بۆ کردووە، هەتا بیان پارێزێت و نەمرن لە سەرمادا، هەروەها سروودی هۆرەیش وەکو مقامەکان بەزمی زۆرە، ناوەکانیشیان جیایە، هەروەکو مقامەکان هەرکەسە و بە ئارەزووی خۆی چڕیویەتی و بۆ مەبەستێک گوتراوە، وەکو هۆرەی ئەلی نەزەری و هۆرەی سەیقولی و زۆری

ترهەن لە دەڤەری گەرمیانشاردا لە ئێستادا بۆ خۆشەویستی و بۆ نیشتمان و هەتا بۆ مردووش دەیڵێن، بەگوێرەی تێکستەکە و ئاوازەکەیە، ئەگەر بۆ مردوو بێت، غەمگینە و بۆ خۆشەویستی و بۆ بۆنەکانی تر هەریەکەو شێوازی خۆی جیاوازە، گەیشتووەتە بەزمی ئاشقانە. خۆی لە بنەڕەتدا بۆ زیکر و پەرستش بووە بۆیە ناوی بەهۆرە دەرکردووە، ئێستاش هەر ماوە و لە ناوچەی کرماشاندا لەبرەودایە، بەتایبەت لەلای برا یارسانەکان و برا قەڵخانییەکان لە دەڤەری داڵە هۆدا.

بەزمی هۆرە، یان سرووودی خۆر، یان دەڵێن نوری خودایان لەناو خۆردا بینیوە، لە زەمانی هۆرییەکاندا، بە خۆریان گوتووە هۆر، (بڕوانە: مامۆستا ئەیوب کوێخا ڕۆستەم، کتێبی ئازگار، یان کتێبی گەوهەری ژمارەیەک لە تێکست و دەستنووسەکان)، کە ئێستاش هەر لە هەورامانە، دەڵێن هۆر، یان وەر بە تاقی ڕۆشنایی کورد هەر وتویانەو دەڵێن کەلەوەر، واتا لەو کەلەوە هەمو کەسێ دەزانێ کەل چیە خۆر دێتە ناو کورد، هەر گوتوویانە خۆر لەکەڵ سەری هێنایە دەر، یان خۆر وا لەسەر کەل، ئێستاش بنەی جاف هەر بە دەرگا دەڵێن کەلەوەر بە ماچۆیی. چەند هۆزێک بە ماچۆیی دواون، هەتا سالی حەفتاکان، وەکو: باجەلان، زەن، زەنگەنە، کاکەیی و هەورامی، بۆ نموونە هۆرەمان هەیە زۆر کۆنە، دەتوانم بلێم چوار پێنج هەزار ساڵ پێش زاینە، (بڕوانە: بەڕێز ئاکۆ محەمەد میرزادەیی، مێژووی دێرینی کورد) بە بەڵگە وێنەو مۆری سەردەمی هۆرییەکان لە هەموو ڕوویەکەوە سەلمێنراوە، لە ڕووی مێژوویییەوە بەزمی هۆرە دەیەها ئاوازی جۆربەجۆری هەیە ، کە بەدرووستی لە لاپەڕەی داهاتوودا لێیان دواوم .

**بەزمەکانی هۆرە:**

١-گوڵە خاک. ٢-گڵەوەدەر. ٣- باندەسانی. ٤-شاحوسەینی. ٥-شارۆخانی. ٦-جڵەوشایی. ٧- تەرز. ٨- مەجنوونی. ٩- سەحەری. ١٠- باریە. ١١- دووباڵا. ١٢- غەریوی، یان غەریبی، لە هەولێردا مقامی حەیرانی غەریبی هەیە. ١٣- بان بنەیی. ١٤- پایەمۆردی، یان پاوەمۆری. ١٥-قاچاخی چڕ. ١٦- چۆڵی. بەڵێ مقامیش هەیە بە ناوی سەحەری و حوسەینی، هەروەها بە ناوی غەریبی، ئەوەتا بە زمانی کەڵوڕ و لوڕی بەختیاری ئەم پارچە شیعرە وا هاتووە لە خوارەوە دەڵێت:

**گۆرانی و هۆرە و سیاوچەمانە**

**قەدیم یادگاری قەومی کوردانە**

ئەمە شایەت حاڵە چونکە ئەم هۆنراوەیە زۆر کۆنە.



پەیکەرێکی گڵێنەیی عودژەنێکی هۆری کە لە نوزی لەلای کەرکوک دۆزراوەتەوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٥٠٠ پێش زاین

ئەم پارچە هۆنراوەیە زۆر کۆنە، هی برا یارسانەکانە، با بێینە سەر وردەکارییەکان، دیارە گۆرانی لە گاورەکانەوە هاتووە، یانی گەورەکان واتا گاتایەکان یان گازاکان لەپاشان بووە گۆرانەکان ، ئەم ناوە دەیسەلمێنێت مقام و گۆرانی و میوزیک داهێنانی گاورەکانە، واتا زەردەشتییەکان، چونکە ولاتانی تر بە کورد و زەردەشتییەکانیان گوتووە دین گەورەکان، یان پالەوانەکان، موریدو و لایتنگریّ زۆریان هەبووە و ولاتێکی گەورەش بووە ئیمبراتۆریە گەورەش بووە بۆیە گۆرانی و میوزیکیش بە ناوی گۆرانەکانەوە هاتووە، برای بەرێزم هونەرمەند کاک حەسەن هەیاس-یش هاوڕایە لەگەڵ بۆچوونەکەی مندا، کورد لە ئەسڵدا بە گاور ناسراوە، واتا گەورەکان، واتە ولاتە گەورەکە، یان دین گەورەکان، بە واتایەکی تر پاڵەوانەکان، یان بانگخوازەکان شوێنەوار، یان چەند هۆزێک ماون لە گەورەکان، لەوانەش فەیلی، واتا پەهلی، یان پاڵەوانەکان و پالانییەکان، ئەوەتا تا ئێستاش هەر ماوە، بۆ نموونە هۆزی پالانی، یان هۆزی فەیلی عەرەب کردوویەتی بە فەیلی، ئەگینا خۆی پەهلییە، چونکە عەرەب پیتی (پ) گۆ ناکەن، بۆ ڕاستی ئەم گوتەیەم (بڕوانە: کتێبی مێژووی بنەچەی کورد، د. عەبدوڵلا دارتاش).

بەم دوادواییە کورد بووە بە دوو بەشی سەرەکی: (جاف و گۆران) ئەگینا خۆی هەر گۆران بووە، واتا گەورەکان، یان گاتاییەکان، واتا زەردەشتییەکان، کە بانگخوازبوون بۆ خودا پەرستی، لەو سەردەمەشدا سروود و هۆرە و ئەو مقاماتانەش لە گۆرانەکانەوە داهاتووە، بۆیە گوتویانە گۆرانی،دیارە سرودەکان ناسراون بەگۆرانیەگان بەزمی هۆرە بە ناوەکەدا دیارە، ئاهورامەزداییە، واتا زیکری دانای مەزن، واتا خودای گەورە بۆ هۆرەکەش، یان وەرەکە نوری خودایان لەناو خۆردا بینیوەبەتایبەت

لەسەردەمی زەرِدەشتدا بەلاّم لەسەردەمی هۆریەکاندا خۆریان پەرستووە گومانی ناویّ هەتا برایم پێغەمبەریش خۆری پەرستووە پەرسگای هۆرشەلیم یان ئۆرشەلیم شایەتە ، چونکە بە خۆر دەڵێن: هۆر، یان ئاگریش نموونەیەکە لە گەرمی خۆر، بۆیە پیرۆز بووە لەلایان و بە پیرۆزیش ماوەتەوە، ئاگر لەپێش خۆردا پەرستراوە، لەو سەردەمەدا کە دۆزراوەتەوە، ئاگریش هێمایەک بووە بۆ پێناسەکردنی خۆر، گوتوویانە ئاگر نوورە و بەشێکە لە خۆر، خۆریش نورە و نوری خودایە، بۆیە هەموو بیروباوەڕەکان ڕەتنەکراونەتەوە بەپیرۆزیی ماونەتەوە، هەمیشە ئاگریان گڕاوە هەتا هاتنی لەشکری ئیسلام لە کاتی خەلیفەی مسوڵمانان‌دا عومەری کوڕی خەتابدا، بە ئاگریشیان گوتووە ئایەر، زۆر لە گەلانی تریش لەسەر هەمان بیروباوەڕ بوون، بۆیە دەڵێن شعوبی ئاری، یان گەلانی ئاری. ئێستاش لە هەورامان دەڵێن ئایەر، ئەو ئاگرە ساڵ دوازدەی مانگ نەکوژاوەتەوە و ئێستاش شوێنەواری ئاگردانەکانیان دۆزراونەتەوە لە زۆربەی شارەکانی کوردستاندا، ئەم ئاوازەم قەت لە هیچ نەتەوەیەک نەمبیستووەو نیە مەبەستم هۆرەیە، بەڵگەی ڕاستیش دەبێت بە شیعری گۆران بگوترێت، یان بە ماچۆ، ئەگینا تاموچێژی لیّ نابینیت، چونکە لەو سەردەمەدا زمانی کوردی سۆرانی هەمووی زمانی ئەم شێوەزارە بووە، ئەوەیە بەڵگە کە ئێستاش هەر بە ماچۆ دەگوترێت زمانی ماچۆ، زمانی ئەسڵی زەردەشتییە، پێم وایە دینی زەردەشت ئاخر دینی کوردە لە ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاستدا، شەڕی عەرەب و دینەکەیشی لە ڕۆژهەلاّت لە دژی کورد و دینی زەردەشتی بووە لەو سەردەمەدا، مەبەست لە زەردەشتەوە هەتا کۆتایی ساسانییەکان مقامی زۆرمان هەبووە. لەسەردەمی ئەسکەندەری مەکدۆنیشدا کەلتوری ئێمەی زۆر لە ناوبرد لە

پاشان له دوای ئەسکەندەر مادەکان سەریان هەڵدایەوە و دوبارە ئاڤێستایان کۆکردەوە هەتا حکوم ڕانی ساسانیەکان و لەپاشان سوپای ئیسلام هاتن و تەواوی دەستوریان گۆڕی و گۆرانی و مۆزیک و هونەریان قەدەغە و حەرامکرد بەم بۆنەیەوە زۆر مقام و ئاوازمان فەوتا و زۆریش کران بەموڵکی وڵاتان.

**مقامەکان:**

وەکو مقامی ئەڵلاوەیسی، مقامی خورشیدی، مقامی ئای ئای، مقامی چەمەری مقامی قەتارو خاوکەر . لە پاشان بە درێژیی باسیان لێوەدەکەم، مقامی سیاچەمانە، واتا چاوڕەشەکان، ئێستاش لە ناوچەی هەورامانذا هەر ماوە گوێگری زۆریشی هەیە جگە لە سیاچەمانە مقامەکانیتر هەر ئەوتریٚ لە گەرمیاندا ئێستاش هەر بەتێکستی ماچۆ دەگوترێت.
مەقامی ئای ئای، ناسراوە بە مەقامی باجەڵان، جگە لە تێکستی ماچۆ، سەرکەوتوو نابێت واتا تاموچێژیٚ نیە. مەقامی حەیران سیٚ جۆرە: مەجلیسی و غەریبی و سەرچیایی. لە دەشتی هەولێردا هەر ماوە، مەقامی لاوک لە باکووری کوردستاندا باوە، هەرسێکیان لقێکن لە بەیات، کاتی خۆی بەیاد بووە، واتا زیکر و یادی خوای گەورە و یەکتایان پێکردووە، ئەم مقامانە ئەمڕۆ پێی دەڵێن بەیات، وە نووسەر و شاعیری گەورەی کورد و مامۆستای نەمری گەلەکەمان ئەحمەدی خانی-ش ناوی زۆر لەم مقاماتانە دێنێت لە باکووری کوردستاندا، وەکو ئەمانەی لای خوارەوە. دەمەوێت ئەوەش بڵێم، لە باکوور و ڕۆژهەڵاتدا ناوەکان جیاوازن لەگەڵ باشووردا، بڕوانە ئەمانەی خوارەوە ناوی مقامەکانن لە

باکووری کوردستان، کە زۆربەیان جیاوازن لەگەڵ ڕۆژهەڵات و باشووری کوردستان، وەکو ئەمانەی لای خوارەوە:

١- عوشاق. ٢- نەوا. ٣- کوردان ٤-ڕەهاوی. ٥- گۆشت. ٦-شەهناز. ٧- حەزین. ٨- ئاهەنگ. ٩- تەرەنۆم. ١٠- سەروسەهی. ١١- سەبا. ١٢- سەدا. ١٣- نەوبەهاری. ١٤- شاهێن. ١٥- دڵگوشا. ١٦- نەغمە. ١٧- نەصفیە. ١٨- هۆزار. ١٩- ئەوازە. ٢٠- گوڵ ڕووخ. ٢١- ڕووبا.

خانی ناوی ئەم مقامانە دێنێت بە شارەزاییەکی باشەوە، دیارە شارەزاییەکی باشی هەبووە لە مەقام و بەستەدا، مەقام و بەستەی لە یەک جیا کردووەتەوە، هەروەکو کاک محەمەدی حەمەباقی دەڵێت: گصنانە، گوڵستان، گوڵعوزار، لالەڕووخ، نازەنین، زەم زەم، ژێر گوڵە، سازگار، سەفا، نازو نەسیم، نیگار، نەورەسیدە، نەورۆز، بەزم و پەردە، هەوا جامی، جەم و شەودێز،دیارە ئەم مقامە بە ئەسپەکەی شیرنا گوتراوە زەنگۆڵە، موخالیف، مەقلوب، بێداد و دڵنەواز. بێگومان ئەم مەقامانە لەگەڵ ئەم مەقامانەی ئێرەدا دەچنەوە سەر یەک، بەڵام ناوەکانیان جیاوازن، دەشێت لق بن گوتنیشیان جیاوازی هەبێت، بێگومان لە ئاسیادا هەموو مەقامەکان حەوت مەقامن: تورک، فارس، عەرەب، کورد، بگرە هیند و ئەفغان و دەوروبەری ڕووسیایش، هەر حەوت مەقامەکەن، یۆنانیش زۆر لە کەلتووری ئێمەیان بردووە، ئەوە بۆ خۆی سەلمێنراوە، هەر ئەم مەقامانەی ئێرەیە دەیڵێن، ئەوەتا بڕێکیان لێرەیش هەن مەقامی ڕەسەنی کوردن، لە هیچ نەتەوەیەک تا ئێستاکە نەمبیستووە بەم شێوەیە بگوترێت، کە ئێستا لێرە

دەگوترێت لە کوردستاندا.بەڵێ مەقامی کوردی نزیکەی لە حەفتا هەشتا مەقام زیاترە بە لقەکانییەوە، لە باشووری کوردستاندا مەقامەکان، یان دەزگاکان، واتا پەیژەکان، ئەمانە بەشێکیانن کە ناوەکانیان لە خوارەوە نووسراوە بەگوێرەی توانا ڕوونکردنەوەیان لەسەر دەدەم، بەپێی ئەو زانیارییانەی کە هەمە لەسەریان، دەمەوێت ئەوەش بڵێم ئەم ناوانەی کە دەیاننووسم، بریتییە لە ناوی کۆن و نوێ و لەسەرەوە و لە خوارەوە ڕوونکردنەوەم لەسەریان داوە، هەندێک سەرچاوە باسیان لێوە کردوە بەتەواوەتی نەیان پێکاوە من هندێکم لە مامۆستا بێستونەوە وەرمگرتوون بە سیدییەک، لە ڕێگای مامۆستا نەجم کەلارییەوە، زۆر سوپاسی دەکەم، بەڵام مامۆستا بێستوون مەقامەکان تێکەڵ دەکات، شێوازی عەرەبەکانی وەرگرتووە، چونکە م ـ بێستوون لە ڕێی قورئان خوێندنەوە مەقامەکانی ناسیوە و وەریگرتووە، بەڵام بەندە لە ڕێی هونەرمەندە گۆرانیبێژە گەورەکانیکوردووەرمگرتوون، بۆ نموونە مەقامی هومایۆن لە مامۆستای خوا لێخۆشبوو سەید ڕەحیمی قورەیشییەوە فێربووم، بۆیە دەتوانم بڵێم من شێوازە کوردییەکەییم وەرگرتووە، هەر لە سەرەتای گوێگرتنمەوە لە مەقامە کوردییەکان بەهۆی میدیاکانی ئەوسەردەمەوە سوودم لێیان بینیوە، ئەوەش ناوی مەقامەکانە لە خوارەوە، کە بەگوێرەی ئەوەی من گوێبیستیان بووم و ناسیومن:



**ئەم ئامێرانە بریتین لە بالابان و دووزەلە وتەپڵ کە ئامێرێکی ڕەسەنی کوردەوارین، دووزەلە کە لە ئێسکی بزن دروست کراوە.**

## مەقامەکان:

مەقامەکـــانی باشـــووری کـــوردستان و ڕۆژهەڵات و هەمـــوو جیهـانیش هـەمـان حـەوت مەقامەکەن واتا حـەوت پـەیژەکە، بەڵام بە نـاو و گوتـنی جیـاوازەوە، لە ئێسـتادا میوزیکیەکـان دەڵێـن پەیژەیەکـی تریـان بـۆ زیـاد کـردووە، بـە گوتـەی مامۆسـتای ژەنـیاری بەڕێزی گەلـەکەمـان کـاک سـەلاح ڕەئوف- ی بەڕێزیـش دەڵێـت: مەقامەکـان هـەر حـەوت پـەیژەکـەن، بە نیسـبەت پـەیـژەی هـەشتەم ئـەوە ژەنیارەکان دەزانن ئـەوە کاری نۆتە و ئەکادیمـیـە. (بـۆ زانیـاری زیـاتر، بڕوانە: پـەیژەکـانی مۆسـیقـای کوردی، چـاپی ٢٠٢٠، ل١٠). ئەم بۆچـوونەی منـی سـەلمانـدووە، هەر لە هەمـان کتێبدا لە (ل٤٠)دا باسی پـەیـژەی گەورەی ڕۆژهەڵاتی سیگـان واتـا سـێ گـا هومایـۆن دەکـات، دەڵێـت: لە وڵاتـانی ڕۆژئاوایـشدا پـێی دەڵێن سیگـا، بڕوانـە چۆن ناوەکان گـەواهی کوردییان دەدەن، کـە

بەندە دەڵێم سێگا کوردییە و لە حەوت سروودەکەی زەمانی زەردەشتین بۆ زیکری ئاهورا مەزدا خوێنراوە، ئەوەتا لە ڕۆژئاوایشدا هەمان ناوی هەیە، نامەوێت درێژەی پێ بدەم، چونکە لە خوارەوە بە دووروودرێژیی باسم کردووە، کێ کۆنترین گەلە و میوزیک و گۆرانی چۆن داهاتووە، ئامێرەکان چۆن دروست بوون و لەبەر چ هۆیەک داهێنراون؟ ناویان چییە و کێ دایهێناون؟ لە چ ناوچەیەک بووە؟ ئەم گوتەیەم لە زۆر سەرچاوەدا سەلمێنراوە، بە بەڵگەشەوە ئەوەتا ئەم زانایەش ئەو گەواهییە دەدات (کۆرت زاکس) لە هەمان کتێبی ناوبراودا لە پەیژەکانی مۆسیقای کوردیدا لە لاپەڕە (٤١)دا دەڵێت: گۆرانی زۆر لە مۆسیقا کۆنترە، چونکە هەموو گەلان خاوەنی کەلتووری خۆیانن لە پێش پەیدابوونی میوزیکدا، منیش لە خوارەوە باسم کردووە بەڕوونی، دەمەوێت ڕوونکردنەوەیەک بدەم لەسەر بێ سەروبەرەیی و سەرلێشێوانی میوزیک و گۆرانی کوردی لەچیدایە، لەپێشی هەموو گەلانەوە لەپاش لافاوەکەوە ئێمەی کورد خۆرسکانە داهێنانمان کردووە و هەتا سەرهەڵدانی زلهێزە جیهانگیرەکان لەژێرناوی جیاجیاوە وڵاتانیان داگیردەکردو تاڵان و خاپوریان دەکردو دەیانسڕینەوە هەزارەها زانیاری و کەلتوری جوانیان لە ناودەبرد و قەتڵ وعامیان دەکردو ئەوەیش دەمایەوە کۆیلە دەکراو بەسکێ برسی وبەسکێ تێر بە ژێردەستەیی دەژیان هەتا ئەوڕۆژەی دەمردن بەتایبەت کوردیش یەکێ لەوگەلانە بوین هەتاکو ئەمرۆش کۆیلەیان کردوین و هیچمان بەدەستەوە نەماوەو زاناکانمان لە هەموو و بوارەکاندا کوژران و هەرچیش مایەوە پەرتەوازەی وڵاتان بوون، یان بوونە کۆیلەی وڵاتانی دەوروبەرمان، ئەوکاتە سەردەمی ئیمبپراتۆری ساسانییەکان بووە و دەتوانم بڵێم پەرەسەندنی

عەقڵییەتی عەرەب و بازرگانی و ئابوری وشارستانی و بیناسازی وهەتا لەڕوی کۆمەڵایەتی ومەعنەویەوە، دامەزراندنی کۆشک و تەلار و شارستانییەتیشیان لە ساسانییەکانەوە وەرگرت، ئەوکاتە دینی ساسانیەکان زەردەشتی بوو، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی فیتنە، مشتومڕی ئاین و سیاسەت لە سەرەتای ئیسلام، نووسنی: هاشم جعیت چۆن ئاماژە بەوەدەکات ساسانیەکان چەندە هاوکاربون بە ئەو دەوڵەتەی عەرەب کە تازە دامەزراوە لە هەموو ڕویەکەوە، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: مامۆستا سابیر عەبدوڵلا کەریم).
ئیتر ئێمە میللەتێکی بندەستەین و لەو ڕۆژەوە هەر چەوساوینەتەوە و هەرگیز بواریان پێ نەداوین بە ئەکادیمییانە کار بۆ گۆرانی و مقامات ومیوزیکەکەمان بکەین هەتا لەبوارەکان یتریشدا، بۆیە هەرکەسە و هەرچی لە دڵدا بووە هەڵیڕشتووە و لەپاشان خەڵکی تریش لاسایان کردووەتەوە و بە ناوی ئەوەوە ناوزەند کراوە، نەوەکو لەسەر پەیژەکان و گۆڕینی پەیژەکانی میوزیک هەڵسوکەوتی کردبێت بەگوێرەی ئیقاع و نۆتەی میوزیک و پەیژەکان، تەنانەت گەلانی چواردەورمان زۆر سوودیان بینیوە لەم سەرلێشێوانەی ئێمە و بە ئارەزووی خۆیان گۆڕانکاریان کردووە لە ناو و لە نۆتە و تێکست و میلۆدییەکاندا و کردوویانە بە ناوی خۆیانەوە، هیوادارم هەموو تاکێکی کورد بە خۆیدا بچێتەوە و خۆی بە بەرپرس بزانێت بەرامبەر بە میللەتەکەی، بڕوانە ئەم ناوانە لەم سەردەمەدا من ناسیومن، بێگومان لە وڵاتانی تردا بە ناوی جیاجیاوە هەن، بەڵام هەمان حەوت پەیژەکەن لە لاپەڕەی داهاتوودا باسم کردووە.

**مەقامی، یان مۆگامی، بەیات، یان بەیاد**

١- بەیات بنەڕەت بەستەکەی ئامۆزا گیانە.
٢- بەیات ئای ئای باجەڵان، بە شیعری میرزام سەراویێ ناسراوە. بە باڵای سەمەنگوڵا گوتراوە، کە دایکی سەمەنگوڵ پیایدا گوتویەتی، ئەمە بەسەرهاتێکی کۆنی ناو هۆزی باجەڵانە، بە گوتەی م. نەجم باجەڵان بۆ هۆنراوەی شاکە و مەسویرەیش (واتا میرمەنسوور، شاکەیش شاعیرێکی چاک بووە هاوڕێی میرمەنسوور بووە)، مامۆستا نیعمەت زەحمەتکێش ڕوونیکردەوە، شارەزایی باشی لە بەسەرهاتەکەدا هەیە، لە پاشان دێینە سەری.
٣- بەیات هیجرانی، ئەوەیە کە مامۆستا عەلی مەردان دەیڵێت.
٤- بەیات کورد.
٥- بەیات سەفەر، بەستەکەی نازدار و نازدارە.
٦- بەیات قەزاز، لە خوارەوە زیاتر ڕوونکردنەوەم لەسەری داوە.
٧- بەیات تورک، بەیات بە کوردی واتا بەیاد، لە بنەڕەتدا بەیاد بووە.
٨- بەیات ئەساقی کوردی.
٩- بەیات ئەساقی دووگا.
١٠- بەیات برایمی.
١١- بەیات عەجەم، یانزە لقە.
١٢- سەبا مەنسووری.
* سەبا دوو لقە.
١٣- سێگا کورد.
١٤- سێگا ئەوج.
١٥- سێگا هۆزام.
١٦- سێگا ئەو سەر، یان باڵابەستەکەی خوایە داکەی بارانێ مامڵێ.

١٧- سێگا موخالیف، جەماڵ.

١٨- سێگا حەکیمی.

١٩- سێگا حەکیمی ڕوکبانی حەوت لقە، مەقامی ئەوشاریش هەیە. دیارە لە شاری هەوشاری ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە، بەستەکەی گۆرانی نازیلێی مامۆستا عەلی مەردانە، لەبارەی سێگایشەوە ئێستا وای لێهاتووە ئەگینا خۆی حەوت سرووودە لە سروودەکانی گاتایە، گا واتا گاز، بە مانای بانگەواز دێت بۆ لای خوای گەورەی یەک تا. ئایەتەکانی ئاڤێستاش ناوی گازە، واتا گازی خەڵکی دەکات بۆ چاکەکاریی و گەڕانەوەی لای خودای گەورەی یەکتایە، کورد لە زۆر شوێندا ئەم دوو وشەیە بەکاردێنێت بۆ یەکدانەیی و بۆ گەورەیی پەروەردگار، وەکو ژمارەیش بەکاریدێنن. گا، واتا یەک جار، یەک گا و دووگا و سێگا، هەتا حەوت گا، ئەمە وەکو ژمارە دەکاتە حەوت سرووودەکەی بانگەواز، یان حەوت گازەکە، بۆیە ئەم سرووودانە ناوی گاتای پێوەیە لەخزمەتی گاتایا بوون. بە کوردیش گوتوویانە گاور، واتا گاتایەکان هەتا دوایی بەمانایەکی تر کورد بە هەموو شتێکی گەورە (گا)یەکی پێوەیە پەرژین بێت لە ڕووی خودای گەورە، وەکو: گامێش، گاسن، یان گاکۆتر، سەرزەمینی کورد خۆی وڵاتێکی گەورە بووە، بۆیە گوتوویانە گۆران، یان گاور، یان پەهلەوی، واتا پاڵەوانەکان، دین گەورەکان، یان فەیلی واتا پەهلی، عەرەب کردوویە بە فەیلی، چونکە عەرەب پیتی (پ) گۆ ناکەن، لە زۆر شوێنی تردا لەم کتێبەدا باسم کردووە، دەمەوێت بیسەلمێنم ئەم مقامە موڵکی کوردە، بەڕاستی لە ڕووی داهێنانیشەوە خاوەنی گەورەیی خۆیان بوون، بۆیە ئەم ناکۆکی و ململانێیەش پەیدابووە، کورد دەوڵەمەند بووە، ئەم مەقامانە بە مەقامی گاتا هاتووە و سرووودەکانی زەمانی زەردەشتین، ئێستا ئەم ناوانەی پێوە لکاوە، وەکو: حیجاز، بەیات و زۆری تر، خەڵکی وا تێگەیشتوون لە حیجازەوە هاتووە، بەڵام مەقامی

هەیگـازە زۆر لەپـێش هێرشـی ئیسـلامدا بـووە و گـوتراوە بە نـاوی هەیگـازەوە خۆرشـیدی بەشـێکە لە هەیگـاز، یـان حیجـاز، زۆربەی ناوەکـانیش هەر کـوردین، بـۆ خـۆی دیـارە هـۆکەی چییە، بـریتییە لە تێکەڵاوبـــوونی ئەم گەلانەی چواردەورمـــان، چـــۆن خاکەکەمانیـــان داگیرکـــردووە و شـــێواندوویانە، ئاوەهـــاش کـــەلتوورە کەشـــمانیان داگیرکـردووە و شـێواندوویانە، بەڵـێ زۆر لەپـێش زەردەشتیشـدا ئەم مەقاماتـانە هەر هەبـوون و گـوتراون، مەقـامی، یـان موگـامی، یـان موغامی، قەزاز هەیە، واتا گاز، لە ئێستایشدا بنەماڵە و کەسانێکی زۆر هەن بە ناوی قەزازەوە، دیارە ئەمانە بانگخوێنەکانی کاتی زەردەشتی بـوون لە خزمەتـی ئـاین و بۆنەکـانی گەلـدا خـوێنراون، لە زۆر سەرچاوەدا هاتووە و سەلمێنراوە کتێبی پەیژەکانی میوزیکی کوردی مامۆستای میوزیکژەنی گەورەی کورد کاک سەلاح ڕەئوف-م هەموو خوێنـدەوە، زۆر لە بۆچوونەکـانی منـی سـەلماندووە، ئەو هەرچۆنێک باسـی نـۆتە و چـارەکە دەنگیـیەکان و سـێ چـارەکە دەنگیـیەکان و بەرزونزمـــی پەیژەکـــان و گۆڕانکـــاریی تـــۆن و نیـــو تـــۆن و وردەکارییەکـانی میوزیک و مەقامـات دەکـات و زۆر وەردەکـاریتر لە فارسیدا، یان لە عەرەبیدا و لە ئەوروپا و ڕۆژئاوادا چی پێ دەڵێن، کە مـن لـێرەدا نەم نووسـیون، باسـیان دەکـات و ئەکادیمییـانە لـێی کۆڵـیوەتەوە، ئەوەیشـی سـەلماندووە زۆربەی مەقامەکـان، بەتـایبەت مەقامەکانی ئەمڕۆی گەرمیـان، هـی کـاتی زەمـانی زەردەشـتین و زۆر کـۆنن و هەتـا ئێسـتاش مـاون و گـوێگری زۆریـان هەیە، هەروەهـا دێرینیـی میللەتـی کـوردیش سـەلمێنراوە. ئەوەتـا مامۆسـتا ئـاکۆ میرزادەیی لە کتێـبی مێژووی دێرینـی کـورددا دەڵێت: کـورد (٤٠٠٠) ساڵ پ.ز کاسییەکان هەبونەو هەر لەک و لوڕن و بەختیاری ئێستان، لە شـاخەکانی زاگرۆسـدا حکومەتیـان دامەزرانـدووە، لە چیاکـانی زاگرۆسدا بە سەرۆکایەتیی پاشا تۆپکەش یەکەم شـاری شیان نـاوی

له دینەکەیانەوە هاتووە، ناوی ئۆرکەش بووە، ئۆر، یان وەر، واتا خۆر، بۆیە بە هۆرییەکان ناویان دەرکردووە، دین و نەرتی هیتییەکانیش هەر لە هۆرییەکانەوە وەریان گرتووە، واتا ئەوەی هیتییەکان هەیانە، هەمان دابونەریتی هۆرییەکانە، دیارە شاری هیتی ئێستای عێراقیش ئەوان بنیاتیان ناوە، نەرامسین پاشایەکی زۆر بەتوانا بووە، لەو سەردەمەدا هێرشی کردووەتە سەر پاشا تۆپکەش سەرنەکەوتووە بەسەریدا و لەپاشان ڕێککەوتنیان کردووە و نەرامسین کچەکەی خۆی داوە بە پادشا تۆپکەش و ناوی کچەکەشی (تارام ناگەدە) بووە، واتا کچەکەی نەرامسین لەو کاتەدا سنووری دەسەڵاتی هۆرییەکان جوگرافیای ئەم چوار دەوڵەتەی ئێستامان بووە. ناوبراو دەڵێت: هەر زوو سۆمەرییەکان لە هۆرییەکان جیابوونەتەوە و هاتوونە بەرەوخوار بۆ نێوان دووئاوان، لەوێ دەوڵەتی خۆیان دامەزراندووە، دەڵێت هەر سۆمەرییەکان بوون کە بۆ یەکەمجار نووسینیان داهێنا، ئەو نووسینەش نووسینی مێخی بسماری بووە، هەر سۆمەرییەکان بوون بۆ یەکەمجار دارخورمایان هێناوەتە عێراق، یان بە زمانی کۆن ئێراکە، ئەم گەلە لەو سەردەمەدا بە هۆرییەکان ناسرابوون، چونکە خۆریان دەپەرست، بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبەکانی عەشتارو گلگامێش زۆر جوان ئاماژەدەدات بە هۆریەکان و زاگرۆس نشین و وڵاتی ئارەرات کەهەموی وڵاتی ئێستای کوردستان دەگرێتەوە دیارە ئەوکاتە ناوی کورد نەبوە ئاریکان و هۆریەکان و گودیەکان بووە بۆیە ناوی کورد لەوسەردەمانەدا نەبوە خەڵکی ئێستا گلەیی لەوە دەکەن بۆ ناوی کورد نیە لە مێژوودا ئەم ناوانەبونە کە باسم کردن دینەکانیش هەر ئەمدینانەبونە ئەوەتا ناوەکان و گۆرانیەکان وسرودەکان شایەتی دەدەن بۆیە دەتوانم بڵێم ئاگرپەرستی و خۆرپەرستی سەردەمی میترایەکان بووە واتا دانشتوانی ئارارات نشینەکان لەگلگامیشدا

ئامــاژەی داوە بە وڵاتــی ئــارەرات چەنــدە هۆشــیارو دانــاو لێـزان و خاوەنی داهێنان بونە یان ئاریەکان خۆ ئەوشوێنانە دیارە کوردستانی ئێســتایە بەس سـۆمەریەکان بەر لە چـوار هەزار ســاڵ لە هۆریەکـان جیابونـەتـەوە زۆر پێش زەردەشت بووە، کە دواتر بەڕوونی باسـم کـردووە، بـۆ ســەلماندنی ئەم گـوتەیەم، ئەوەتـا مەقـامە کوردییەکـان زۆربەیـان نـاوی هـۆری-یـان پێـوەیە، هـۆر واتـا خـۆر، لەم کتێـبەدا ئاماژەم بەو مەقامانە کردووە، کە پەیوەندییان بە خۆرەوە هەیە، هەر لەو ســەردەمەدا کۆشــک و تەلارســازیی و باڵەخـانە و پەرســتگای باشــیان بنیاتنــاوە و داهێنــانی باشــیان کــردووە، لەو ســەردەمەدا پەرســتگایەکیان بنیاتنــاوە لەســەر بەرزایــیەک کۆشــکەکەی پاشــا تۆپکەشیش بە تەنیشتییەوە بووە، نـاوی ئەم پەرستگایە کۆمـار بووە، لەســەر منــارەکەی نیشــانەی مانــگ و خــۆر هەبــووە، بێگومــان پەرستوویانە، ئەم مانگ و خۆرە هەتا ساڵی هەزارو نۆسەد و حەفتاو پێنج بەسـەر منـارەی مـزگەوتەکەی دێکەی خۆمـانەوە دەمبینـی، بۆیە زۆربەی ئاڵای وڵاتان ئەمڕۆش مانگ و ئەستێرەیە، بڕوانە بەریتانیـا و ئەمریکـا و تورکیـا و زۆر لە وڵاتـانی تـر ئەســتێرەیە (نووســەر). لە بنکورە ناوچەی خـانەقین، خەڵکی گەرمیـان هەتـا کۆتـایی حەفتاکانیش لە سەدا حەفتا پەیڕەوی زەردەشتیان دەکرد، وەکو کـەلتوورەکە، نەک وەک دینەکە، کـەلتوورەکەمان لە سـەدا حەفتـای مـابوو، زۆر بەداخەوە ئەگەر دوژمن دەسـتیان بەسـتین، ئەوا جاشـە کوردزمانەکـان دەسـتوو قاچیشیان بەستینەوە، زۆر ڕاستە کورد خۆی گوتەیەکی هەیە دەڵێت: ڕێوی لە کونی خۆی هەڵبگەڕێتەوە گەڕ دەبێت. بڕوانە کورد لە کوێوە گەیشـتووەتە کوێ، بەداخەوە بێگومـان، ... ئاینەکـانی پـێش زەردەشـت ئاوو، با، خۆر و ئاگریان پەرەستووە، بێگومان ئاگر سـەرچاوەی ژیـانە و هۆیەکی گەورەش بووە بۆ پێشکەوتنی تەکنۆلۆجیا، بۆ نموونە ئاگر، خۆر، نەوەوی و کارەبا هەر ئاگرن، ئەگەر ئەمانە نەبن، بێگومان ژیـان

دەوەستێت، واتا ئاگر ژیانی مرۆڤی پاراستووە و پێشی خستووە، ئەگەر لەپێشدا پەرستوویانە، لە پاشانیش هەر پیرۆز بووە، هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت، ئاشکرایە ئاگر لە چیاکانی زاگرۆسدا دۆزراوەتەوە و مرۆڤیش لەم وڵاتەی ئێمەوە گەشەی کردووە و بڵاوەیان لێکردووە، زاگرۆس واتا یەکەم جێگای زانینگای مرۆڤە، مرۆڤ لێرەوە زاووزێیان کردووە و زۆربوون و گەشەیان کردووە، بۆ نموونە لە کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکاندا دەڵێت: ئادەم و حەوا لە ئەشکەوتی هەزارمێرد دا بوون هەتا بوونەتە هەزار کەس، یان مێرد، بۆیە بە هەزار مێرد ناوی هاتووە، جا با ئەوەیش بڵێم لە سەردەمی یارسانەکاندا گوتوویانە کاتێک خوای گەورە ڕوحی ناردووە بۆ قاڵبە قوڕینەکەی باوە ئادەم، نەچووەتە بەدەنی ئادەمەوە، بە ئەمری خودای گەورە فریشتەکان میوزیکی تاریان بۆ ژەندووە، ئەوجا چووەتە لاشەکەیەوە، ئەگەر واش نەبێت میوزیکیان پیرۆز کردووە، بۆیە میوزیک پیرۆز بووە و پەرەی سەندووە و هەموو ماڵێک میوزیکی تیادا بووە لەبەر پیرۆزیی میوزیک، کە بۆ کاری ئاینی ئەو سەردەمە بەکاریان هێناوە، تا بووەتە فەرمی لە وڵاتدا، ئێستاش لە ڕۆژهەڵاتی کوردستاندا لەلای برا یارسانەکان ئەو نەریتە هەر ماوە، لە سەردەمی زەردەشتیشدا زۆرهانی گەلەکەی داوە ژیان بگوزەرێنن بە ئاهەنگ و میوزیکەوە تا دڵخۆشبن هەمیشە، بۆیە گەلی کورد هەمیشە دەوڵەتێکی خۆڕسک و پیشەگەر بووە و دەوڵەمەند و بێ گێرەو کێشە بووە، پێویستی بە شەڕ و شۆڕ و داگیرکاریی نەبووە، لەبەر خۆشگوزەرانیی زۆر پێویستیان بە میوزیک و ئاهەنگێڕان بووە، وڵاتانی تر و دینەکانی تر، لەبەرئەوەی هەر لەپێشدا نییەتیان داگیرکردنی وڵاتان بووە و زیاتر پێویستیان بە شەڕکەر و لەشکر بووە، جا بۆیە هەموو میوزیک و ئاهەنگێکیان حەرام کردووە، بەتایبەت بیابان نشینەکان تەنها کاری ئەوان فەرهودوو غەزوکردن

بووه لەبەر ئەوە خاوەنی هیچ شتێکی تر نەبون لەو بیابانانەدا کە هێزیشیان پەیدا کرد هێرشیان کردەسەر وڵاتانی دەوروبەریان و هەموویان تاڵان و قەتڵ وعامکردو کەلتوریانی سڕیەوە و لە پاشان بۆسەر دەوڵەتە دورە دەستەکان یەکەم یەهودی چونکە نزیکتربو لە هەمویان وەخاوەنی شارستانیەتێکی دوورو درێژ بووە سەد وبیست و چوارهەزار پێغەمبەر لەوانبووە زۆریش دەوڵەمەندبون و دووەم ساسانیەکان چونکە ئەوانیش زۆر دێرینن و زۆر بەهێزو شارستانی و دەوڵەمەندبون لە هەموو ڕوویەکەوە جا بۆ وڵاتانی ڕۆژهەلاتی ئاسیا و ئەفەریقا و بەرەو ئەوروپا کشان و ئەوەتا مێژوو باسی دەکات چیکراوە لەوانەی جەنگیزخان و نمونەکانیان کردیان جا ئەم وڵاتە جیاوازیی چیبووە لەگەڵ جەنگیزخاندا لە بارەی کورد یان ساسانیەکان خۆیان هاوکاریان بون لەو باوەڕەدا نەبون عەرەب هێرشیان بکەنە سەر ئەگینا خاوەنی هێزێکی زۆرو بەتوانا بونە لەوسەردەمەدا شەڕی قورسیش کراوە یەکێ لەوشەڕانە شەڕی فیل بووە هەندێک ململانێی ناوخۆی بووە جگە لە کێشمانکێشی کیشوەرەکە ،لە ڕویەکی ترەوە ساسانیەکان خۆیان ئامادە نەکردوە بۆشەڕ ، هاوپەیمان بون لە گەڵ عەرەبداو زۆریش خۆشگوزەران بون لەو کاتەدا پێویستیان بەماڵی کەس نەبووە، بەڵکو یارمەتی گەلانیشیان داوە بۆ پێشکەوتن، لەپێشتردا ئاماژەم پێداوە، (بڕوانە: کتێبی فیتنە، وەرگێڕانی م. سابیر) بۆ ڕاستی ودرووستی بڕوانە هەموو وڵاتانی ئەمڕۆ، هەموو بەشبەحاڵی خۆیان سوپا و چەک و چۆڵی خۆیان هەیە، کە لە خوارەوە ئاماژەم پێکردووە، جا لە دەیەها سەرچاوەی مێژوویی، ئاینی، ئاسمانی، کۆمەلایەتی و شوێنەوارەکاندا و هەتا زانست و جیۆلۆجیاش ئەم ڕاستییە سەلمێنراوە، ئەوەش ڕوون و ئاشکرایە، ئێمە لە نەتەوەی ئاری نەژادین،ئارییەکانیش ئەگەڕێنەوە سەرقۆناغی ئادەم وحەوا وەکو مێژووباسی دەکات واتا

ئەم وڵاتەی ئـێمە وڵاتـی ئاگرەکـان بـووە لە خـوارەوە لێـی دواوم مەبەسـتم دێریـنیەکەیەتی ئەوەش وەکـو بەڵگـە بڕوانە ئەم وێـنەیە شوێنەواری ئاگرە. وێنەی قـەڵایەکی ئاگـر لەسـەر بەرزایـیەکی وڵاتـی سەردەمی هۆریـیەکان، هەتـا کۆتـایی سـەردەمی ساسانیـیەکان وەکـو تەلەگرافێک بۆ ئاگاداری لە حاڵەتی خۆش و نـاخۆش بەکارهێـنراوە ئێستاش لەڕێگای سلێمانی گەرمیان ماوە  بەڵام خەڵکی وادەزانن هی سەردەمی تورکە هەتا تورکیش بەهەمان شێـوە بۆ هەمـان مەبەسـت بەکاریـان هێـناوە و لەو سەردەمەشـدا پێـویستیان پێـبووە. (بـۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: ئاڤێستا، یەسنا، بەشی دوو).



وێنەی قەڵای ئاگرە لە نێوان کەلار – دەربەندیخان کەدەوری تەلـەگرافی دەبینی لەکۆندا

وێنەی هەمان نەخشەی مزگەوتی ئاوایی حاجی خەلیل بەداخەوە کۆمەڵێ شرەخۆر ڕوخاندیان بەڵام ، لە ئاوایی ساڵح ئاغا لە بنکورە بەهەمان نەخشە، کە مانگ و ئەستێرەی لەسەر بووە، بەداخەوە ئەستێرەکەی نەماوە، ئەم مزگەوتانە هی سەردەمی تورکن، واتا سەردەمی ئیمپرا تۆری عوسمانییە، ئەم ئاینەش لە کوردەوە وەرگیراوە، واتە عوسمانیی دەستووریان ئیسلام بوو، بەڵام ڕەمزی ئاڵاکەیان هی سەردەمی مانگ و ئەستێرە پەرستییە، ئەوەش هی پێش میترایییەکانە لەسەرەوە باسم کردووە، بێگومان ئاڵاش گوزارشت لە سەرەتای ژیانی گەلێک دەکات.



مزگەوتی گوندی حەوشکوڕی بنکورە قۆرەتو لە خانەقین .

هەروەها هەورە برویسکەیان پەرستووە، بۆ زانیاری زیاتر (بڕوانە: کتێبی مێژوویی دێرینی کورد و کتێبی مێژووی بنەچەی کورد د.عەبدوڵلا دارتاش) بە وێنەو بەڵگەی زۆرەوە بۆت دەسەلمێنن، بێگومان هەریەک لەم ئاینانەش دابونەریت و هۆکاری خۆیان هەبووە، هەتا گەیشتووەتە زەمانی پێغەمبەر زەردەشت، کە خوای یەکتای بە مرۆڤایەتی ناساند، بەپێی مێژوو و کتێبە پیرۆزەکان و شوێن هەوارەکان بێت، هەر هەموو دینەکان پەرەپێدەری دینی هۆرییەکانن واتا خۆرپەرسەکان بڕوانە قورئانی پیرۆز دەڵێ ایبرایم پێغەمبەر سلاوی خوای لێبێت دەفەرموێت ئەمانەش خوانین؟ ئەم مانگ و ئەستێرەو خۆرو بونەوەرانە ئەمانە ئەبێ خوایەکیان هەبێ ئەوەش وەکو بەڵگە کەدینەکان تەواوکەری یەکن دینی ئێزدیش زۆر کۆنە، هەر هەمان دینی هۆرییەکانن بەپێی بەڵگەکان، بەلام هەریەکە و بەگوێرەی دەور و زەمان گۆڕاون وشتی نوێ داهاتون وخەڵکی هۆشیاربونەتەوە و زانای بەتواناتر سەریان هەڵداوە و قۆناغ لەدوای قۆناغ چوونەتە پێشەوە و کاریان بۆ پێشکەوتن کردووە وەکو ئەمڕۆ هەر دینەکانی ئێستاش نکوڵی لێ ناکەن، بەلام کەمێک دان بە دینی زەردەشت و هۆرییەکاندا نانێن چونکە بناغەی گشتییە ئەگەر ساغ ببێتەوە زۆرشت کاڵ دەبێتەوە بۆیە دەیانەوێ کەناری بخەن و زۆر ڕقیان لەو کەسانەشە بەدوای ئەومێژوەدا دەچن بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییە، حەزرەتی ئیبراهیمە، کە بنەڕەتی حەجەرول ئەسوەدی داناوە، بتەکانی هۆزەکانی عەرەبی گەیاندە ئەو ڕۆژەی خۆیان هەموویان شکاند، قورئانی پیرۆز دەفەرموێت ئەوگەوایە دەدات بڕوانە لە فیلم و دراماکانیشدا دیارە، بەتایبەت لە فیلمی ڕیسالە-دا کاتێک پێغەمبەر (ﷺ) دەگەڕێتەوە بۆ مەککە، دەیانشکێنێت،بەلام لێرادا پرسیارێک سەرهەڵ دەدات بڕوانە لەولاتی عەرەبیدا ماوەی چەن هەزار ساڵ بتپەرسی بووە و دەڵێن ئێمەنەوەی

حەزرەتی ئیبراهیم ین پێغەمبەر برایم خوا پەرسبووە باشە بەینی
پێغەمبەر ئیبراهیم و پێغەمبەری ئیسلام (درودی خودای لەسەربێت)
چەنێ بوە ئەبوایە لەسەردەمی حەزرەتی ئبرایمەوە بتپەرسی نەمایە
لەولاتی عەرەبیدا ؟ بەلام حەزرەتی ئیبراهیم بتەکانی نەمروودی
شکاند لە ڕوها لە باکوری کوردستان و هەلات بۆ ئەو ناوچانەی
میسر و فەلستین، یەعقوبیش نەوەی حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەرە،
هەتا پێغەمبەری ئاخر زەمانیش لە نەوەی ئیسماعیلە، کوڕە گەورەی
ئیببراهیم پێغەمبەر، باوکی هەموو پێغەمبەران (درودی خودایان لێبێت)،
ئەمانە هەموو بەڵگەن، لەوانەیە بڵێن ئەم نووسەرە دنیای کردووە بە
کورد، بەلام یەک شت هەیە لێرەدا، ئەویش ئەوەیە ئەگەر تۆ خاوەنی
خاک و ئاو و مێژوویەک نەبیت، بە من نالێیت شانازیی بە چیتەوە
دەکەیت، دڵ بە چی خۆش دەکەیت؟ بەلام ئەگەر دەتەوێت تێبگەیت،
بڕۆ مێژوو بخوێنەوە، یان هیچ پەلە مەکە تەکنۆلۆجیا هەمووی
ئاشکرا دەکات. ئیبراهیم پێغەمبەر پێش ئەوەی بگاتە لای عەرەبەکان،
دژی پاشا نەمروود وەستاوەتەوە، ئیبراهیم پێغەمبەر دەبێتە برازای
نەمروود، لە زۆر سەرچاوەدا وا هاتووە بەلام وانیە باوکی ئیبراهیم
بتی دروستکردوە لەلای نەمروود ئیبراهیم منداڵ بوو لەگەڵ باوکیدا
کاری دەکرد هەتا گەورەبوە ئەوجا تێگەیشت و بتەکانی شکاند و
ڕایان کرد بۆ لای کۆمەڵەکەی دایە ئایناناى نەیاری نەمرود لە
سەرەوە ئاماژەم پێداوە پاشا واتا نەمر. نەمروود کوڕەزای نوحە،
یان نوهە، یان نوێ کوڕی لامەخە، پایتەختەکەی نەمروود یەکەمجار
لە ڕووها بووە، لە پاشان نەوە لە دوای نەوە گەیشتوونەتە کەرکوک
و دەوروبەری لە خوارەوە زیاتر ڕوونم کردووەتەوە، جا
نەمروودیش لە نەوەی حامە، حام پادشایەکی زۆر مەزن بووە،
شاری بابل زۆر لە پێش مێژووی زاییندا ئاوەدان بووە، دیارە
حامییەکان ئاوەدانیان کردووەتەوە،بابل لەسەردەمی سۆمەریەکاندا

ئاوەدان بووە ویەکێک لەشارەکانی سۆمەربووە بڕوانە کتێبی عەشتار بەڵام ئاشووریـــیەکان بە ســـەرۆکایەتی نەبوخـــود نەســـر داگیریـــان کردووە و بۆ ماوەیەک حوکمیان کردووە، هەر لە سـاڵی (٥٨٧)ی پ.ز هێرشـــیان بـــردووەتە ســـەر ئۆرشـــەلیم و داگیریـــان کـــردووە و خەڵکەکەیان کوشت و بڕ کردووە و هەرچیشی مایەوە، هێـناویانن و لە بابل نیشتەجێیان کردوون، لە پاش ماوەیەک ئیمبراتۆری مادەکان کەیخەسـرەو، واتـا خەسـرەو بە مانـای خاسڕەوشـت، خاسـڕەو واتـا کـردار جـوان، چـۆن دەڵـێن تونـدڕەو، هەروا بـۆ کە-یەکەش بەمانـای کوێخـــا گەورەی ئـــاوایی، یـــان ســـەرۆک، ئەوەتـــا ئەمـــڕۆش بە ســـەرۆکەکانمان دەڵێـین کـاکە و مـــامە و ئەوەتـا کـورد لە هەمـوو ڕوویەکەوە بە هە مـــوو کەســـێک دەڵێـــت کـــاکە، لەبەر ڕێـــز و خۆشەویسـتی عەرەب نـاوەکەی گۆڕیـوە کردوویەتـی بە کەسـرە، یـان کســـرا، ئینجـــا کـــراوە بە کیـــا کســـتار، واتـــا کەیخەســـرەو زۆر لە ناودارەکـانی کـورد (کە)یـان پێـوەیە، وەکـو کەی قوبـاد، کەی کـاوس، کەیخەسرەو لەزمانی عەرەبیدا واتا سەیدی لەکوردیدا کاکە ، هەر ئەم کەیخەسرەوە شای مادەکان پەیوەندی خۆی لەگەڵ ئەم گەلانەدا پتەو کرد و ژن و ژنخوازیی لە گەڵیاندا کرد و پەیمانی دۆستایەتی پێدان، هەروەهـا دڵنیـای کـردن لە هەمـوو ڕوویەکەوە، ئەو گەلانەش ئەمـانە بـوون: بابلیـــیەکان، فیرعەونیـــیەکان، ئیلامییـــەکان، ئارامیـــیەکان فارســـەکان هەربـۆیە ژنیـــان پێـدان لە کـۆاتییە خیانەتیـان لێکـردن (ئیلامیـــیەکان و ئارامیـــیەکان) هەر کـورد بـوون، بەڵام پادشانشـین بـوون، واتـا کیـانی سـەربەخۆبوون، بە هەرحـاڵ هەر نەتەوەیەک لەم ناوچەیەدا بوو، هێرشی کردە سەر ئاشورییەکان و ڕووخاندنی، بەڵام زۆر لە سـەرچاوەکان دەڵـێن: بـێ یـارمەتی ئەوان و لەپێـش ئەوانـدا هـێرشی کردووە و ئاشـوری ڕووخانـدووە، ئەو هاوپەیمانییە بۆ ئەوە بووە هاوکاری ئاشـوریەکان نەکەن و لە دژی ئەم نەوەسـتن لەپاشـان

بــۆ مــاوەی زیــاد لە دوو ســەد ســاڵ حــوکمڕانی ئەم ڕۆژهەڵاتــی ناوەڕاسـتەی کـردووە و زۆریـش ئـارام و سـەقامگیر بـووە، لەپاشـان کردەوە ناشرینەکانی ئەستیاک و خیانەتی ئارپاک سەرکردەی سوپای ئیمپراتـۆرییەتی مـاد کەوتە دەسـت کۆرشــی هەخامەنشـی فـارس، کە کچەزای ئەستیاک بووە، هەتا ئەو کاتەش فارس هیچ کیانێکی نەبووە. ئەو دەوڵەت و هێـز و توانــا و دەســەڵاتەی پەیـدای کـرد بە گـردی دەوڵەتی ماد بوو، کە ئارپاک، سەرۆک وەزیرانی ئەوکاتەی ئەستیاک، کە بە مەبەست ڕادەستی کۆرشی هەخامەنشی کرد، لە ڕقی ئەوەی کە کوڕەکەی کوشت و گۆشتەکەی دەرخواردی ئارپاک دا. بەڵام پێم وابـێ زۆربەی دەگەڕێـتەوە بـۆ خیـانەت و چـاوچنۆکی و دەســەڵات پەرستی و خیانەتکاری ئەگینا ئەوباسـانەی کراوە دورن لەڕاستیەوە فـارس ئەو گەلە نەبـوو ببێتە خـاوەن هێـز و دەسـەڵاتی بـەو جـۆرە، ئەگەر خیانەتکـاری نەبـوایە کە دەسـەڵاتیش کەوتە دەسـتـیان جـوان پاراستیان هەتاکو ئەمڕۆ با ئەوەیش بڵێین بەڕاستی ئەوان سیاسەتیان کرد و سیاسی بوون، چونکە دەوڵەتی مادیان هەڵـلووشی و خۆیـان کـردە خـاوەنی ئیمپراتـۆری مـاد، کـورد ووتەنـی بە هەس و پۆسـەوە مادیان خوارد، بە داخەوە، بۆیە کورد هیچی بۆ نەمـایەوە، بەڵام زۆر لە ڕۆشنبــیران دەڵــێن؛ ئەگەر کــورد دەوڵەتــی هەبــووە، بـۆ هیچــی نەمـاوەتەوە؟ یەکەم شت کـورد دەوڵەتـی بە نـاوی کـوردەوە نەبـووە، ئەمە دەوڵەتەکانییەتی :

١- میترایی. ٢- گودی ٣- هۆری ٤ سۆمەری. ٥ ـ ماد . ٦ساسانی . ٧- ئیلامیــیەکان. ٨ ـ دەوڵەتـی پاڵەوانەکـان، واتـا پەهلـی، ئێـستاش شـوێنەواریان مـاوە. ٩- ئارامیـیەکان، ١٠ـ ئەشـکانیکان ئەم دەوڵەتـانە هەموکوردبون بەم ناوانەوە لە خوارەوە باسـم کـردون، ئینجا گۆران، چەنــدەها دەوڵەتــی تــر لەدوای ئەمــانەوە وەکــو: مەروانیــیەکان، شەدادیــیەکان، ئەیوبیــیەکان و دەیەهــا دەوڵەت و ســەدەها ئیمـارەت

هەبـوون، جـارێ لە قەڵای کەرکووکـدا بیستـویەک ئیمبراتـۆری حوکمڕانیـیان کـردووە، ئەوە سەلمێـنراوە لە مێـژوودا. تـۆ بە خـوێن گەیشـتوویتەتە ئێـرە، چەنـدەها نەتەوە لە مێـژوودا سـڕاونەتەوە. ئەم وڵاتەی تـۆ بسـت بە بسـتی قەڵا و شـار بـووە، نەک جارێـک، سـەدەها جار لەگەڵ خاکدا تەخـت کراوە و نوێکـراوەتەوە. خوێنەری بەڕێز... ئەم گەلانەی کە ئێسـتا لـێرەن، هیچیـان ئێـرە جێگایـان نەبـووە لە بنەڕەتـدا. ئەگەر هەرکەسـێک ڕەخـنە لە کـورد دەگرێـت، کـوا دەوڵەتەکەی؟ ئەوە بێنە بەرچاوی خۆت چەندەها دەوڵەت هەن لەناو عەرەبـدا، کە لە بنەڕەتـدا عەرەب نـین، منـیش دەڵـێم ئەی کـوا دەوڵەتەکـانی ئەوان، یەکەم دەوڵەتـی کـوردی گودیـیەکانە لە پـاش لافـاوەکە، باشـە گەلانـی دیـکە بنەڕەتیـان لە کوێـیە. بـۆ سـەر کـێ دەگەڕێنەوە؟ ئەی خـۆ ئەمـانە دەوڵەتیـان هەبـوو، چیـان لێهـات؟ بـۆ نموونە: ئاشـووری، بـابلی، کلدانی، گریک، قیبـتی، سـۆماڵی، سـودانی مەغریبـی ئێسـتا خۆیـان دەڵـێن ئـێمە عەرەب نـین ئێسـتا هەن وەکـو عەرەب، وەکو نەتەوەی خۆیـان لە بـنەچەدا نەمـاون، بەس نییە کورد ماوەتەوە وەکو نەتەوە، هەموو کەلـتوورەکەشی پاراستووە، سەرەڕای ئەم هەموو گەلەکۆمەیە، بەڵام کوردیش بێبەش نەبووە لەم دابـڕینی جوگرافیا و پاکتاوکردنی نەتەوەیە و گۆڕینی دیمۆگرافیای بەشێک لە وڵاتەکەی، دەتوانم بڵێم سنووری جوگرافیای خاکی کورد، ئاو بۆ ئاو بووە، کەچی ئێستا بڕوانە بە چاوی خۆت دەیبینیـت چۆن خاکیان لێ داگیر کردووین، ئێمە لە نوحەوە هێناومانە هەتا ئێرە، بۆ بەرچاو ڕوونی نەمرووود پاشا ئیمبراتۆری کورد بووە، کە لە قورئانی پیرۆزدا باسـی دەکـات، بـاو وباپیـرەمان دەیانگێـڕایەوە دەیـانگوت: خـۆی بە خـودا ناسـاندووە، خـودایش بە مێـشوولە کوشـتوویەتی، وایـان دەگـێڕایەوە خـۆ لە ناوەکەیـدا دیـارە، نەمـرووود واتـا نەمـر، خۆشـی گوتـوویەتی مـن نـامرم، مـن خـودام، ئەو نەمـرووودە کـوڕەزای نـوحە،

ئیبراهیم پێغەمبەر برازای نەمرووده وەک دەڵێن، لەزۆر سەرچاوەدا بەڵام وانیە لەسەرەوە باسم کردوە وا هاتووە ئێستاش شوێنەواری لە باکوور و لە باشووری کوردستان ماوە، بەداخەوە خوێنمژەکانی کورد هەموویان تەقاندەوە و لەناویان بردووە بە ناوی بیدعە و حەرامەوە، تەنها مەبەستیان سڕینەوەی کەلتووری کوردە و هیچی تر، کورد و نەتەوەی کورد وڵاتێکی خۆڕسکە لە نوحەوە پەرەی سەندووە و زۆر گەل و نەتەوەی لی جیابووەتەوە و بەناوێکی ترەوە دژایەتی بنەماڵەکەی، واتا کوردی کردووە و بۆ ماوەیەکی درێژ حوکمڕانییان کردووە و بە دەستوورێکی جیاوازەوە، بۆیە زۆر تێکەڵ و پێکەڵەیی هەیە، بگەڕێینەوە سەردەمی حام، کوڕە گەورەی نوح، واتا مامی نەمرووده، ئەمە خۆی لە خۆیدا دەردەکەوێت ئەم بنەماڵەیە کوردن، بەنیسبەت حامەوە حام کوڕە گەورەی نوحە، حام پادشایەکی مەزن بووە. لێرەدا پرسیارێک سەر هەڵدەدات، بەڵێ؟ ئەگەر حام پاشا بووە، واتا خاوەنی هێز و دەسەڵات و گەل و ناوچەیەکی بەرفراوان بووە، وەکو دەڵێن کوڕە گەورەی نوح پێغەمبەر بووە، پرسیارەکە لێرەدایە؛ باشە کەشتییەکە چەند کەسی تیادا بووە؟ وەکو قورئانی پیرۆز فەرموویەتی: هەشتا کەس بوون، چ زوو بوونە ئەم مەملەکەتە و ئەم پاشا و هێز و دەسەڵاتە کە حوکمی دونیای کردووە، بە بۆچوونی من، دەڵێم بە سەدەها جار ئەم ناوانە دووبارە بوونەتەوە، واتا ناوی پادشاکان، بەدڵنیایی ناوەکانیش گۆڕاون، ئەو ناوانە نین ئەو خەڵکە لەپێشدا هەیانبووە، ئەم مێژووە نەتەوەکانی تر نووسیویانە لە پاش هەزارەها ساڵ، بێگومان گۆڕانکاریی زۆریان بەسەردا هێناوە، چونکە شتەکە هەم کۆنە و هەم زمانی خۆیشیان نەبووە، یان یەک دوو حاڵەت هەیە، یەک لە بەرژەوەندیی گەلان خۆیان گۆڕانکارییان تیادا کردووە، هۆی دووەمی لە نەزانین بووە، یان زۆر لە دەستنووسەکان و

سەرچـــاوەکان لەکـــاتی شـــەڕو وێـــران کاریکانـــدا جـــگە لەهەزارەهـــا ڕووداوی سروشتی بەهۆی ئەم ڕوداوانەوە تیاچـون و ونبـوون، یـان ئەوەتـا هەزارەهـا کەشـتی دروسـتکـراون و مـن پـێم وایە نـوح، یـان جەمشید پاشا بووە، هەرچۆنێ زودزودرا کۆنترەو جمشیدوو نـوحیش ڕەت دەکـاتەوە بەڵام مـن هەر باسـیان دەکەم وەکـومێژوومن دەڵـێم هەروەکو پێغەمبەرەکـانی نەوەی ئیسرائیل هەموویان پاشا بوون و پێغەمـبەریش بـوون، بۆیە دەڵـێم جەمشید پادشـا، یـان نـوح، چـونکە پادشـــا بـــووە، بە یاســـا و بەزۆر کەشـــتی پـــێ دروســـتکردوون و خەڵکێکی زۆری ڕزگـار کـردووە ئاڤێسـتاش ئامـاژەی پـێداوە جارێ خـــۆ ئەوە  عەرەب ســـەری لە جیهـــان تێـــکداوە دوژمنـــی زانســـت ومێژوووە بەڵێ ڕاستە قـورئان ئامـاژەی پێـکردووە  ڕێزو پەرژینێ گەورە بۆ قورئانی پیرۆز قورئان بەکورتی ئاماژەی پێکردووە دیارە لەپێـــشدا لەم ناوچیـــەدا ژیـــان هەبـــووە و هەروەکـــو ئێـــستا ژیـــاون خۆقورئان یان تەورات باسی هەموژیانیانی نەکردووە  ئەمە پرسیارە دیـارە خەڵکانتـریش هەبـون و هەوڵـی خۆڕزگارکردنیـان داوە چـونکە دەستەوسـتان ناوەسـتن و خۆیـان بەئاسـانی ڕادەسـتی مـردن نـاکەن وئەو هەموو ئاوە زۆرە بەرز بوبێتـەوەو هەڕەشەی مردنیان لـێبکات لەو هەمو عالەمە خەڵکێکی کەم ڕزگـاربوبێتن  شـەرتنیە هەمویان لە یەکشوێـن کۆبـوبیتـنەوە دەکرێت لە شوێنـی تـر لەشـاخی بەرزتـرو دورترڕزگاریـــان بوبێـــت خـــۆ مـــەرج  نـــیە هەمـــو کـــورەی زەوی کەوتبێـــــتە ژێـــــرئاو وەک لەســـــەرەوە ئامـــــاژەم پێـــــکردووە هەر دەریاچەکـــان و شـــاخ ودۆڵەکـــان پڕبـــون و لەپاشـــماوەیەکی کەم سـاڕێـژیان کـردووەو خاڵیبونەتـەوەو ڕێڕەوی خۆیـان کـردۆتەوەو تـەمومژ نەمـاوەو ژیان ئاسـایی بۆتەوەو بەپـێی زەوی ناسـیش بێـت واتا جیۆلۆجیا بڕوانە زەوی ئەو شایەتیـەت بۆدەدات گـەربەجوانی لێی بـڕوانی ئیـترئەوڕۆژە دەبێـتە خاڵی دەست پێـکردنەوی ژیـانی

سەرلەنوێ بابزانن هەرلەو ڕۆژەشەوە کورەی زەوی سەقامگیردەبێت بپرسن لەخۆتان ئەوهەمو ئاوە بۆکوێ چون لەپاشان زەوی چۆن تایمی گرت ڕونتر ئاماژەم پێکردوە لەسەرەوە بەڵام زۆرشت عەقڵ قبولی ناکات و دەستورو یاساش چی داناوە ئەوەیە دەبێت ملکەچی بیت ئەمرۆ بێگومان خەڵکی زۆر ڕزگار بوون، بەپێی ماوەی مێژووەکە بێت لەو سەردەمەوە بۆ ئەمرۆ کەمەو مرۆڤ زۆر زۆرە بۆیە دەڵێم ئەبێ خەڵکی زۆر ڕزگاریان بوبێت لەو سەردەمەوە تائێستا خۆی دەدا لە حەفتا هەزار ساڵ و بگرە زیاتریش، بێگومان لێرەدا دەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە لە زۆر سەرچاوەدا هاتووە پاشا نەمروود فەرمانڕەوایی جیهانی کردووە، جیهانیش ئەوکاتە بریتی بووە لە حەوت شاری گەورە، هەمووشی لە ئاسیادا بووە، بەتایبەت لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بووە، نامەوێت زۆر بەردەوام بم لەسەری، لەم کتێبەدا لە زۆر شوێندا باسم کردووە و ڕوونم کردووەتەوە. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: تەورات و ئەو سەرچاوانەی ئاماژەم پێکردوون لە خوارەوە).
پاشا نەمروود یەکەم دەوڵەتی دامەزراندووە لە شاری ڕووها، لە باکوری کوردستان، لە نوحەوە گەیشتوونەتە ئەوێ، لەوێوە دەستی کردووە بە دامەزراندنی دەوڵەتداریی و دروستکردنی بتپەرستی، لەو کاتەوە گەلەکەی بوونەتە دوو بەشەوە، بەشە خودا پەرست و سروشت دۆستەکە کەخواکەیان خۆربووە، کە خەریکی کشتوکاڵ بوون ولەترسی نەمرودا داویانە بە شاخەکاندا، ئەوانەی کە نەنە ئانانا ڕێبەریان بووە، ئەو ئێزدییانە بوون کە ئێستایش لە شوێنی خۆیانن و پێغەمبەر ئیبراهیمیش لەسەر بیروباوەڕی ئەوان بوو، واتا لایەنگری دایە ئانانا بووە و لە پاش چەندەها سەدە لە ئەفسانەی سۆمەرییەکان و بابلییەکان، وەکو خودای چاکە و ئەنکی کوڕیشی وەکو شەیتان باسکراوە، کە ئەنکی کوڕی نەنە ئانانا بە فیتی نەمروود و کچەکەی

چوو بە زۆری زۆرداریی نەنە ئانانا و کۆمەڵەکەی بهێنێتە شارەوە، بۆئەوەی کۆیلەیان بکات، ئەوە بوو نەنە ئاناناش ڕازی نەبوو و هانی جوتیار و خەڵکەکەی داوە ڕوو بکەنە چیا سەختەکانی کوردستان، دیارە لەو کاتەدا خەڵکەکە خۆریان پەرستووە، چونکە خۆر سەرچاوەی ژیان بووە، هەموو بەرهەمێکیش بە تیشکی خۆر بەرهەمهاتووە، بۆیە دینەکە و ئالاکەشیان خۆر بووە. ئالای ئیسرائیلیش پێموابێت گوزارشت لە خۆر دەکات، چونکە هەمان بیرباوەڕی حەزرەتی ئیبراهیمە، بڕوانە مێژووی دەوڵەتی هۆریکان و دابونەریت و ئەفسانەکانیان، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکان و کتێبی تووندوتیژی و پیرۆزیی و سێکس لە میتۆلۆژیای ئیسلامیدا)، کە چۆن باس لە ئەفسانەی دایە ئانانا و ئەنکی دەکات لە سەردەمی سۆمەرییەکاندا، کە پێش چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا لە هۆرییەکان جیابوونەوە، هەر لەوێوە پێغەمبەر ئیبراهیم بتەکان دەشکێنێت و جیا دەبێتەوە و هەڵدێت بۆ شاخەکانی دەوروبەری شەنگال و لەوێشەوە بۆ ڕۆژهەلات و لەوێشەوە بۆ خۆرئاوای عێراق و هەتا گەیشتە میسر و ئیسرائیل لەگەڵ کۆمەڵەکەی و لوتی برازایدا، لەپاشان جیا دەبنەوە و هەریەکە و ناوچەیەک ئاوەدان دەکەنەوە و خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی دەبن، گەلەکەی لوت لە دۆڵێکدا دەبن، بەنداوێک دروست دەکەن و بەنداوەکە دەشکێت و هەموویان لەناودەبات، (بڕوانە کتێبی: نەتەوە ونبووەکان)، جا هەریەکە و بۆ خۆی ئەفسانەیەکی بۆ دروستکردووە و ڕۆژگاری خۆی پێ بردووەتە سەر، زۆر لە سەرچاوەکان دەڵێن: پێغەمبەر ئیبراهیم هەر زەردەشتە،بەڵام وانیە لەسەرەوە ئاماژەم پێکردووە لە پاش ئەو جیابوونەوەیە نەمروود پەرەی بە ئیمپراتۆرییەتەکەی دا و نەوەکانی گەیشتنە قەلای کەرکوک، لە کەرکوک بیستویەک ئیمبراتۆری حوکومڕانییان کردووە، بەتایبەت پادشا نەمروود، هەمیشە لە هەموو

کـۆڕ و دانیشـتنێکدا شـێرێک و هەڵـۆیەکی لە ئەمـلا و ئەولای خـۆی دادەنـا، ئێسـتاش پەیکەرەکانیـان مـاون لە بـاکووری کوردسـتان، لەنـاو ئالاکەشیدا هەردوو ڕەمزەکە هەبووە، واتا شێرەکە و هەڵۆکە هەر ئەم ئالایە کە ئێستا هەمانە و دەستکارییان کردووە، بەڵام عەرەب شێر و هەڵۆکەشیان بردووە، واتا ئەم وڵاتانەی چواردەورمـان هەمـوو دیـن و نەریتێکی ئێمەیان فەرهـود کـردووە، ئەم پادشـایە پادشـایەکی کـورد بـووە زۆر بەزەبـرو زەنـگ بـووە لە بـاکووری کوردسـتان بـووە، ئێسـتاش شـوێنەوارەکەی هەر لە بـاکووردا مـاوە، چـونکە شـوێن هەواری کوردە، حکومەتی فاشیستی تورک پشتگوێی خستووە، بەڵام لە پاشـان پـایتەختەکەی گوێـزراوەتەوە بـۆ کەرکـوک، ئێسـتاش لە وێنەکەدا دیارە. پێغەمبەر ئیبراهیم و لـوتی برازای لەگەڵ زارای، یـان سـارای خێزانیـدا، کە دەکـاتە خوشـکی لـوت، واتـا خێزانەکەشـی هەر برازایەتی، هەم خوشکیشێتی، بۆ نموونە بەندە گوێم لێبوو لە ڕادیـۆی گەلـی کوردسـتان، کە سـورێن نـاتق کتێبێکـی دەربـارەی سـەردەمی نەفەرتیتی دەخوێندەوە، کاتێک نەفەرتیتی دەدەن بە براکەی؛ کە غەیرە نەریتی فیرعەونییەکانە، نەفەرتیتی حەزی لێ ناکات، دەڵێت ئەم نەریتە هـی قیبتییەکـان نییە، واتـا میسرییەکان، هەرچۆنێک دەڵێن نەفەرتیتـی کـوردە لەوسەردەمەشـدا نەوەکـانی یەعقـوب حوکـومی قبتیەکانیـان دەکرد دیارە هەمان نەریتی ئیبراهیم پێغەمبەرە، دیارە لەو سەردەمەدا وا بـاو بـووە هەتـا سـەردەمی یەعقـوبیش ئەو نەریـتە هەر بەردەوام بـووە، چـونکە یەعقـوبیش دوو خوشـکی بە یەکەوە خواسـتووە، کە یەعقوب کوڕەزای ئیبراهیم پێغەمبەر بووەو لە باکوری کوردستانەوە هاتون بەرەو خوار،



ئەم ئاڵایە ئاڵای سەردەمی پێشەوا (قازی محمد)ە
گۆڕانکاری تیا کراوە لەسەر هەمان ئاڵا کۆنەکە

لەدەست ئەم پادشایە سەری خۆیان هەڵدەگرن و دەگەنە وڵاتی قبتییەکان و فەلەستینییەکان و بۆ ماوەی چوارسەد ساڵ حوکمڕانیی ئەو وڵاتانە دەکەن، هەتا سەرهەڵدانی موسای پێغەمبەر، ئیتر لە فیرعەونییەکان جیادەبنەوە، ئەویش لە پاش شەڕێکی خوێناویی، وەک گوتمان ئیبراهیم پێغەمبەر برازای، یان برازازای نەمروودە، بەڵام لە کتێبی پیرۆزی ئێزدییەکاندا دەڵێت: ئیبراهیم کوڕی پەیکەرتاشێکە، کە لە لای پادشا نەمروود کاری کردووە، بۆیە ئیبراهیم توانیویەتی بە ئاسانی بڕوات و بتەکان بە تەور بشکێنێت و هەڵاتووە بەرەوخوار، لەوێ و لەو گەلە بەنی ئیسرائیل دروست بوون و هەموو

پێغەمبەرەکـان لە نەوەی ئەم پیـاوەن. (بـۆ زانیـاری زیـاتر، بـڕوانە: مەسحەفەڕەشی ئێزدییەکان).

بەڵـێ، کەواتە هەمـوو پێغەمبەرەکـان لە نەتەوەی ئیسـرائیلن (بە پێغەمـبەری) ئیسلامیشـەوە درودی خـودای لێبێـت، کەواتە هەمـوو دینەکـان و پێغەمبەرەکـان دەگەڕێنەوە سـەر کـورد، ئەوە سـەلمێنراوە ئەمڕۆ لە زۆر سەرچاوەدا دووپات کراوەتەوە، منیش لەم کتێبەدا زۆر دووپـاتم کـردووەتەوە. بە بۆچـوونی مـن، شۆڕشـی لە دژی نەمـروود کـردووە، ئیبـراهیم پێغەمبەرکـوڕی پەیکەرتاشـەکەی نەمرودبـووە ، ڕێبـازی پێغەمـبەر ئیبـراهیم هەمـان دینـی ئێـزدی بـووە، بەڵام ئەم بیروبـاوەڕی پێشـکەوتووتر بـووە. نەمـرووود مەنجەلیقـی بـۆ دروستکردووە بۆ لایەنگرانی، هەرچی لە لایەنگرانی ئیبراهیم پێغەمبەر گیـراون بە کـۆمەڵ سـووتێنراون، چـونکە دیلەکـان بە هـیچ شـێوەیەک تەسـلیمی بیروبـاوەڕی نەمـرووود پادشـا نەبـوون و لایەنگرانـی ئیبراهیمیش زۆر گیراون، لەبەرئەوەی ئاگر پیرۆز بووە و ژینگە پیس نەبێت، بـۆیە بە کـۆمەڵ هەموویانیـان سـووتاندووە، لەلایەکـی تـرەوە وەکو چۆن بڵێیت تاوانبارن و گوناهکارن ئەوەتا نوری خودا تۆڵەیـان لێـدەکاتەوە، نمـوونەی ئەم بۆچـوونەم لە ئاڤێستاشـدا هـاتووە و لە هیندستانیشـدا هەتـا ئێسـتا مردوو دەسـووتێنن، دەڵێن بـا ژینگە پیس نەبێت، چـونکە خـاوەنی بیروبـاوەڕێکی وا بـوون لایەنگرانـی ئیبـراهیم پێغەمـبەر ملـکەچ نەبـوون بـۆ هـیچ یاسـایەک، بـۆ نمـوونە وەکـو تونـدڕەوەکانی ئەمـڕۆ، کەواتە ئیتـر سـودیان لـێ نەبینیـون، بـۆیە سـووتاندوویانن، هەر ئەم مەنجەلیقە بـووە نەریتێک بۆ گەلانـی تـری وەکو ئاشوورییەکان، کە کچ و کوڕی کوردیان بە کۆمەڵ دەسـووتاند کاتێـک بە دیـل دەگیـران ، ئەم نەریـتە بـاو بـوو هەتـا سـەرهەڵدانی مادەکـان و ڕووخانـدنی ئاشـوورییەکان، بەڵـێ ئێسـتا دەڵـێن لەبەرئەوەی پیـرۆزە کە حەزرەتـی ئیبراهیمـی نەسـووتاندووە، زۆر

لەپـــێش ئەو ڕووداوەشـــدا ئـــاگر لەلای هۆریەکـــان و زەردەشـــتی پیرۆزبـووە، لەلای زۆر لە خەڵکـی ئەو سـەردەمە پیـرۆز بـووە، بەڵام پیرۆزیـی ئـاگر زۆر لەوە کـۆنترە ئەگەر بگەڕێیـتەوە بـۆ دۆزیـنەوەی ئـاگر، کە سـەردەمی میترایییەکـان بـووە، لەو بـاوەڕەدام ئەوە بـۆ یەکەمجـار بـووە ئـاگر دۆزراوەتەوە ئەگەڕێـتەوە بـۆ سـەردەمی بـاوە ئادەم، پێم وابێت لە چیاکانی زاگرۆسیشـدا بـووە کاتێک دۆزراوەتەوە، بە بۆچوونی من و زۆرێک لە سەرچاوە و لە زانایان و تەکنـەلۆژیاش، ئەوەیان سەلماندووە لەپێش جەمشیدیشـدا، یان نـوح-دا بـووە، چـونکە لە ئاڤێستادا دەڵێت: نوح هەر جەمشیدە، لە سـەردەمی نوحـدا خـاوەنی عەقڵ و هۆشـی تەواو بوون، چـونکە ئـاگر دەگەڕێـتەوە بـۆ سـەرەتای مرۆڤـایەتی، ئەوە سـەلمێنراوە، ئەی کەشـتییەکە بە چـی دروسـتکراوە، پێویستی بە قیر و ئـاگر نەبـووە؟ ئەوەش بەڵگەیەکی تـرە بە کوردیـان گوتـووە ئارێکـان، یـان وڵاتـی ئاگرییەکـان، بـڕوانە چەنـد وڵاتـی ئـاری نەژاد هەن، زۆر فـیلم و دراماشـــی لەســـەر کـــراوە، لە دۆزیـــنەوەی سودێکی زۆریان لێ بینیوە، بۆ نموونە وەکو کارەبای ئەمڕۆ، ڕزگاری کـردوون لە نەهـامەتی بەفـر و بەسـتەڵەک و تـاریکی و کرچوکـاڵی خواردن و هەر ئاگریش بووە هۆی ئەوەی ماددە خاوەکان بدۆزنەوە و بەکاریـان بهێـنن بـۆ کـاری ڕۆژانەیـان، لە پاشـان گەیشـتە وڵاتـانی دەوروبەر، کە لە بـواری: ئاسـن، مـس، زێـڕ، زیـو، سـوورکردنەوەی خشـت و کـوپەڵە و دروسـتکردنی شمشـێر و سـەدەها شـتی تـر لە پێویسـتییەکانی ژیـان بەکارهـاتووە، تـا گەیشـتووەتە ڕادەی پەرسـتنی ئـاگر، هەر لە ئاگریشـەوە بیـرۆکەی خوداپەرسـتی هـاتووەتە ئـاراوە، هەرچـی پەرسـتراوێک بـووە کـورد قەدەغەی نەکـردووە، هەروەکـو ئێسـتای هیندییەکان ئاشکرایە بـۆ جیهـان پێنج سـەد دیـانەتی تێدایە، بەتایبەت لە سـەردەمی زەردەشتدا. زەردەشت پێی وا بووە بیروبـاوەڕ بە زۆر ناچەسـپێندرێت، چونکە لە ئاڤێستادا هاتووە، دەڵێت: قەت زۆر

له كەس نەكراوە، چی بپرسن و چی نەپرسن، مرۆڤ زۆر ئازاد بووە له هەڵبژاردنی دین و تەنانەت هاوسەریشیدا. ئەگەر هەر دەوڵەتێک، هەر ڕێکخراوێک بەرنامەیەكی چاک دابڕێژێت له بەرژەوەندیی گشتیدا بێت، یان لەخزمەتی مرۆڤایەتیدا بێت، بێ سێ و دوو مرۆڤەکان هەڵیدەبژێرن، بەڵام بەپێچەوانەوە، كار گەیشتە زۆر، مانای وایە له بەرژەوەندیی تاكلایەنێكدایە، بۆیە ئاژاوە و بشێویی دەكەوێتە وڵاتەوە، دین و دیانەتیش خۆڕسكانە هاتووە، هەروەها ئەوەش لەیاد نەكەین با، لافاو، باران، بەهار، زستان، ئاگر، هەورەتریشقە، مانگ، ئەستێرە و خـــۆر هەرهەمـــووی خـــودا بـــوون، هەریەک لەبەر هـــۆیەک و له ســەردەمێكدا پەرســتراون، وردە وردە هەموویشــی گـۆڕدرا و بـووە خـــودای یەكتـــا، هەموویشـــی نیعمەتـــی خـــودایە و ڕوونـــاكییە كە گەیشـتووەتە سـەردەمی خۆرپەرسـتی، گوتوویـانە ئەم خـۆرە نـوری خودایە، هەتا ئەمڕۆش كە سەردەمی مەسیح و ئیسلامە ئاخر دین و ئاخر پێغەمبەرە، هەر دەڵێن خودا نورە، كەوابێت هەموویان له یەک سـەرچاوەوە هـاتوون بـوونەتە هـۆی دۆزینـەوەی خـودای تاقـانە، بە بۆچوونی من؛ سەردەمی ئیبراهیم پێغەمبەر، سـەردەمی خۆرپەرستی بـووە، ئـاڵاكەی نەمروود پادشـا خـۆر بـووە، كە گوزارشـت بـووە له خوداكەیان، ئەم دیـن و دیـانەتە له هۆرییەكانەوە هـاتووە، شـەڕەكەی ئیبـراهیم پێغەمـبەریش لەسـەر گـۆڕینی نیـزامەكە بـووە، واتـا دیـن و دەستوورەكەی، ئەو سـەردەمەی نەمرووود پادشـا نەمرود ویسـتویەتی بیكـاتە پتپەرسـتی بەڵام ئیبـراهیم پێغەمـبەر بتەكـانی شـكاندووە خۆم دەڵێم ئیبراهیم ناوی ڕاستی خۆی نییە، دەبێت ناوێكی تری هەبووبێت، وەكـــو له شـــــەرەفنامەی شـــــەرەفخاندا دەڵێـــت لەلای گەلەكەی خۆشەویسـت بـووە، بـۆیە گوتوویـانە بـرایمە، واتـا وەكـو برایـان، خۆشیانویسـتووە، واتـا ئەمە نـاوە ئەسـڵییەكەی نیـیە، ئەم نـاوە له دینەكەیەوە هاتووە، دەڵێت دینی من دینی ئاشتی و برایەتییە، بۆیە بە

ئیبـراهیم نـاوی هـاتووە، لە زۆر سـەرچاوەدا دەڵـێن ئیبـراهیم هەر زەردەشتە، لە سەرەوە باسم کردووە، هەروەکو نوح پێغەمبەر چۆن زودزودرا بووە کراوە بە نوح، نوحیش لەنوێوە هـاتوە لە ئاڤێستاشدا هاتووە دەڵێت: نوحیش جەمشیدە کردوویانە بە نوح، ناوی نوحیش لە ژیانە نوێکەوە هـاتووە، نـاوی برایمیش نـاوی سەفایە . سەفاو مەروا لەنـاوی ئەوەوە هـاتوە کـاتێ هـاجەرەو ئیسماعیلی لەو شـوێنە بەجـێ هێشتە هـاجەرە ڕجای لێکردە بەجێیان نەهێڵێ گوتویەتی سەفامەڕۆ بـۆیە ئەوجێیە ئێسـتا نـاوی سـەفاو مەروایە لە خـوارەوە بە ڕوونـی باسـم کـردووە، مـن زیـاتر مەبەسـتم لە سـەرچاوەی داهێنانەکـانە و دەستپێـکردنی ژیـانی مرۆڤـایەتییە، بیرکردنەوە لە داهێـنان و خـودای یەکتا، خاوەنی هەموو ئەمـانەیە، بۆ زانیـاری زیاتر ئیبراهیم پێغەمبەر لە شاری ڕوها لەدایک بووە، واتا شاری ئۆرییەکان، یان هۆرییەکان، هەمـان دیـن و مەزهەبی هۆرییەکانن، شـارەکانی کوردسـتان ئەوکاتە زۆربەی بە ناوی دینەکەوە بووە، تەنانەت شاری حەڕان لە ڕۆژئـاوای کوردســـتان بەر لە ســـێ هەزار ســـاڵ نووســـین و شـــوێنەواری زەردەشتی بەسـەر دیوارەکـانی شـاری حەڕانەوە بـووە، لە خـوارەوە ئامـاژەم پێ کـردووە، لەپاش خۆرپەرستیدا چییـان پەرستووە، وەکـو مانـگ و ئەسـتێرە و زۆرشـتی تـر لەپـاش خۆرپەرسـتی زەردەشـت سـەری هەڵداوە و خـوای یەکتـای بە مرۆڤـایەتی ناسـاندووە، بێگومـان ئێزدییەکانیش لەپێش زەردەشتەوە خوداپەرست بوون، بڕوانە شـاری حەڕان، بەر لە سێ هەزار سـاڵ شـوێنەواری زەردەشـتی پێـوە بـووە، دیـارە لەپیشـدا هـۆری بـوون بە بۆچـوونی مـن دەڵـێم شـاری خۆریـان بووە و لە زمانی عەرەبیدا بووەتە حەڕان،

مێــژوویش ســـەلماندوویەتی بەر لە ســـێ هەزار ســـاڵ ڕۆژیـــان پەرستووە، واتا خـۆر، یـان هـۆر، زۆرجاریش لە حیکـایەت و ئەفسـانە کۆنەکاندا گوێم لێبووە باسی شاری حۆریانیان کردووە، بێگومان هەر

هەمان شاری حەڕانە کە باسی دیموکراسی و جوانیی کچانی دەکەن، بۆیە دەتوانم بڵێم شاری هۆریان بووە، یان خۆریان دیارە ناوی حۆریەکانی بەهەشتیش لە ناوی کچانی ئەمشارەوە هاتوە ئیبنول حەڕانیش کە یەکێک لە پێشەواکانی دینی یەزیدی، یان ئێزدی بووە، لە پاشان بووە پێشەوایەکی دیاری دینی ئیسلام، هەر خەڵکی ئەم شارە بووە. ئەم شارە لەلایەن ئەبو موسلیم، کە سەرکردەیەکی کوردی خەڵکی خۆرسانی ئێران بوە لەسەردەمی  ئیسلامدا بووە، هێرشکراوەتە سەری و وێرانکراوە، کە ناسراوە بە ئەبو موسلیمی خۆراسانی، خەڵکی خوراسانە، کوردە و دەوڵەتی عەباسی دامەزراند و لە پاشانیش لەلایەن خەلیفە مەنسور ئەبو جەعفەری عەباسیوە. کوژرا  هەر خۆی نایە سەر تەختی خەلافەت ئەو سەردەمە عەرەب یاسایەکی دانابوو غەیرە عەرەب چەندە پلە و مەقامی دینیشی بەرز بێت، نابێت ببێتە خەلیفەی موسڵمانان، بە بیانووی ئەوەی دەبێت یەکێک ببێتە خەلیفە لە بنەماڵەی ئالو بەیت بێت، کەچی لە سەردەمی دەوڵەتی ئەمەویدا ڕیشەی ئالوبەیت و هاوەڵانی پێغەمبەریان (ﷺ) دەرهێنا، ڕێگایان بە ئەم نەدا ببێتە خەلیفە، چونکە خاوەن هێز و توانا بووە، حەز ئەکەم ئەوەش ڕوون بکەمەوە هەرچۆنێک لە شوێنی تریش باسم کردووە، دەڵێن باڵوڵی داناش هەر خوراسانییە و لە سەردەمی ئەبو موسلیمدا بووە و دەمی نەوەستاوە و تانە و تەشەری زۆری داوە لە خەلیفە، خۆ گوێتان لە وتەکانی باڵوڵ بووە، گەیشتووەتە ئەو ڕادەیەی لەناوی بەرن.غەزالی کە ئەویش هەر کوردە، ئاری نەژادە و ئێرانییە، ئەمانە هەموویان لە مۆغەکانی زەردەشتی بوون، خوێندەوار و خوداپەرست بوون، عەرەبیان فێری نووسین و خوێندن کرد و قەومی عەرەبیان خستە سەر سکە و خۆشیان کردە قوربانیی عەرەب، ئینجا زانیویەتی دەیکوژن دڵی بۆ باڵوڵ سووتاوە و پێی گوتووە خۆت بکە بەشێت، با بڵێن تێکچووە و

وازت لێبهێنن، به چاوی خۆت نەتبینی چییان به ئەبو موسلیم کرد، لەناو کۆشکدا خەڵتانی خوێنیان کرد، بۆیە باڵوڵیش خۆی دەکاتە شێت و دەمێنێتەوە باڵوڵ ناوی عومەرە و خۆراسانیە ، هەرچەندە کەمێک لە باسەکە دوورکەوتینەوە، شاری حەڕان بە هەڕانیش ناوی هاتووە لە مێژوودا، هەمان شاری حەڕان لە سەردەمی ئەداد نێراری ئاشووریدا لە ساڵی (١٢٨٠)ی پ.ز هێرشکراوەتە سەری و وێران کراوە. (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی: تەتەڵە، مامۆستا شاسوار هەر شەمی).

بەڵێ لەپاش هۆرییەکان یەزدان پەرستەکان هاتن، واتا ئێزدییەکان بوون بە جێگرەوەی هۆرییەکان و تەواوکەری هۆرییەکانن، ئەمە لە باکووری کوردستانەوە ئێزدییەکان، واتا یەزدان پەرست، یان خوداپەرست، هەر بۆیە عەرەب بە شەیتان پەرست تاوانباریان دەکەن لەوکاتەدا، لەو سەردەمەدا زۆربەی گەلان بە خودایان گوتووە زیویس، یان دێویس، واتا هێزێکی غەیبی بەتوانا وەکو دەڵێن دێو دێویش غەیبیەو خوای گەورەش خاوەنی غەیبە وخاوەنی تواناو هێزە بۆیە وتویانە یەزدان واتا هێز ئەبەخشێ ئێزیدیەکانیش بەخوا یان گوتوە زێویس یان دێویس خەڵکانیتر وایان زانیوە دێودەپرسن شەیتانیش بریتیە لەدێو لەکۆتاییدا کردیانن بەشەیتان پەرس خۆیان یەزدان پەرسبون نازانم لەدوایدا گۆڕانکاری کەوتبێتە مەزهەبەکانیانەوە چونکە هەموو دیانەتەکان مەزهەبی زۆریان لێ جیابۆتەوە وەکو دەیبینین هەرلەو کاتەوە ئیبراهیم پێغەمبەر درودی خودای لەسەر بێت کە دژی بتپەرستی وەستایەوە، شەڕی لەگەڵ نەمروود کرد، لەسەرەوە باسم کردووە، ناوی باوکی ئیبراهیم پێغەمبەر ئاگرە، واتا ناوێکی دینی سەردەمی ئارییەکانە، ئاگرە، ئازەریش واتا ئاگر، ئەرمینیا و ئاترۆپاتیان واتا ئازەربایجان، هەمان مانای ئاگر و ئارییەکان دەگەیەنێت. لە شوێنێکی تردا هەر لەم کتێبەدا

ئاماژەم پێکردووە، دیارە ئەم ناوەش لەسەر مەزهەبی ئارییەکان، واتا ئاگرپەرستەکان ناونراوە، زمانەکەشی زاراوەی کرمانجی سەروو بووە. زمانی بەنی ئیسرائیل کە دەکاتە نەوەکانی ئیبراهیم پێغەمبەر، زۆر نزیکە لە کرمانجییەوە، ئێستاش منداڵەکانیان بە باوکیان دەڵێن بابۆ، یان ناوەکانیان لە کۆن و ئەمڕۆشدا ئاشکرا دیارە کوردییە. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: تەوراتی پیرۆز).
دەمەوێت ئەوەش ڕوون بکەمەوە، ئەوەی لەنێوان ئیبراهیم پێغەمبەر و نەمرودا ڕوویدا، لە سەردەمی موسا پێغەمبەریشدا لە پاش چوارسەد ساڵ دووبارە بووەتەوە بە هەمان دەستوور و هەمان ڕێباز و هەمان بیروباوەڕ، بە چ شێوەیەک ئیبراهیم لە نەمروود جیابووەوە و دوورکەوتەوە، موسای پێغەمبەریش بەهەمان شێوە لە ڕەمسیس جیابووە لەسەر وەسێتی باوباپیرانی بەرەو ناوچەی فەلەستین بەڕێکەوتون و هەر ئەوێیش بووە شوێنی هەمیشەییان هەتاکو ئێستا ، حەز دەکەم خوێنەر و ڕۆشنبیرەکان باش ئەوە لێکبدەنەوە بۆنمونە کاتێک حەزرەتی یوسف دەچێتە میسرو دینەکەیان دەگۆڕێت فیرعەونی سێهەم ناوی خۆی دەگۆڕێ و دەیکاتە ئەخناتون واتا خوای خۆر یانی دەبێتە خۆرپەرست خۆیان بت پەرست بون لەپاشان حەڤدە ساڵ شەڕوشۆڕو قاتوقڕی و گرانی دەبێت لەبەینی کاهنەکاناو دەسەلاتدا شەڕەکەش بەنەمانی دینە تازەکەو ئەخناتون کۆتایی دێت بۆزانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی سینۆهە دکتۆری فیرعەونەکان ئیبراهیم پێغەمبەر پیاوێکی خودا پەرست بووە و خاوەنی ئاینێکی بەرز بووە، بێگومان خۆشەویست بووە لەناو خەڵکەکەیدا، بێگومان گەلەکەشی ئاستێکی باشیان بڕیوە لە ڕووی زانیارییەوە لەو سەردەمەدا، بۆیە دەتوانم بڵێم ئەم گەلە خاوەنی بیروباوەڕ و ئاینی جیاجیا بوون، ئەم ئاینانە میوزیک و ئاوازی تایبەت بە خۆیان هەبووە، (بڕوانە: مێژووی دەوڵەتی ساسانی و کتێبی مێژووی

ئیمپراتۆری ماد لەو سەردەمەدا)، هیچ بۆنەیەک بەبێ میوزیک نەبووە، چ فەرمی و چ نا فەرمی، بۆیە میوزیک و مەقام و ئاواز لە پلەی باڵادا بووە، هەموو مەقامێک و ئاوازێک و دەزگایەک بۆنەی خۆی هەبووە، بۆیە هەریەک بە ناوی بۆنەکەی خۆیەوە بووە، بۆ نموونە مەقامی خورشیدی لەو سەردەمەدا زیکری خۆریان پێکردووە، ئێستاش ناوی خورشیدییە، کەچی عەرەبەکان حیجازیان لکاندووە پێوە گوایە لە حیجازەوە دەرچووە، دڵنیام دەزانم حیجاز هەیگازە، عەرەب کردوویەتی بە حگاز، پاشان کردوویانە بە حیجاز، چونکە ئەوان پیتی (گ) گۆ ناکەن. هۆرەش بەهەمان شێوە لە خوارەوە ئاماژەم پێکردووە، عەرەبی وڵاتەکانی تر ئەم مەقامانە نازانن، بەڵام عەرەبی عێراق ئەویش زۆربەکەمی دەیزانن، چونکە عێراق لە ژوور و خواروە هاوسێی کورد و ئێرانن، عێراق موڵکی عەرەب نەبووە، ئێمە لەگەڵ فارسدا یەک کەلتوورمان هەیە، ئەویش لە بنەڕەتدا هی ئێمەیە، بۆیە عەرەبی عێراق ئاشنان بە کەلتووری ئێمەی کورد، ئەویش نەک گشت مەقامەکان، بێگومان بە شێوازی خۆیان دەیڵێن زۆریش جیاوازن لەگەڵ مەقامە کوردییەکاندا، بۆ ئاگاداری لە ساڵانی چل و پەنجاکاندا هەموو میوزیکزان و مەقامبێژەکانی بەغدا یەهودی و کورد بوون، ئاشکرایە یەهودییەکان زۆربەیان لە کوردستاندا بوون، چونکە کورد وەکو خۆیان چەوساوە بووە؛ ڕێزیان لێدەگرتن، ئێستاش لە ئەرشیفەکاندا توانای هونەرییان دیارە لەڕادەبەدەرە، ئەمرۆ هیچ شتێک شاراوە نییە، بۆ هەموو ئەم گوتانەی من، دەتوانن بڕۆنە سەر پەیج و نووسراوەکان لە فەیسبووک، لە کەناڵەکان، لە ڕۆژنامەکاندا سەرچاوە زۆرن، من پێم وایە ئەم نیشتمانەی ئێمە سەرچاوەی ئەرشیفی گۆی زەوییە، وردە وردە خۆی هەمووی دەردەکەوێت کە ئێمە کێین، بەڵێ نموونە زۆرە بیهێنمەوە بۆ سەلماندنی کەلتوورەکەمان، چوار هەزار ساڵە ئەم دەوڵەتانەی دەوروبەرمان

فەرهەودی ئێمە دەکەن لە هەموو ڕوویەکەوە، هێشتا نەیانتوانیوە بمانسڕنەوە وەک چۆن وڵاتانی تریان سڕیوەتەوە، بۆ نموونە وەکو قبتییەکان، میسری ئەمڕۆ و بەشێک لە کیشوەری ئەفەریقا و چەندەها وڵاتیان کاولکرد و داگیرکرد بە خۆیان و وڵات و کەلتووریانەوە، هەمویان هەڵلوشین خوێنەکەشیان بۆنی ئێمەیان لێدێت، کەچی ئێمە بە زاراوەی خویان دەزانن، یان بە دێو و درنجمان لەقەڵەم دەدەن، بە هەموو پێوەرێک لێکیدەرەوە هەرچییەکیان هەیە لە ئێمەوە وەریان گرتووە، بۆیە دەیانەوێت بمانسڕنەوە تا هەموو شتێک بۆ خۆیان ساغ ببێتەوە، زۆربەی زانا ئیسلامییەکان لە بنەڕەتدا کورد و غەیرە عەرەبن، وەکو: ئیبنول کەسیر، ئیبنول خەلەکان، ئیبنول شەهرەزوری، ئەبو موسیلمی خۆراسانی، ئیبن ئەلحڕان، ئیبن ئەسیر و هەتا سەلمانی فارسی و بوخاری و غەزالیش وتەبەریش هەر عەرەب نین ودەیەها وەکو سەلاحەدینی ئەیوبی ئەمانە هەرهەموویان زەردەشتی بوون لە پێشدا بەهەمان دابونەریتەوە با ئەوەش بڵێین هەموو عەرەب نەیانتوانی قودس ڕزگار بکەن، سەلاحەدین ڕزگاری کرد، هەتا باڵولی داناش ناسراوە بە باڵولی ماهی واتا ماهی دەشت ناویشی عومەرە و خەڵکی خوراسانە لەوێش لەدایک بووە، غەزالیش دوو ڕەگە باوکی فارسە و دایکی تاجیکییە، (بڕوانە: مامۆستا ئەیوب ڕۆستەم، کتێبی (ئازگار)).

عەرەب هەتا سەردەمی سەرهەڵدانی ئیسلام خوێندەوارییان نەبووە، کەچی کردویانن بەخاوەنی مێژوو و شارستانییەت هێشتا ئەوان لەم سەردەمەشدا کورد بە کافر و دواکەوتوو دەزانن، بەڵام کۆیلەکانیان بەیانی تا ئێوارە بە سەر و گوێلاکی کورد کوژەکاندا هەڵدەدەن لەبەر تێرکردنی ورگیان، هەموو کەسێک ڕاستییەکە دەزانێت، بەڵام لە ترسی جاش و نەفام و ناحاڵییەکانی کورد ناوێرن هیچ دەربڕن، بەڵام شوکر ئێستا زۆر کوڕی ئازا پەیدا بووە، کە مەردانە چاکی

بەلادا کردووە، هەرچی لە ژێر بەرەدایە دەیخاتە سەر بەرە، بە پشتی زانست و تەکنۆلۆژیا هەرچی گوتەی پڕوپووچ هەیە هەمووی هەرەس پێدێنێت و نانبڕاوی دز و قۆڵبڕ و تاریکپەرستەکان دەکات، دەوری عەقڵگەرایی دەسەپێنێت بەسەر هەموو جیهاندا، چونکە کورد خاوەن وڵات و داهێنان بووە، خۆشی بووە هەموو کاتێک، چونکە پێشەواکانییان هانی داون کە هەموو کاتیک شایی بگێڕن و خۆشحاڵ بن بۆئەوەی ژیان بە سوکی و ئارامی بگوزەرێنن و ژیانیان قورس نەبێت، خودایش پێی خۆشە عەبدەکانی خۆشحاڵ بن و یەکتری نەکوژن و نەبنە کێشە بۆ یەکتری هەتا (پێغەمبەری) ئاخرزەمانیش محەمەد سەلات وسەلامی خوای لەسەربێت هەمیشە هانی خەڵکی داوە بۆخۆشییەکانی ژیان بەڵام لە شەرع ودین دەرنەچێت و بەئەدەبەوە ڕێگرینەکردووە لەخۆشی وکامەرانی مرۆڤەکان لە چوارچێوەی ئیسلام  چونکە ئەگەر ڕێگریت لە مرۆڤ کرد لە خۆشیی ژیان، دەبێتە درندە، ئەوە خۆشییەکانی ژیانە مرۆڤ بە ئاگادێنێتەوە، بەپێچەوانەی دینەکانی ترەوە تەنها  بەترس وخەیاڵ فێری پەیڕەوانی دەکات، هەر خۆی بە ڕاست دەزانێت، هەموو زانستێک ڕەت دەکاتەوەو تەنها بۆچونەکانی خۆی لاپەسەندەو بەڕاستی دەزانێ هەموشتێکیان لەچوارچێوەی دین ومەزهەبەکەی خۆیاندا قەتیس کردووە  بۆیە هەمیشە دوور بوون لە پێشکەوتن و داهێنان لە هەموو ڕوویەکەوە، بەتایبەت هونەری میوزیک و گۆرانی، کورد و پێغەمبەرەکەی و دینەکەی هەمیشە لەخزمەتی خۆشگوزەرانی مرۆڤایەتیدا بوون، بە ترس و زۆر کەسیان ڕانەهێناوە، گەلەکەیان فریو نەداوە، وڵاتیان لەسەر ڕاستی و دۆستایەتی و خۆشەویستی و یەکسانی و پاکی وژینگەدۆستی و ڕێزگرتن و بە کرداری جوان بنیات ناوە، ئێستاش مرۆڤایەتی لەسەر پەیڕەو و بەرنامەی زەردەشت پێغەمبەر دەڕۆن، هەموو جیهان قەرزاری پێغەمبەر زەردەشتن کە

قەوانینی مرۆڤایەتی داناوە هەرچەندە نەیگوتووە من پێغەمبەرم، کە خاوەنی میللەتێکی دڵفراوان و بێ خەم و بێ کێشە بوون، بۆیە هەمیشە خەریکی ئاهەنگگێڕان بوون، بۆیە ئەو هەموو میوزیک و مەقام و داهێنانەی کردووە لە بواری کەلتووری و کۆمەڵایەتی و بوارەکانی ژیانیاندا. من لێرەدا پرسیارێک لە خوێنەری بەڕێز دەکەم، مەقامێک بەر لە پێنج هەزار ساڵ بەلای کەمەوە ناوی خورشیدی بێت، کە هەر لە تەبەقەی حیجازە، بە گوتەی ئەمڕۆ، بەڵام پەیوەندی بە گاتاکانەوە هەیە، مەقامی گاز، یان هەیگاز، بۆ چی ئێستا پێی دەڵێن حیجاز، هەرچۆنێک ئاماژەم پێکردووە، مانای چییە، لە خەڵکی وایە بە مانای لە حیجازەوە هاتووە، بەڵام خورشیدی واتا خۆر زیکری خۆری پێکراوە، ئەوەش دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی هۆرییەکان، یان میتراییەکان، کە لەپێش زەردەشتیشەوە بووە، میتراییەکان گوتوویانە نوری خودا لەناو ئاگر و خۆردایە، بۆیە خۆر پیرۆز بووە لەلایان و ناویان دەرکردووە بە هۆرییەکان، تا گەلی ئالای خۆر، هەربۆیە خۆریان کردووەتە ئاڵای خۆیان، هەروەها ئەو بیست ویەک پەڕەیەی خۆرەکە کە لەنێو ئاڵاکەدایە، هێمایە بۆ بیست ویەک ئیمبراتۆری، ئەو ئیمبراتۆرییانەش لە قەڵای کەرکوک و دەوروبەریدا بوون، ئێستاش ناوەکانیان و ماوەی حوکومڕانییان بە دەقیقی لەلای من دەست دەکەوێت بە وێنە و مێژووەکەشییەوە. (بڕوانە: مێژووی بنەچەی کورد، د.عەبدوڵڵا دارتاش). مامۆستا شاسوار هەرشەمی و زۆربەی ئەفسانەکان و مێژووەکان هەرهەمویان ئەوە دەسەلمێنن هەروەها من دەمەوێت چەند بەڵگەیەک وەک نموونە بۆ کۆنیی ئەم نیشتمانە دێرینەی خۆم بێنمەوە، کە خاوەنی زۆر داهێنان بووە، کەوا ئێستا بەداخەوە نەوەکانی شانازیی بە شتی بێگانەوە دەکەن و وا دەزانن خۆیان خاوەنی هیچ نەبوون، من بۆیە ئەم بەڵگانە دەهێنمەوە بۆ سەلماندنی ئەو هەموو داهێنانە کە دامانهێناون، بەداخەوە بوو بە

مـولّکی بێگـانه له هەمـوو ڕووەکـانەوە، لـەماوەی پێشـودا سـەنتەری شوێنەوارناسـی جیهـانی، گـوێم لێبـوو باسـی قەڵای هەولێری دەکـرد، گـوتی: پێدەچێت یەکەم ئـاوەدانی بێت لەسـەر ئاسـتی زەویـدا ، بەڵـێ هەولێـر کـۆنترین شـاری هۆرییەکـانە و زۆر بەئاشـکرا شـوێنەواری زمـانی زەردەشـتییان پێوە دیـارە، دەتوانین لەم وشـەیەوە دەسـت پـێ بکەین، گاز واتا بانگەواز، ئەوەتا خۆیان دەڵێن گازیکە، واتا بانگی بکە، باشە گاتاکانیش واتا بانگەواز لەم کتێبەدا لە شوێنی تر بەڕوونـی لێـی دواوم، هەر لەم ماوەیەی پێشـودا لە میدیاکانەوە باسـی مۆنـۆمێنتێکی بەردین دەکەن لە بەریتانیا، شتێکی زۆر نامۆیە، کۆمەڵە بەردێکە زۆر سـەرسـوڕهێنەرە، کە وەکـو منـارەیەک وایە، بەرزیـیەکەی چـوارپێنج مەتر دەبێت، بڕوانە لەخوارەوە .



وێنەی قەڵای هەولێر

پانییەکەشـی دوو مەترێـک دەبێـت، یەک پـارچەیە، نـازانن لە کوێـوە هێناویـانە و چـۆن هێناویـانە، دەڵـێن ئەم کـۆمەڵە بەردە مێـژووەکەی دەگەڕێتەوە بـۆ پێنج هەزار سـاڵ بەر لە ئێسـتا، ئەم بەردانە کـۆمەڵی کورد هێناویانەتە ئێرە، تاشیویانە و دایانناوە لێرە، بۆیە دەتـوانم بڵێم بنـاغەی هەمـوو داهێنانێـک لەم وڵاتەی مـنەوە داهـاتووە، ئەمە دەمـارگیریی نییە، خەڵکی ڕۆشـنبیر بـۆ خـۆی گەواهـی ئەو ڕاسـتییە دەدەن، ئەمـڕۆ میـدیاکان شـەرم لە کەس نـاکەن هەمـوو شـتێک بە جوانی پیشان دەدەن، بەهۆی تەکنەلۆژیاوە هەموو ئەوانەی تەعریب و تەفـریس و تەتریـک کـراون، ئاشـکرا دەبـن، ڕووی داگیـرکەران و جاشەکانیشیان ڕەش دەبێت، بۆیە من بە شانازییەوە دەڵێم:

یەکەم: میوزیک و ئاواز و مەقام پێش ئەوەی موڵکی هەر گەلێک بێت، مـوڵکی کـوردە و لەم وڵاتەوە داهێنـراوە و بەرەو چواردەورمـان بـڵاوەی کـردووە، گەر بەڵـگەی ڕاسـتت دەوێـت نـاوی زۆربەی مەقامەکان کوردین، دیارە بۆ چ مەبەستێک گوتراون.

دووەم: شـێوازی گوتنەکەیـان و مێژووەکەیـان زۆر زۆر لە نـاوە بێگانەکان کۆنترن.

سێیەم: خۆ ئێستا میدیای جیهان شاراوە نییە، کوا لە چ وڵاتێکدا ئەم مەقامانە دەگوترێت، وەکو: ئەڵڵاوەیسـی، قەتـار، خـاوکەر، خورشـیدی ، حەیـران، سـیاچەمانە، ئۆرفە، ئـای ئـای، هـۆرە، خەنەبـاد و نەهاوەنـد، دیارە لەم شارە دانراوە کە شارێکی باشووری کوردستانە.

مەقـامی ئەڵـوەن، ئەم مەقـامە کە هونەرمەنـدی گەورەی کـورد خـوادای عەلـی وتـویەتی لە داهێنـانی ئەو گەلەن کە لەسـەر ئـاوی ئەڵـوەن ژیـاون بە درێژایـی ڕووبـاری ئەڵـوەن، کە سـەرچاوەکەی لە چیاکانی زاگرۆسەوە دێتە خـوار بەرەو ڕووبـاری سێڕوان (سـیروان)،

ئەڵـوەن هەم هـۆزە و هەم تیـرەن، هەم نـاوی ڕووباریشــە، زۆر لە تیرەکانی بە ناوی وەنداوییەوە هـاتووە، ئەڵوەن بە واتـای تیژ دێت، مەبەســت لە تیژیــی ئــاوی ئەڵــوەنە، حەز دەکەم بــزانن، زۆربەی مەقامەکان بە نـاوی شـارەکان و ناوچەکـان و بۆنە ئاینییەکانی گەلـی کـوردەوەن لە هەمـوو سـەردەمەکانیدا، هەر ئەوە بـۆ خـۆی بەڵـگەی حاشاهەڵنەگرە و چەندەها مەقامی تر هەن ئەگەر بەپێی مێژووەکەیـان لێکیبـدەیتەوە ئەم مەقامـانە دەبـنە دایکـی هەمـوو مەقامەکـان، ئەگەر بڕوانیتە قورئانی پیرۆز، ئایەتی نوح، سڵاوی خوای لێبێت، نەک هەر مەقـام لێـرەوە داهێنــراوە، بەڵکـو ســەرەتای مرۆڤـایەتیش لێـرەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەوەتا نووسینەکان و شوێن هەوارەکان شایەتی دەدەن و من بەڵگەی زیاترم لەبەر دەستە، بۆ نموونە قورئانی پـیرۆز باســی زۆر ڕووداوی کـردووە، کە زۆربەیـان لە کوردسـتان بـوون، دەمەوێـت بەڵگەیەکـی زینـدووی تـریش بهێنمەوە، بـڕواننە میـوزیکی ئـازەری چەنــدە لە کـوردییەوە نـزیکە، بـۆچی نـزیکە؟ ئەگەر ئەوان تورکن، ئازەر واتای چی؟ ئازەر، واتا ئاگر، کە ناوی بـاوکی حەزرەتـی ئیبراهــیمشە، واتـا لە نەتەوەی ئـارین، ڕاسـتییــەک هەیە دەمەوێت بە بیــرتانی بهێــنمەوە لە ســاڵی (١٠٢٩)ز بــۆ یەکەمجـار دەســتەیەکی چەکداری تـورک زمـان بە دەسـتی میر وەهسـۆدانی کە پادشـایەکی کـورد بـوو، هێـنانی لە نـاوچەیەکی ئاترۆپـاتـیان، یـان ئازەربایجـان نیشـتەجێی کردن، بۆ لێدانی پاشـاکانی تـری کورد و ئاترۆپاتیان، کە پادشاکانی تر شکستیان هێنا، خۆی بە تەنها مـایەوە، تورک زیادیـان کـرد و وردە وردە بـوونە خـاوەن دەســەڵات لــە هەمـوو ڕوویەکەوە دەسـیان گـرت بەســەرناوچەکەداو تەتــریکی ناوچەکەیـان کـرد و هەموویــان گــۆڕی لە بەرژەوەنــدیی خۆیــان، ئاترۆپاتیــان بــووە ئازەربایجان. ئازەربایجان بە مانـای ئاگرپارێز دێت، لەسـەرەوە باسـم کردووە، هەمـوو ئەوانەی پارێزگاریـیان لە وڵات دەکرد، ڕاونران ئەو

بنەماڵانە دەرکران و دەریانپەڕاندن، یەکێک لەوانە ماڵی سەلاحەدینی ئەیوبی بوو کە دەریانپەڕاندن لە ئازەربایجان، بە داخەوە ئێستا هونەرمەندان و ڕووناکبیرانی کورد دەڵێن هونەری ئەم دوو هونەرمەندە بەرزەی کورد نەمر مامۆستا (محەمەدی ماملێ و حەسەن زیرەک)ی مەزن لە ئازەرییەکانەوە وەریان گرتووە، ئەوە ئێمە نەبووین چووین بۆ دەوروبەری قەفقاز، ئەوە تورک بوو هاتە سەر ماڵ و کەلتووری ئێمەی کورد، هەرشتێکیان نەزانیبێت لە ئێمەوە فێربوون، بەداخەوە ئەوان هیچ نەبوون و هیچیان نەدەزانی، جگە لە پیاوکوژشتن و کاری تالانکاریی، کەچی خۆیان هەمیشە گەورە ڕادەگرن، لەگەڵ ئەوەشدا کورد خاوەنی بەشێک لە ئاسیا بووە، هەر پێی خۆشە خۆی بچووک بکاتەوە لەلای دوژمنەکەی، هەر بۆیە سەرنەکەوت، مەسەلەیەکم بیرهاتەوە؛ پێشینانمان گوتوویانە: کوڕی ئازا ماڵی بۆچییە و کوڕی خوێڕیش ماڵی بۆچییە، بەڕاستی هەموجارێ کوڕی خوێڕی هەموشتێکی لەناوبردووە مەخابن. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: م .شاسوار هەرشەمی، کتێبی تەتەڵە). ئەمە هۆی چییە؟ هۆکەی دیارە نەخوێندنەوەیە، بەتایبەت مێژوو، لەمێژە کورد بە ئاگری گوتووە ئایەر، لە هەورامانیدا ئێستاش هەر دەڵێن ئایەر، زۆر لە هۆز و تیرەکانی تریش لە کوردەواریدا هەر بە ئاگریان گوتووە ئایەر، یان ئار، ئاهر، ئێستاش دەڵێن ئایەر، لەخۆڕا نەیانگوتووە گەلانی ئاری نەژاد، باسمان کردوون لەپێشدا. بۆ ئەم ڕاستییەش (بڕوانە: مامۆستا هەژاری موکریانی، لە چێشتی مجێور)، کە دەڵێت چووم بۆ ئەورووپا، وابزانم لە نەمسا بووە، کە کۆنفرانسێکی ئاشتیخوازانە سازکراوە بۆ نەتەوە ژێردەستەکان، منیش بەشداربوم لەوێ، کە سەرەی من هات، زۆر بەدڵگەرمیی لەسەر کورد تێهەڵچووم، خەڵکانێک هەبوون وەکو شوعییەکان پێیان ناخۆش بوو، چونکە من بە ناوی ئەوانەوە گەیشتبوومە

ئەوێ، پێیان خۆش بوو بە ناوی ئومەمییەوە وتار بدەم، پیاوماقوڵانی ئازەری لەوێ دانیشتبوون، لەناو ئەوانیشدا هەبوو پێی ناخۆش بوو من لەسەر کورد قسە بە داگیرکەرەکانی کوردستان دەکەم، کە یەکێک لەوانە حکومەتی فاشیستی تورکیایە، منیش لە وەڵامدا گوتم: ئینجا ئێوە بۆ پێتان ناخۆشە؟ خۆ ئێوە کوردن و بەزۆر کراون بە تورک لە سەردەمی ئیمبراتۆری عوسمانیدا، نوێنەرەکەیان گوتی: وەڵا بابە تۆ زۆر ئازایت، ئێمە ناوێرین، یانی ڕاستییەکەی وایە، بێگومان بۆ ماوەی پێنج سەد ساڵ کەم نییە، تورک لە سەردەمی بەناو خەلیفەی ئیسلامەوە لەکاتی عوسمانیدا حوکمی ئاسیا و بەشێک لە ئەفریقا و تەواوی وڵاتە عەرەبییەکانی دەکرد، لە ماوەی ئەم پێنج سەد ساڵەدا هەرچییان ویستبێت بۆ خۆیان، کردیان و گۆڕییان و ناویاننا و قەدەغەیان کرد، بڕوانە هەموو ئەم وڵاتانەی ئاسیا هەر ناوێک دەبیستی قەرەیەکی پێوەیە، بەڵام عەرەب بەهۆی سەربەخۆییەوە زۆریانی گۆڕیوە، تورک هەر بۆ خۆیان ئەم ناوەیان لە چەند شاخێکی ئەم وڵاتەوە پێوە لکاوە، کە یەکەمجار لەوێ نیشتەجێ ببوون، بۆ نموونە من پێشتریش باسم کردووە، سەرگوزشتەیەک هەیە دەڵێت: ئەمانە کڵاوێکی قوتیان لەسەردا بووە لە شێوەی ئەو قوتانە، کە قوتەکان ناویان دوورک بووە، گوتوویانە ئەمانە دەڵێی دوورکن، ئیتر ناویان بە دوورک دەرکردووە، لە پاشان بووە بە تورک ئەمە بۆچونێکە ، ئەگینا ئەمان خۆیان لە خێڵی مەغۆل و تەتارن، لەوانەیشە هەر لە تەتارەکەوە هاتبێت نزیکترە، تورک کورتکراوەی تەتارە، ئەسڵەن لە دەوروبەری قەوقازەوە هاتوون بۆ ئەم ناوچەیە. ئێستا بەداخەوە زۆر لە هونەرمەندانی کورد دەڵێن: ئەم گۆرانییە، یان ئەو مەقامە هی ئازەرییەکانە، ئەگەر هی ئەوانیش بێت، هەر دەگەڕێتەوە بۆ کورد چونکە ئەوناوچەیە ڕەسەنترین

ناوچەی کوردەواریە. برای من، خوێنەری ئازیز، تازە ئەگەر هەموو دونیا موڵکی کورد بووبێت، چی لە دۆخەکە دەگۆڕێت؟ بەڵام زۆر پێویستە خۆشەویستیت هەبێت بۆ خاک و ئاو و کەلتوور و مێژووی گەلەکەت، وڵاتت بپارێزی، وڵات و نیشتمانەکەت خۆشبوێت و خۆشەویستی بکەیت لەبەر چاوی نەوەی ئەمڕۆ و داهاتوو، چونکە خۆشەویستی لە هەموو چەکێک بەهێزترە، خۆشەویستی ئێمەی گەیاندووەتە ئێرە، ئەوەشی لەدەستچووە، بێ خۆشەویستی لەدەستی داوە، بێگومان زۆر باش بزانە، بڕوانە ئەم بەڕێزانە چۆن ئەم کەلتوورەیان پاراستووە و لەبیریان نەکردووە و داویانەتە دەستی ئێمە، ئەوەتا بەزیندوویی ماوەتەوە تا ئەمڕۆ هەر زیندوو، دەبێت ئێمەش بەدوای شتە دزراوەکانماندا بگەڕێین و هەمووی ساغ بکەینەوە، چونکە ناسنامەی هەموو گەلێک کەلتوورەکەیەتی، ئەگەر ناسنامەکەیان لێسەندین، یان ناسنامەکەمان ونکرد، ناتوانین ئیتر لە هیچ کوێ بلێین، هیچ بەهایەکت نییە، گەلی بێ ناسنامە وەک مردوو وایە، بۆیە هەموو داگیرکەرێک چوبێتە هەر وڵاتێک، ناسنامەکەی دەسڕێتەوە ئێمە هەتائێستایش هەرداگیرکراوین نابێتە ڕەگەزپەرستی ئەگەر بەرگری لەمافەکانی خۆمان بکەین خۆ وڵاتانی سۆسیالست و ئاشتیخوازانی دونیایش سنوری خۆیان هەیەو بەرگری لە مافەکانی خۆیان دەکەن وجوگرافیا وسنورو گەلەکەیان دەپارێزن لە زۆر ڕووە خزمەتی مرۆڤایەتیش دەکەن چونکە خاونی خاک و ئاو و سەربەخۆن و ئازادن ئەوەش بە هەوانتە دەستیان نەکەوتە ئازیزم کەچی ئێمە ماڵەکەی خۆمان بەجێدێڵین ؟ هۆکەی چیە بێ دڵسۆزیە نابێ لەمڕۆژەدا وەکو وڵاتانی سۆسیال دیموکرات بیربکەینەوە خۆجیهان نەبۆتە یەک نیشتمان هەتا دوایی ، هەر لەم کاتەدا بەپێویستم زانی کە خەریکی نووسین و پیادا

چوونەوەی ئەم کتێبەبم، ئەم شایەتییەش بدەم، کە خۆم بە چاوی خۆم بینیومە نالێم ڕێزیان لێنەگرتووە بەڵام لەکاتی ناشتنەکەیدا حەقی خۆیان پێنەدا بەتایبەت وەزارەتی ڕۆشنبیری لقی هونەرمەندان ، بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە لە میدیاکانەوە کە تەرمی هونەرمەندی گەورەی کوردیان برد بۆ گۆڕستانی گردی سەیوان بۆ ناشتنی، هونەرمەندی ئاوارە و دەربەدەری شاری کرماشان، یان گەرمیان شاری ڕۆژهەلات، کاک سمایلی سابووری، کە پەنجا ساڵ بێوچان گۆرانی بۆ میللەتەکەی وتووە، بەداخەوە لەکاتی بەڕێکردنی تەرمەکەیدا بۆ سەرقەبران لە ڕۆژی (٢٠١٩/٦/١٧) لە سلێمانی، کە ڕۆژێک پێشتر گیانی سپاردبوو، جگە لە چەند هونەرمەندێکی کەم، کە بە پەنجەی دەست دەژمێردران، کەسی تری بەدواوە نەبوو لە شاری سلێمانیدا لەپاشانیش هیچ مەڕاسیمێکی فەرمیان بۆسازنەکرد ، ئێ خۆ ئەو هەر لەبەر کوردبوونی بێ ئازادی ئاوارە بوو، چۆن وڵاتەکەی ژێردەستەیە، ئەوە حاڵی بوو، ئەمە بەڵگەیەکە بۆ ڕێزنەگرتن لە هونەر و کەلتووری نەتەوەکەت بۆچی چونکە لەژێر کاریگەری ئەفوینی ڕەگەزپەرستان و داگیرکەراندا لە هەمو ڕویەکەوە کاردەکەن بۆنەهێشتنی ئەوانەی تۆیان هێشتۆتەوە خۆیشیان هەتابێت بەهێز دەبن بەناوی سەروەری و مافی وڵاتان و نەتەوەیەوە خوێنی گەلانی هەژارو بێهێزەکان دەمژن لەژێر کاریگەریی فیکری جیاجیادا ئەمڕۆ کودردستان لەهەموو جۆریکی تێدایە بەفیتی داگیرکەران، ئاوەها دەتوانێت لەناوت ببات و هەموو شتە موقەدەسەکان و ڕەسەنایەتیت کە پایەیەکی ئەزەلیەو کۆڵەکە و بناغەیی مانەوەو ژیانتە کاڵ دەکاتەوەو هەتا لەناوت دەبات ئەوەتان بیردەخەمەوە ئێستا باس وخواسێک هەیە دەڵێن کەلتورزیندووکردنەوە کۆنەپەرستیە و کارکردنە بۆ گەڕانەوە بۆ دواوە کە چی هەمووخەڵکیان بردۆتەسەر کەلتورەکەی خۆیان

وبەهێزیانکـردووە و کەلتـوری میللەتانـیان لە ناوبـردووە یان بـە تەواوەتی کاڵیان کردۆتەوە ئەوەتا هەموو گەلان پەیڕەوی کەلـتوری ئەوروپا و ڕۆژئاوایی دەکەن ئێمەی کوردی قوڕبەسەر  تەنها شتێک مابێت وەکو کەلتوری مێژوویی نەورۆزە مۆرکی کوردی ڕەسـەنی پێوەیە کە لەگەڵ پێغەمبەر نوح دا هاتووە بەهەموو توانایەکیانەوە دەیانەوێ بەناوی مەجوسیـەوە یان حەرامەوە لەناوی بەرن وایان لەخەڵـکی کـردووە زۆربەی خەڵـک یەکەم ڕۆژی نەورۆز دەرناچـن بەڕاستی ئێـمە ئەنـفال و کیمیـاباران کرایـن و هەرچی نەدەکرا، پێـیان کـردین، زیادمـان کـردووە و کەممـان نەکـردووە، بەڵام خراپترینیان ئەنفالی ڕوح ومێشکمانە لەژێر ئەفکارو بەرنامەی جیاجیادا لـەهـەمـو بوارەکـاندا هەمویشی بۆنەهێشتنی کوردو ناوو نەتەوەی کـوردە هەربەڵێندەرێکیـش پشکێـکی بەرکەوتەو کـاری بۆدەکات ئەمەش بەتایبەت ئەمڕۆ خۆمان دەیکەین بە مەبەست بێت، یان بێ مەبەست زەرەری گەلەکەمانە هۆی چیە کاکم بیرناکاتەوە چی دەکات دڵسۆزەکانیش خۆیان فیداکردووە لەهەمو ڕویەکەوە بۆ گەل و وڵاتەکەیان  چ لەئێستادا یان لە دێرزەمانەوە هەمیشـە دڵسـۆز خۆی بەختکردووەو هۆی مانەوی ئەم گەلە بووە بۆیە پێویستـە ئێستا باسی ئەو کەسانە بکەم کە کەلتوورەکەیان پاراستووە وەکو هونەر و مێژوو و مەقامە کوردییەکانیان بە جوانـی گوتـووە و بە جـوانی دەیڵێـن زۆربەشیان لەم ڕێگەیەدا شـەهیدکراون بەپێنـوس بە چەک بەهـونەر خزمەتـی بـێ وێـنەیان بە گـەل و میللەتییـان کـردوەو جێدەستیان تا ئەمڕۆش دیارە

مەقامی سەفەر لە سلێمانیدا گوتراوە و دەوترێت، ئەم هونەرمەندانە زۆر بەجوانی گوتوویانە: حەمە سالّح دیلان، مەحمود تۆفیق شلک و ئـازادی کوڕی، عەدنـان کەریـم، عـومەر دزەیـی، کـامەرانی عوسـمانی خولە سنەیی، برازای ڕەحمەتی کاک ئەحمەد شـەماڵی هونەرمەندی

گەورەی گەلەکەمـــان، شـــایەنی ناوهێنـــانە هونەرمەنـــد جاســـمی سازجێدەستی دیارە لە بواری هونەریداهەروەها کاک ئیبرایم ئەحمەد ناســـراو بە ئیبرایمـــی ئـــاوێنە لەزۆربـــوارا حزمەتـــی کەلتورەکەمـــانی کردووە. لە هەوراماندا مەقامی سیاچەمانە: عوسمان کێمنەیی وحەمە حسێن کێمنەیی و زۆر لە هەورامییەکان گوتوویانە.

مەقامی حەیران لە دەشتی هەولێردا کە زۆر بەجوانی گوتراوە لەلایەن هونەرمەندان: ڕەسوڵ نزار گەردی، حەسەن سیساوایی، تەنیا عەرەب، حەســـەن حەیـــران، شـــێروان شـــەیدا وهونەرمەنـــد مامۆســـتا ســـەید عەزالەدینی شاهۆیی بەڕێز لەبواری لاوک وحەیراندا جێدەستی دیارە تەمەندرێژبێت وە زۆری تر گوتوویانە.

مەقـــــــامی لاوک لە بـــــــاکووری کوردســـــــتان، کە لەلایەن ئەم هونەرمەندانەوە بەجوانی گوتراون: محەمەد عارف جەزیری، کاوێـز ئاغا، عیسا بەرواری، عائیشەشان و زۆری تر گوتوویانە، تەنانەت لە ڕۆژئـــاوای کوردستانیـــش گـــوتوویانە و گـــوێم لێـــیان بـــووە، بەڵام ناوەکانیـــانم لەبیـــر نیـــیە بەداخەوە، چـــونکە کـــورد لەوێ زۆرتـــر دەچەوسـێنـرایەوە. لە گەرمیان مەقامی ئەڵڵاوەیسی: مامۆستا عەلی مەردان، حسێن عەلی، سەڵاح داودە و شوکور خەیات زۆر بەجوانی گوتوویانە.مەقامی قەتار و خاوکەر و ئای ئای و خورشیدی: سەڵاح داودە، شوکور خەیات، ئەحمەد فەرەج، ئەحمەد نانەوا، مستەفا نانەوا، سەید فوئادی لە بنکورە و بەندەش شاگردێکی ئەوانم و توانیم لەم دواییانەدا بە هاوکاری هونەرمەندی ئازیز جاسمی ساز لە سلێمانی تۆماری بکەم و بڵاویشم کردەوە و دەنگێکی باشی دایەوە، هەروەها مەقامی ئەڵوەن، ئای ئای، ئەڵڵاوەیسی، خورشیدی، خاوکەر و هۆرە لە گەرمەسێردا: خودادادا عەلی، حەسەن هەیاس، خاڵۆ حەمید جومعە لەڕ، مەجید موورادخان و بەندە (عومەر سۆفی)، ئەحمەد شەوکەت ڕۆســـتەم، دەتـــوانم بڵـــێم هاوشـــانی ئەم هونەرمەنـــدانەش چەنـــدەها

هونەرمەندی میوزیکزانی بەتوانا و لێهاتوومان هەن کاریان بۆ کەلتوورەکەمان کردووە و نەیانهێشتووە لەناو بچن و لە فەوتان پاراستوویانە و پەرەیان پێداوە بەبێ وچان هەتا ئەم سەردەمە، وەکو: مامۆستا ئەنوەر قەرەداخی، مامۆستا خالید سەرکار، ولیام یوحەننا، شەوکەت ڕەشید، مامۆستا وریا ئەحمەد، سەید ئەحمەد بەرزنجی،ومامۆستا چالاک سەدق کەرکوکی ومامۆستا عادل محەمەدکەریم و مامۆستا عادل حەسەن هەڵەبجەیی مامۆستا ئازاد ساڵح هەڵەبجەیی وسەید ئەحمەد ڕەوان دووزی و موجتەبای میرزادە، حوسێنی ئەلبورزی، ئاغای مەسقەتی، مامۆستا ئامانج لەهەولێر، مامۆستا چالاک کەرکووکی، مامۆستا ڕزگار خۆشناو مامۆستا حوسێنی یوسف زەمانی، هونەرمەندی گۆرانیبێژ و دەنگخۆش و ژەنیاری کەمانچە فەیزی نەژادی خۆشەویست، م. عەباس گەرمکی لە خورماتوو، کە ماوەیەکی زۆرە بە کەمانچەکەی خزمەتی کەلتووری ڕەسەنی کوردی کردووە، هەروەها لومقان دووزی و کوڕەکەی ئەندازیاری خۆشەویست موحەمەد، بە دەنگ و بە ئامێرەکان خزمەتێکی بەرچاو دەکەن مامۆستا ئارام ڕەشید کەمانچەژەن کەلاری کۆن وە مامۆستا دیار حەمید باجەڵان بنکورە وە مامۆستا سلاح ڕەئوف، دەمەوێت ئەو ڕاستییەش نەشارمەوە وەکو مامۆستا شاسوار هەرشەمی دەفەرموێت: کورد قەرزاری هۆزی دۆمە، کە ئێستا و زوویش بە خۆیان دەڵێن ئۆسایەل، لەنێو کورد دا هۆزێکی هەتا بڵێیت قارەمان و کاسب و دڵ و دەروون پاکن و ئەهلی هونەرن لە هەموو ڕوویەکەوە، هەر لە کۆنەوە کەلتووری کوردیان پاراستووە لە هەموو بوارەکاندا، ئێستاش زۆربەی هونەرمەندانی گەورەی کورد لەم هۆزە دیار و بەناوبانگەن، لە هونەرمەندە دیارەکانیان: خوالێخۆشبوو ئەحمەد شەماڵ، مەحمود محەمەد (ناسراو بە خولە دۆم)، ئەحمەدی برای ناسراوە بە ئەحمەد

دەرویش، ڕەزا جولەکانی، جەعفەر سەلیم (ناسراو بە جەعفەر دۆم) و دەیەهای تریان هەیە، پێموابێت هونەرمەندی گەورەی خوالێخۆشبوو مامۆستا حەسەن زیرەکیش لەوان بێت. وەکو کاک شاسوار هەرشەمی دەڵێت: ئەم هۆزە لە هیندستانەوە هاتوون، ئێستاش لە هیندستاندا ماوەن و زۆرن بە هەمان دەستوور و هەمان ژیانەوە، هەر لێرەشەوە کۆچیان کردووە بۆ ئەوێ، لەوێش گەڕەک و ناوچەی تایبەت بە خۆیان هەیە، ئەم هۆزە گەڕۆک بوون، هەمیشە ژیان و گوزەرانیان لەسەر شایی و گۆرانی و هەڵپەڕکێ و میوزیک و دەمبگلێدان بووە، ئەمانە شار بە شار و وڵات بە وڵات گەڕاون و ناوەکەشیان لە دەمبگەوە هاتووە، بڕوانە دۆمبگ- دۆم، ئەم هۆزە هەمیشە لەگەڵ شادیی و خۆشییان، هەتا ئێستاش هەروان، زۆریش سادە و ئاشتیخوازن لە هیندستاندا و لێرەش بەهەمان شێوە لێیان دەڕوانن، لەبەرئەوەی لە هاتنی ئیسلامەوە گۆرانی و شایی حەرام کرا، کارەکەی ئەمانیش هەر ئەمە بوو، خەڵکی وردە وردە بە جۆرێکی تر لێیان دەڕوانن پێموابێ ئەم هۆزە لەگاتا خوێنەکانی زەمانی زەردەشت بوبێتن چونکە پیاوانی ئاینی زەڕدەشت هەمویان هەڵهاتن بۆ سنجان لە هیندستان گاتاکانیان لەفەوتان پاراست و بەنەخش لەسەرجەستەیان نوسیانەوە تا لە ناو نەچن جا لەڕێگای هونەرو هونەرمەندانەوە لەبەردەکران و دەیاندا بەگوێی گەلانداو نەهیان هێشت بفەوتێت و بێگومان هەموو پەیامەکان لە ڕێگای هونەرەوە دەگاتە خەڵکی و هەموو گەلان، ئەم خەڵکانەش پەیامبەر و گەیەنەری هەموو ڕاز و نیازێک بوون، بۆ نموونە تۆ بڕوانە قورئانی پیرۆز لە ئەمڕۆشدا بە هەمان ئاواز و هەمان مەقام دەخوێنرێنەوە، بۆئەوەی بە چێژەوە بیدەن بە گوێی بیسەراندا، بڕوانە، کەچی لێرەدا ئەم چینە بەهرەدارەیان عەیبدار کردووە، نەک هەر ئەمان، بەڵکو هەموو هونەرمەندانی جیهانیش گوایە ئەمانە دوورن لە خوداپەرستی

و سوک و ڕیسوان، بەڵام دەتوانم بڵێم بەڕێزترین خەڵکن و لە هەموو ڕوویەکەوە دوورن لە شەڕوشـــۆڕ و تووندوتیـــژیی، هەتـــا بڵێیـــت ئاشتیخوازن و کاسبکارن و دڵسۆزی خاک و نیشتمانن و بە ڕەنجی ئارەقی نێوچاوانی خۆیان دەژین، هەرگیز خیانەتیان لە خۆیان و گەل و خـاک و ئاویـان نەکـردووە، زۆر زیـرەکن لە هەمـوو ڕوویەکەوە، هونەرمەنـدن، دەتـوانم بڵـێم ئەمـانە لە گاتاخوێنەکـانی زەمـانی زەردەشـتی بـوون و لە هاتـنی ئیسـلامەوە کۆچیـان کـردووە بـۆ هیندسـتان هەرچـۆنێ ئامـاژەم پێـداوە لەسـەرەوە، هەروەکـو پـیاوە ئاینییەکانی زەردەشتی، چۆن گاتاکانیان بە نەخش لەسەر جەستەیان نووسی، ئەمانیش سینەبەسینە تێکستەکان و ئاواز و مەقامەکانیان پاراست هەتاکو ئەمڕۆ، لەو کاتەوەی  لەشکری ئیسلام هێرشی هێنا بۆســەر دەوڵەتـی ساسـانی فەتحـی ڕۆژهەڵاتیـان کـرد ڕاوینـان و نەیانتـــوانی بگەڕێـــنەوە وڵات، هەتـــا خـــاوبوونەوەی ئیمبراتـــۆری یەکگرتـووی ئیسـلام و گۆڕانکـاریی لە نـاوچەکەدا و دروسـتبوونی دەوڵەتێـکی بەهێـزی فارسـی، چـونکە هـۆیەک بـوو بـۆ مـانەوەی کەلتـــووره کۆنەکـانی ڕۆژهەڵات لە ئێرانـدا و هەتـا سـەرهەڵدانی یەکگرتنەوەی وڵاتانی دیـنی مەسیحییەت یان خاچیەکان، لە پاشان وەکو گەڕۆک کارەکانیـان ئەنجام داوە و هـەرگیز نیشـتەجێ نەبوون، سـنووریان نەدەناسـی و بەدوای کـاردا دەگەڕان، لەو سـەردەمانەدا پێیان دەگوتن موهاجرین، واتـا ڕەوەنـدەکان، یـان کۆچەرییەکـان، هەتـا سـنوور دانـرا بـۆ وڵاتـان ناچـاربوون نیشـتەجێ بن،مەبەسـتم هـۆزی دۆمە یـان ئۆسـایەل (بـۆ زانـیاری زیـاتر، بـڕوانە کتێـبی: مێژوویـی تەتەڵەی شاسوار هەر شەمی).دواتریش، هـۆزی زەنگەنەکان وداوێ و کەڵ وڕیش بەهەمان شێوە دریخییان نەکردووە، بەتایـبەت بنەماڵەی کـۆچکردوو خـێڵی سـەلاح داودە جـارێ وادەرکەوتـوە دەڵـێن هـۆزی داودە دەگەڕێـنەوە سـەر برایـانی یارسـانی دیـارە ئەمـانیش لەگاتـا

خوێنەکان بونە هەتادوایی وە چەندەها هونەرمەندی تر، کە ناوی زۆربەیانم نووسیوە لەم کتێبەدا، کە لە کەرکوکدا خزمەتێکی بەرچاویان بە هونەری ڕەسەنی کوردی کردووە و دەیەها میوزیکزانی تر، ئەوانەیان مردوون بەر ڕەحمەتی خودا بکەون، ئەوانەیشیان کە ماون و لە ژیاندان تەمەندرێژ بن بە لەشی ساغ و سەرفرازی بژین، هیوای سەرکەوتنیان بۆ دەخوازم لە یەزدانی مەزن، دەتوانم بڵێم ئەگەر هەوڵ و ماندووبوونی تێکۆشەران و هونەرمەندان و دڵسۆزانی گەلەکەمان نەبووایە، لە ناوەڕاستی ئەم هەموو دوژمنەدا ئەم گەلە بەم شێوەیەی ئێستا نەدەمایەوە بەم کەلتوورە دەوڵەمەندەوە، کە ئێستا گەیشتووەتە ئێرە، دەتوانم بڵێم ئەم مەقامانە موڵکی ڕەسەنی میللەتی کوردن و لەگەڵ کورد دا لەدایک بوون، کە هەر حەوت مەقامەکەن، مانای وایە ئەم مەقامانە دەبنە دایکی بەشەکانی تر، ئیتر ئەوان لەژێر هەر ناوێکدا بن، بۆ نموونە بڕوانە ئەم داهێنانە و لێکدانەوانە لە هیچ کوێ ئەمە نەکراوە، لە هەرسێ پەیژەکە مەقامێک پێک بێنیت و بە یەکەوە بگوترێت و لەگەڵ میوزیکدا و نەشازیش نەکەیت، وەکو ئەڵلاوەیسی لە سێ گۆشە مەقام پێکهاتووە؛ بە یەکەوە لە یەک کاتدا بگوترێت بە سەلیقەیەکی تەواوەوە بێ هیچ کەموکوڕییەکی میوزیکی، لە هیچ وڵاتێک ئەمە نەکراوە بەم شێوەیەی کە کورد کردوویەتی، ئەمە دەتوانین بۆ نموونە لەسەر دەنگی م. عەلی مەردان ئەم لێکدانەوەیەی بۆ بکەین، ئەگینا هونەرمەندێکی تر بیڵێتەوە بە جۆرێکی تر دەبێت، ئەوە تەکنیکی میوزیکە بە گوتەی م. ئەنوەر قەرەداخی و م .ئامانج، هەروەها م. چالاکی کەمانچەژەنی کەرکوکی، کە شەوێکی خۆشمان پێکەوە بەسەر برد لەماڵی بەندە و لەخزمەتیاندا بووم بە خۆشحاڵییەوە، بەندە لە ڕووی تەکنیکییەوە سەرم دەرناچێت، من پێم وایە لە ڕووی تەکنیکیشەوە بێت ئەوەی

ناوی حیجاز، یان بەیاتیش بێنێت؛ دەتوانێت تەکنیککاری خۆی بکات، هیچ کاتێک نۆتە و نۆتەکاریی پەیوەست نییە بە ناوەوە، چ کوردی بێت، یان عەرەبی، بەڵام بەندە تەنها لە ڕووی گوتن و مێژوویی و شێوازی ناو کۆمەڵگاوە دەتوانم لەسەریان بدوێم، هەروەها ناوەکانیان لە چییەوە هاتووە، چونکە خۆم باش لێیان تێگەیشتوم و دەزانم. ئەم مقامە دوو تەبەقەیە، یان دوومەقامە، یەکەمیان: قەتارە و بەیادە، یان بەیاتە. دووەمیان: حیجازە، یان هەیگاز، ئەو گاز، واتا بانگ، چونکە لەو سەردەمەدا هەموو سرووده ئاینییەکان و خوێندنی گاتاکان و پێنج فەرزەی بانگی مزگەوتەکان بەم مەقامانە بەڕێوە چووە، هەریەکە و ناوی خۆیشی هەبووە، هەتا ئەمڕۆش هەر ماون ئەو ناوانە، بە ئاشکرا دیارە کە مانای چییە، لەپێشتردا ڕوونم کردووەتەوە، با ئەوەش ڕوونکەمەوە ئەم بەرنامەیەی کە ئەمڕۆ پەیڕەو دەکرێت لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستا زۆر لەپێشدا پەیڕەو کراوە لە وڵاتی هۆر و سۆمەر و ماد و ساساندا هەتا هاتنی لەشکری ئەسکەندەرو لەپاشانیش سوپای ئیسلام و گرتنی خاکی ئاریان و هێرشەکەی ئیمامی عومەری کوڕی خەتاب، عەرەب خاوەنی هیچ پەیڕە و پرۆگرامێک نەبووە لەپێش ئیسلامدا گەورەترین شارستانییەتی عەرەب؛ شاری مەککە بووە، وڵاتی عەرەبیش بریتی بووە لە حیجاز و یەمەن، حیجاز واتا سعودییەی ئێستا، لەم شارەشدا پیشەیان بتپەرستی و بازرگانی ئاژەڵ و لایەنە زۆرەکەی کۆیلەفرۆشتن بووە کە لە ڕێگەی داگیرکارییەکانیانەوە دەستیان کەوتووە، ئەمە لەپێش ئیسلامدا غەزوکردنی قەبیلەکان گۆڕا، ئیسلام هەموو سەرۆک هۆزەکانی یەکخست و لەژێر ناوی تەوحیدا بۆ فتوحات و بە ئیسلامکردنی وڵاتانی تر و کۆکردنەوەی غەنیمە و هێرشکردنە سەر وڵاتانی دەوروبەر، تەنانەت لە پاش ئیسلامیش غەزو هەر مابوو لە کۆمەڵگەی عەرەبیدا و شانازیشی پێوە دەکەن

وەکـــو نەریتێـــکی پیـــرۆز و کـــۆنی عەرەبـــی، ئەوەتـــا درامـــا بەدەوییەکانـــیان گەواهیـــدەری ئەو ڕاستیـــیەن و هەمـــان بەرنـــامە بایدایەوە ســەر وڵاتـانی دەوروبەر لەســەردەمی خەلیفـەی دوەمدا کە هێـــرشی کـــردە ســـەر ڕۆژهەڵات بەنـــاوی فتوحـــات و خـواپـــەرسی ونەهێشتـــنی بـــت پـــەرستی و کۆیـــلایەتی و عەدالـــەتی و یەکســـانی بۆهەموو چین وتوێـژەکان بێگومان کەلتورەکەی خۆیان سەپاندە سەر ئەم ولات و خاکی ڕۆژهەڵاتـەدا ئەم خاکـەش خاکی ئاریا، یان ساســانیەکان کە هەمــووی وڵاتــی کـــوردی ساســانی بـــووە خـاوەنی دەوڵەت ویاساو دینەکەشـی زەردەشتی بوەودینێکی خواپەرس بووە لەهیچـی کەم نەبـوە ئەم وڵاتەیـان خاپـورو وێـران کـرد بە بیـانوی جیاجیاوە وەکو دەوڵەتێکی نەتەوەی عەرەبی کە بونە ئەم عەرەبەی ئێستا هەموو شتێکی گۆڕا لە بەرژەوەندیی عەرەبیدا، هەرچی داهات و داهێـنان و ســەروەت و ســامان و کەلـتوور و عەقڵ و زانستێـک هەبوو، بردیان بۆ خۆیان، ئەوەش هەر بە زەبری شمشێر، هەرچیش بەکەڵـکی ئەوان نەهـات، ئەوی گەواهیـدەر بـوو بـۆ مێـژووی گەلان لەناویـان بـرد، ئـاخر دەڵـێن کـورد بـۆچی هیـچی دیـار نییە، کاتێـک هێرشیان هێنا بۆ سەر کورد، واتا دەوڵەتی ساسـانی، ئەوەی تایبـەت بوو بە زەردەشت و مێژووی و زانست و کەلتـووری کورد لەناویـان بـرد بـۆ سەرگرتـنی پیـلانەکەی خۆیـان و سەریشـی گـرت، بـۆیە ئەمڕۆ تۆ کەوتوویـتەتە گێـژاوی سەرلێشـێوانـەوە، ئیـنجا هەرچـی زانـای ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاسـت هەبـوو بانگیـان کـردن و پەیـڕەو و بەرنـامەی تایبەتـیان لە بەرژەوەنـدیی خۆیـاندا داڕشتەوە، بەتایـبەت مۆغەکـانی زەردەشـتی بـوون، کە زۆر شـارەزا بـوون لە بەرنـامە و پـــرۆگرامی نـــاوچەکە و دەیانـــزانی چـــۆن دەستکـــاری دەکەن و دایدەڕێـژنەوە، داشیانڕشـــتەوە و کەوتـنە سڕیـنەوەی شوێنـەواری دیـنی زەردەشتی و مێژووی کوردەواری، هەتـا ئەمڕۆش باسکردن

لێی و ناوهێنانی یاساغه، تۆ بڕوانه له ئەمڕۆشدا هەرچی ڕیوایەت و
حەدیس و بەسەرهات هەیە لە کێوە دەیگێڕنەوە، بوخاری و سەلمانی
زەردەشتی ناسراو بە سەلمانی فارسی ناوی ئەسڵی ڕۆزبە کوڕی
مەرزەبانە لەپێشدا چۆتەسەر دینی بوزی و ئەمجار مەسیحی و دوا
جار ئیسلام  هەموو پێشەواکانی ئیسلام، کە هیچیان عەرەب نین لە
دواتردا باسم کردوون، هەتا تەبریش ناوی لۆلانە و ئێرانیە ئەبو
موسلیم خۆراسانی ش ناوی بەهزادانی بووە ناوی باوکشی وەنداد
هۆرمزدبووە و لەساڵی ١٣٧.ک ـ ساڵی ٧٥٥. زاینی ئەبو جەعفەر
مەنسور کوشتی هەر خۆیشی نایە سەر تەختی خەلافەتی عەبباسی
بۆ بەدبەختی لەلایەن زۆربەی کورد خۆیەوە دژایەتیت دەکەن ئەگەر
باسی مێژوو و کەلتووری کورد بکەیت ڕاستەو خۆ وەکو
نوێنەری ئەوان بن و زۆر بەگەرمی بەرژەوەندی ئەوان دەپارێزن و
دژایەتیت دەکەن بێئاگا بێ ئەوەی هەڵی بسەنگێنن چی دەکەن
ئاخر بەدبەختیێکە لێرادا ئەوەیە ئەگەر ڕۆژانە تاکی کورد
بخوێنێتەوە تێدەگات لە چ ڕێگایەکەوە پاکتاویان کردوین هەتا
ئاوایان بەسەرهێناین  سەرەڕای ئەم پاکتاوکردنەش ڕاستەوخۆ
نەیانتوانی سەرکەوتوو بن لەم پرۆژەیەدا، بەپێی ڕۆژگار وردە
وردە کەلتورەکەیان سڕینەوە و تا گەیاندیانە ئەمڕۆ، چونکە عەرەب
هەتا ئەوکاتەش خوێندن و نووسینیان نەبووە، ئەو گەواهیانەی ئەم
ڕاستیانە دەسەلمێنن وتەیەکی (پێغەمبەرە) درودی خوای
لەسەربێت دەفەرموێت ئەسیرەکان مەکوژن با هەریەکێک لە وان
دەکەس لە ئێمە فێری خوێنەواری بکات و بەرەلایکەن هەروەها
شوێنەوار، یان نووسین و ناوەکانن  و تاتە قوڕینەکان کە وەکو
نامەو سەنەدو و تاپۆو زۆرشتیتر ئەمڕۆ بەدەیەها مەتر لەژێر زەویدا
لە شوێنەوارەکاندا دۆزراونەتەوە جا ناوی هەرچی بێت، بۆ نموونە
ناوی مقامێکی کوردی بڵێین لەم سەردەمەدا لە پێش هەزارەها

ساڵەوە ناوی قەتار و خاوکەر بووە، قەتار و خاوکەر بەهەمان شێوە
بە یەکەوە گوتراون، هەروەکو ئەڵلاوەیسی، یان ئەم حیجازە لە دە
شوێندا ناوەکانیان کوردییە، بێگومان حیگاز بووە، واتا گاز، یان
بانگەواز، ناوە کوردییەکان کۆنترن لە حیجاز، وەکو جوگرافیاش
نێوانیان زۆر بووە، دیارە ئەم حیجازە لە سەردەمی ئیسلامدا بووە،
چونکە زۆربەی ڕووناکبیر و نووسەرەکانی ئیسلام لەو کاتەدا
مۆگاکانی زەردەشتی بوون کە چوونە ناو پێگەکانی ئیسلامەوە، بۆ
بەرژەوەندیی خۆیان هەموو دابونەریتێکی کورد و زەردەشتیان بۆ
گوێزانەوە،ئەوتا لێرا دەڵێ ساڵح ناوێک بەنوسینی ساسانی
لەدایەرەکانا ڕۆژانە ژمیریاری کراوە چونکو عەرەب هاتونەتە
سەرماڵی حازری و خوێندەواریشیان نەبووە و پێویستیان
بەژمێریاری هەبووە هەتا ساڵح ناوێک وەری کێڕاوەتە سەرزمانی
عەربی و نانی ژمێریاریەکانیتری ساسانی بڕیوە جاوردەوردە بۆ
هەموشتێک دەستیان کردە وەرگێڕان و بەعەرەبی کردن  بەتایبەت
ئاوازەکانی مەقام بۆ خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز لە کاتی نوێژ و
خودا پەرستیدا، تەنانەت بانگی مزگەوتەکانیش؛ هەمان بانگی کاتی
نوێژەکانی ئاهورامەزدایە،تۆبڕوانە لەفیلمەکەی ڕیسالەدا کاتێ
(پێغەمبەری ئیسلام درودی خودای لەسەربێت )دەگەڕێتەوە بۆمەکە
یەکسەر بیلالی حەبەشی سەردەکەوێتە سەربانی کعبەو بانگدەدات
ئەوئاوازەیان لەکوێ هێنا جگەلەوەی زۆربەی موسڵمانان لە گەڵ
(پێغەمەردابون)درودی خوای لەسەربێت لەزەڕدەشتێکان بون
ئەمەبۆنمونە دەیهێنمەوە  ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت، زۆرشتیان
وەرگێڕاو دەستکاری زۆر ئاوازودابو نەریتیان کرد جا بۆیە ئەم
ئاوازەش  حیجازەی پێوەلکاوە، ئایە دەتوانیت بڵێین ئەمە لە
حیجازەوە هاتووە، بێگومان بە ئاشکرا دیارە ئەم گۆڕانکاریە لە گۆ
نەکردنی کۆمەڵێ پیت و وشەوە بووە وەکو ئەم ناوە تەنانەت ناوی

مزگەوتیش کراوە بە مەسجد، مەسجد واتا مەزگد، یان مەسجد واتا مزگەوت، جێگای پەرستنی ئاهورامەزدا، واتا خودای مەزن و گەورە، لەلایەکی ترەوە عەرەب جێگایەکی نەبووە سوجدەی تیادا ببات، جگە لە کەعبە، ئەویش جێگای بتپەرستی بوو، ئەمەش بەهەمان شێوە گۆڕاوە دەوروبەرمان، هەرچیمان هەبووە تالان و بڕۆیان کردووەو وڵاتیان کردۆتە گۆڕستانمان، کەچی ئێمە کارەکانیان بەرز ڕادەگرین و هەمیشە وەسف و سەنایان دەکەین و ناوەکانیان بەرز ڕادەگرین، بۆ نموونە وەکو (سەدام) کە ئێستا هەزارەها کورد ناوی منداڵەکانیان ناو ناوە سەدام، کە سەدام بە بەرچاوی دنیاوە زیاد لە پێنج هەزار قورئانی کرد بە ژێر خۆڵەوە و یەک پیاوی ئاینی نەیانتوانی قسەیەک بکەن لە ساڵی ( ١٩٨٨) ئەنفالی کردین، کیمیابارانی کردین، چوار بۆ پێنج هەزار گوند و شارۆچکەی ڕووخاندین کەلتوری قەدەغە کردین ، بێگومانبە ئەوانەی پێش ئەمیش لەم باشتر نەبوون، جاش و خۆفرۆشەکانی کورد؛ پیاوکوژەکانی نەجدو حیجازیان لە ئێمە کردووەتە فریشتە، بڕوانە سێ بەشی کورد ناوەکانیان بە ناوی کوردکوژەکانی حیجازەوەیە! هەتا داروبەردی ئەم وڵاتەیان گۆڕیوە بەناوی ئەوانەوە گوایە پیرۆزە بەناوی پیرۆزەوە کەلتورەکەمانی لەناوبردو هەمویان شێواندووە بڕوانە ناوی ئەم مقاممە.

مەقامێکیشمان هەیە، هەیگازە، یان گازە، واتا بانگەواز، ئەمیشیان کردووە بە حیجاز، حیجاز واتای چی؟ مقامێکیترمان هەیە قەزاز ئەویش هەمان واتا دەدات قەزاز یان گاز گاز هەمومقامەکان خزمەتی گاتاکانیان پێکراوە بۆیە ماناکانیان و ناوەکانیان هەردەچێتەوە سەر گاتاکان ئەمانەش لە خوارەوە ناوی بەشەکانی مەقامی حیجازە بەسەریەکەوە، زۆربەیان کوردین، حیجاز واتا ئەو جێگایەیە کە موسڵمانان دەڕۆن بۆ تەواف، یان حەج، دیارە

ئەم وشەیەش لە کوردییەوە پەیدا بووە، بەتایبەت لە ئێزدییەکانەوە هاتووە، چونکە زۆر لەپێش ئیسلامدا لەلای ئێزدییەکان بەو شوێنەی نوێژ و نزایان تیا کردووە، پێیان ووتووە حەج، بڕوانە مزگەوتەکە و منارەکەش هەمان مزگەوت و منارەی ئێستایە، لە دواتردا بە ڕوونی لێی دواوم، لێرەدا مەبەستم مەقامەکەیە، بۆچی ناوی حیجازە؟ لەم کتێبەدا بە جیاجیا باسم کردووە، حیجاز واتا هەی گاز، یەکێک لە سروودەکانی زەردەشت و گاتاکانە، واتا بانگەواز، دیار و ئاشکرایە حیجاز و گاتاکان و سروودەکانی زەردەشت و دین و کەلتوورەکەشی زۆر زۆر لە هەرچی شتی عەرەب و فارس و تورکە کۆنترە، تەنانەت نوسینەکەشیان لە زەردەشتییەوە وەرگرتووە، بەتایبەت لە سەردەمی ساسانییەکانەوە، بڕوانە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) کاتێک دیلەکانیان کوشتووە، فەرمویەتی: مەیانکوژن با هەریەکەیان دە کەسمان فێری نووسین و خوێندنەوە بکەن، ئەوسا ئازادیان بکەن.لەسەرەوە باسم کردووە کەواتە نووسینەکەشیان کە قورئانی پیرۆزی پێ نووسراوە، کوردییە، یەکەم کەسیش نووسینی داهێناوە، سۆمەریەکان بوون بەشایەتی هەموزانایانی جیهان و ئەودۆزینەوانەی دۆزراونەتەوە ئەوەش بەڵگەیە کە هەموو نووسەر و پێشەواکانی ئیسلام زۆربەی زۆریان زەردەشتی بوون، هەر بە وێنەی پێشەوایانی داهێنانی مۆگاکان یان موقامەکان بڕوانە ئەمناوانە چەندە لەیەکەوە نزیکن مۆگیک مۆغیک مۆزیک مۆغەکان مۆگاکان شوێنیان هەبووەو ناوەکانیان دیارە لەم وڵاتەدا لە زۆرشوێن هەیە بۆنمونە بانی مقان لەلای کەرکوکە لەسەرەوە باسمکردووە واتا شوێنی مەگۆسەکان یان بانگخوازەکان بەکورتی گازخوێنەکانی ئاینی زەرەدەشتی وەکو مەلاکان و قورئان خوێنەکانی ئێستای ئیسلام گاتار، یان قەتارگاز، لەخوارەوە بە

ڕوونی باسم کردووە، مەبەستم لە مەقام و ناوەکانیانە، کە بە کورتی و بە کوردی گۆڕاون بەهۆی گۆنەکردنی کۆمەڵێک پیت و وشەوە، هــەروەها هــۆکاری سیاســی هەبــووە ئێستــاش هەربەردەوامە لەلایەن ڕەگەزپەرستەکانــەوە لەم سەردەمدا ئەوتا لەباکور زمـانی کوردیــان قەدەغەکــردووە و هیــچ مافێکــیان پێڕەوانابــنێت وەکــوومرۆڤ هەموڕۆژێــک جینۆســایدیان دەکــەن بەبەرچــاوی



جیهانەوە جا چۆن پاکتاوی کەلتورناکــەن وا لەم سەردەمە جیهان باسی مافی مرۆڤ و ئازادی دەکەن بەئاشکرا تورک ئەڵێن کورد لە ئەفەریقاش بجوڵێتەوە لێیدەدەین و لەناوی دەبەین،

وێنەی ئامێری عـــود

**مەقام و ناوەکانیان:**

١- حیجاز- دووان.
٢- حیجاز- هومایۆن. دیارە یەکەم پیتی ئەم مقامە هۆیە لەهۆرەوە هاتوە واتا ئەمیش هۆریە چونکو دەگەڕێتەوە سەر سرودەکانی سێگاکان کەحوت سرودە
٣- حیجاز- کورد نیوەشەو: ئەم وشەیە خۆی گەواهیدەرە کە کوردییە.
٤- حیجاز- ئۆرفە: ئۆرفە شارێکی باکووری کوردستانە، لەوێوە هاتووە.
٥- حیجاز- کورد شوشتەر: ئەمەیشە لە شاری شوشتەرەوە هاتووە ئەگەر لە حیجازەوە هاتووە، چۆن کورد-ە؟
٦- حیجاز- مەدمی: (مەدمی ڕوونکردنەوەم هەیە لەسەری).
٧- حیجاز- مەسنەوی.
٨- حیجاز- خاوکەر:
٩- حیجاز- غەریبی.
١٠- حیجاز- کار: خورشیدی لێرەدا دیارە، ئەم مەقامە لە بنەڕەتدا کوردییە.
١١- حیجاز- قەتاری سنە: شێوەکەی مامۆستا موحەمەدی مامڵێ یە.
حیجاز یانزە لقە. بڕوانە هەموی کوردیە

١- چوارگا: بنەڕەت چوارگا واتا چوار جار، ئەم ناوە کوردییە.
٢- چوارگا ماهووری کورد: لە حەوت سروودەکەی گاتاوە هاتووە.
٣- چوارگا تاهیری کورد.
٤- چوارگا ماهوری عەجەم.
٥- چوارگا بەیاتی تورک: تورک لە دەوروبەری چینەوە هاتوون.
٦- چوارگا ئەسیران.
٧- چوارگا بەسیری.
حەوت لقە.
١- نەهاوەند؛ بنەڕەت لە شاری نەهاوەندەوە هاتووە.
٢- نەهاوەند نەوا.
٣- نەهاوەند قەتاری مهاباد.
٤- نەهاوەند خەنەباد.
٥- نەهاوەند ئەڵڵاوەیسی لە سێ گۆشە مەقام پێکهاتووە.
پێنج لقە
١- حوسەینی دەشت بەستەکەی دووگمە و دۆلابی بانی سووخمەی ئاڵە.
٢- حوسەینی جەبر.
٣- حوسەینی کورد.
٤- حوسەینی لامی.
٥- حوسەینی موحەیەر.
٦- حوسەینی ئۆرفە: ئۆرفە لە شاری ئۆرفەوە هاتووە.
شەش لقە.

١- ڕاست بنەڕەت.
٢- ڕاست پێنج گا.
٣- ڕاست شەرقی.

سێ لقه:-
١- شوور بنەڕەت.
٢- شوور عەرەب.
دوو لقه.- کار کورد. ئەمە هیچ بەڵگەیەکی ناوێت.
یەک لقه.
- موخالیف. موخالیف لەباکوریش هەیە جەنابی خانیش باسی کردووه
یەک لقه.
١- مەقامی چەمەری ئەو چەمەڕا یان چاوەڕوانی
لقێکە لە بەیات، ئێستاش لە ڕۆژهەلاتی کوردستان لەناو برایانی یارساندا هەر ماوە، خۆم لە کەناڵەکاندا بینیومەوبیستومە، مقامی چەمەری ناوەکەی لە چەمەڕاوە هاتووە، خۆی بۆ کەسی مردوو بووە، مەبەستیان لەوە بووە چاوەڕوانی دەکەن، چونکە لەو سەردەمەدا باوەڕیان بە تەناسوخولئەڕواح، واتا دۆناودۆن هەبووە، گوایە گیانەکە دەگەڕێتەوە و دەچێتە لاشەی یەکێکی ترەوە، بۆیە بە سوڕنای بەڕێی دەکەن، بێگومان ئەم وشەیە لە قورئانی پیرۆزیشدا هاتووە کە دەڵێت لە ڕۆژی حەشردا، یان نەفخی سوردا فوو بە سوڕنادا دەکەن و هەموو مردووەکان زیندوو دەبنەوە، نەفخی سور، سور واتا سوڕنای، یان بە زمانی ئەمڕۆ زوڕنا، لە زیڕەوە هاتووە، واتا زیڕە لە نایەکەوە دێنێت، وشەکە دیارە ماچۆ زمانییە، وشەکە ئاڤێستاییە ماچۆزمانییە، بڕوانە چەندە کۆنە، ئەمانە هەمووی لە ئاڤێستادا هاتوون، کەچی دەڵێن ئاڤێستا سەماوی نییە، ئەی باشە چۆن وا لە قورئاندا هاتووە؟ ئەی خۆ ئاڤێستا بەر لە هەموو کتێبە ئاسمانییەکان هاتووە، ئەم پرسیارە لێکدەرەوە، ئەمە خۆی لەخۆیدا بەڵگەیەکی حاشا هەڵنەگرە بۆ سەلماندنی دێرینیی نەتەوەی کورد و داهێنانەکانی لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەم مەقامە واتا مەقامی

چەمەری، لە سەردەمی ئیلامییەکانەوە بەرلەوانیش هەر هەبووە، واتا (٤٠٠٠) ساڵ پ.ز، دەکاتە (٣٦٠٠) ساڵ بەرلەوەی دەوڵەتی هەخامەنشی دابمەزرێت، کە تایبەت بووە بە ڕووداوی ناخۆش، وەکو: مردن. ئەم نەریتە هەتا ساڵی شەستەکان لە بنکورەدا هەر مابوو،



وێنەی کۆتەڵ بۆ مردووان لە چەمەریدا

لەبیرم دێت دایکم دەیگوت بۆ وەلی ئاغای باجەلان کاتێک کە مردووە، چەمەریان بۆ گێڕاوە، لەو کاتەی بردوویانە بۆ سەرقەبران، بە تەپڵ و زوڕنا و کەڕەنا لێدان بەڕێیان کردووە و ناشتویانە و خۆیان لە قوڕ ناوە، خۆ لەقوڕنان، یان قوڕ لەخۆ سوان، ئاماژە بووە بۆ ئامادەبووان، کە ئێمە لەم قوڕەین و دەبینەوە بە قوڕ، یان دەچینە ناو ئەم قوڕەوە، لەم دوایانەدا بەس بۆ پیاوی دەوڵەمەند و ئاغا و دەرەبەگەکان چەمەریان گێڕاوە، بۆ فەقیر نەبووە، چونکە خەرجیی و مەسرەفی چەمەری گێران زۆر بووە، نزیکەی یەک حەفتەی خایاندووە، ئینجا گرووپی بۆنەکانیان بانگهێشت کردووە لە وڵاتانی دەوروبەرەوە و لە دێهاتەکانی ناوخۆشەوە گرووپی

چێشتلێنـــان هەبـووە، گرووپـی پێـشوازیی، گرووپـی میـوزیـک، گرووپی بەرێکردن، کۆتەڵ و گرووپی سوارە، گرووپی پیاوماقـوڵان لە دیــوەخاندا، ئیــنجا ئەسپێکـــیان ڕازانـــدووەتەوە و پەیــکەری کۆچکـردوویان بە هەمـوو پێداویستیەکەوە لەسـەر پشـتی ئەسپـەکە دانـــاوە و بەنـــاو خەڵـــکەکەدا دەیسـووڕێنـــنەوە، هەتـــا کـــۆتایی چەمەریــیەکە، حەتـــمەن گرووپـــی هونەرمەنـــدانی چەمەریگێڕیـــش وەســـتایانە شـــیعر و مەقـــامی غەمگـــین و دڵتـەزێنـــیان بە بـــاڵای کـۆچکردوودا هەڵگـوتـــووە، لەبەرئەوەی ئامـادەبووان بجۆشـێنـــن و بـــیانخەنە گـــریان و قوڕپێـــوان، تـــاوەکو مەراســیمەکە گەرمتــر و پڕخرۆشتربێـــــت، لە کۆتایـــــشدا کە ئەســــپەکەیان لادا، یـــان کۆتەڵەکـــەیان لێکـــردەوە، مانـــای وایە شیــن و مـۆر دوایـی هــات، هەرکەســە و بۆ ماڵـی خۆی، بەم ماتەمگێڕییـەیان گوتـووە شین و مۆر، تەمیرەیش ڕۆڵی سـەرەکی هەبووە، بۆیە ناویـان ناوە تەمیرە، واتا (تاریکی+ مۆر) بووەتە تەموور، ئەو تەموورە واتا شیوەنگێـڕان، زۆرجار بیسـتوومە گوتوویانە لەوسـەرەوە شین و ڕۆڕۆ و تەمیرە لێدانێکە ئەوسەری دیار نییە، هەر بەهەمـان شـێوە ئەم گوتەیـەیان دەگـوتەوە، لەو مـاڵە، یـان لەوســەرەوە دەهـۆڵ و زوڕنـا و شـایی و لۆغـانێـک و تـەمیـــرە لێدانێکـە ئەوپـــەڕی دیـار نـیـیە، مـردوو کە دەخرێـــتە ژێـر زەویـیەوە، واتـا ژیانێکـــی تاریـک دەستپێـدەکات، وتەیەکی تـر هەیە لـەسەرەوە ئاماژەم پێکـردووە، لە دینی یارسـان، یان دینی زەردەشتدا دەڵێن کاتێک خودای گەورە حەزرەتی ئادەمی لە قوڕ دروستکـردووە و ڕوح نەچووەتە نـاو لاشـە قوڕینەکـەیـەوە، خودا ئەمری کردەوە میوزیکی بۆ لێبدەن، ئەوانیـش تـەمیـرەیان بـۆ ژەندووە و ئەوکات ڕوح چووەتـە لاشـەی حەزرەتی ئادەمەوە، بۆیە لەم مەراسیـمی چـەمـەرییـەدا زوڕنـا و تەمیرە و دەهـۆڵ و تەپـڵ و کەڕەنـا و شەیپـور لێـدەدەن و شیــن دەگێـڕن، ژنانیــش بەهەمـان

شێوە شین و سەرمۆری خۆیان هەیە، بڕوانە ژنان، یەکێک لە ژنان دەیڵێت و ئەوانی تر بەدوایدا دەیڵێنەوە، تەمیرەش لە هەموو بۆنەکاندا هەبووە، لەم چەمەرییەدا، بەتایبەتی لەلای یارسانەکان، یان ئەهەللحەق بۆ ئاگاداری کەمجار بۆ ژن گێڕاوییانە، مەگەر ژنی پادشایەک، یان ژنی ناودارێک، یان ئاغایەک بووبێت، ئەگینا بۆ ژن کۆتەڵیان نەگێڕاوە، هەتا دوایی، هەروەها ئەم نەریتە لە پێشدا بۆ ڕووداوی کارەساتی سروشتییان گێڕاوە، وەکو وشکەساڵیی و لافاو و ئاگرکەوتنەوە و نەمانی بەهار و هاتنەوەی بەفر و بەستەڵەکی زستان و زۆر شتی ناخۆشی تر، دەڵێن زۆر لە قەومەکانی تریش پەیڕەویان کردووە، وەکو: بابلییەکان، فینیقی و ئەسکەندەرییەکان و بووەتە نەریت، ئەم نەریتە، واتا چەمەری گێڕانە، ناوچەکانی گەرمەسێر بەگشتی و ئیلام و کرماشان و لەکستان و تەواوی لوڕستان دەوروبەری ئەم نەریتەیان پەیڕەو کردووە، کە ئەهللحەق و یارسانەکان بووە و شیعە مەزهەبیشی تیادا بووە، ئەم جوگرافیایە پێی دەڵێن لەکستان و لوڕستان، لەبەرئەوەی شێوەزاریان لەکی و لووڕییە و باوەڕیان بە تەناسوخولئەڕواح هەبووە، واتا چەمەڕاش کەردەن ئی ئەرواحە فرە خاسەن بگەرێ چە دماوە، واتا چاوەڕێیان کردووە ئەم ڕووحە پاکەی ئەم پیاوباشە بگەڕێتەوە و بچێتە لاشەی یەکێکی ترەوە و خزمەت بە مرۆڤایەتی بکات. ناوی لوڕستان لە چییەوە هاتووە؟ واتا لێرەوار، یان دارستان، لێر بە مانای دارستانی چڕ، هەر بە هەمان واتای هەولێر دێت، ئەمە ئەو گوتەیە دەسەلمێنێت کە دەڵێت کوردستان سەرچاوەی ئاوەدانیی و داهێنان بووە، ئیلامییەکان لە زۆر سەرچاوەدا ناویان بە عیلامییەکان هاتووە، بەتایبەتی لە ئەدەبیاتی عەرەبیدا، ئیلامییەکان چەندەها شاریان دامەزراندووە، زۆربەی شارەکانی باشووری کوردستان ئەوان دایانمەزراندووە، نموونەیان

پارێزگای ئیلامی ئێستایە لە ڕۆژهەلاتی کوردستان. ئیلامییەکان نەوەی سۆمەرییەکانن، نەوەی سۆمەرییەکان سوورەمەیرییەکانن، هەروەها لەک، کەڵوڕ، لوڕ، زەند، زەنگەنە، کاکەیی و بگرە هەتا باجەلانیش ئەم هۆز و تیرانە هەموویان بەیەکەوە بوون پێم وابێت هەمویشیان لەسۆمەریەکان جیابونەتەوە هەریەک نەتەوەو یەک هۆزبونەو جیابونەتەوە ، هەمان نەریت و زمان و کەلتوویان هەیە ، دەتوانم بڵێم هەورامییەکان لەو سەردەمەوە هەتا ئێستاشی لەگەڵدا بێت ڕۆڵێکی بالایان هەبووە لە بواری مەقام و گۆرانی و میوزیکدا، ئێستاش میوزیکی ئەم ناوچانە لە هەموو ناوچەکانی تر بالادەستترن و جێدەستیان دیارە، بڕوانە میوزیکی کرماشان، لە کۆندا گەرمیان شار بووە، بۆیە ئێستاش گەرمەسێری پێدەڵێن، لوڕستان و لەکستان دەوروبەریان ئەم نەریتە هەتا هاتنی فتوحاتی خەلیفەکانی ئیسلام بەردەوام بووە، من ڕێزم هەیە بۆ هەموو دیانەت و بیرو بۆ چوونێک، چونکە هیچ دیانەتێک، یان بەرنامەی هیچ پیاوچاکێک خراپی نەگوتووە، بەلام کرداری لەگەلا نەبووە، واتا ناوی بووەو ناوەڕۆکی نەبووە هەر ئەوەنە سەرکەوتبن وسەیتەرەیان کردبێت و کار گەیشتبێتە بەرژەوەندی گەل ونەتەوەو چینەکان ئیتر بەرنامەکە گۆڕاوە ڕاستەوخۆ. جا چەندە سەیتەرەیان کردبێت ڕاستەوخۆ نەیانتوانیوە کورد بسڕنەوە، بەڵکو کورد خۆی زیاتر ڕۆڵی لە سڕینەوەی خۆدا هەبووە، بە چەند سەدەیەکیش هەر بەردەوام بووە، وردە وردە لەژێر ناوی جیاجیادا هەموو نەریت و کولتووری ئێمەیان سڕییەوە لە هەموو بوارێکدا، جا ئەمان تەنها مەبەستیان پاکتاوکردنی ئێمەیە وەکو ئەوگەلانەی بەهەمان دەردیان بردن ئەگینا خۆ ئەوروپاو ڕۆژئاوا هەروەکو خۆیان ماون و زۆریش سەرکەوتوون وبەهێزیشن و زۆر زۆر زیادیان کردووەو هەر

لەگەشـەدان ئـايە چـی لەمەسـەلەکە گـۆڕاوە ئەمە مەسەلـەیەکم بیـر دەخاتـەوە بانێکـەو دوو هەوا داخیـگرانم ئێـستا ئەمـان خۆیـان بونەتـە نۆکـەری ئەوان و ئێمەیـش بەدوای ئەسـپی خەیاڵی ئەوان کەوتوین و هەمـوو شتێکی خۆمان بۆتە دێوە زمەلێمان هینەکەی ئەوانیش هەمان دۆینەو کەشکەکەی خۆمانە دەیفرۆشنەوە پێمان جامەگەر هەر بڵێیـن لەبێخەبـەران کەشکـەک سـەڵاوات ئازیـزان جـار جـار سەرهەڵدانـی پـرسیارێـک یـان هێنانـەوەی بەڵگەیـەک تـۆزێ دورماندەخاتـەوە لە باسـی مقـامەکان بێگـومان ئەوەی پێویستـە بۆزیاتـر سەلمانـدن و باوەڕپێکردنـی خوێنـەری ئازیزمـان زۆر بـە وردەکـاریەوە چوینـەتە بنـج و بنەوانـیەوە و ڕونکردنەوەیـان لـەم ژیانـەو لەم وڵاتـەدا چـی ڕوی داوەو چـۆن گوزەراوە پوختەی قسە هەرچۆنێک بێت لە پێشتـردا ئاماژەم پێ کـردووە، دەمەوێت کەمێـک ڕوونتـر و وردتـر ڕوونـی بکەمـەوە، مقـامە کوردییـەکان، وەکـو: قەتـار، خـاوکەر، خورشیـدی، ئەڵڵاوەیسی، ئای ئای، یەککگا، دووگا، سێگا، چوارگا، پێنج گا، شەشگا حەوت گـا نەهاوەنـد، ماهـور، شوشـتەری ، یـان شوسـتەری، یـان سەحەرێکەی مامە سێوەیە، حەیران، سیاچەمانە و سەبا وهۆمایون و لاوک و هەیگـاز یـان قەزازو واتـا گازگـاز و هۆرەیـش، ئەمـانە هەرهەمـوویـان بـۆ بۆنەیـەکی تایبـەت گـوتراون، لەسـەرەوە ئاماژەم بەناوەکانیـان کـردووە بەژمـارەش جـا ئەگـەر بۆنـەکـە ئایـنی بوویێت بە تێکسـتی ئاینـی ئـەو سـەردەمە گـوتـراوە، بۆ نمونـە: هـۆرە ستایـشی هـۆری پێکـراوە، یـان خـۆری، ئێسـتا هـۆرە، بێگومان هی سـەردەمی هۆرییەکانـە، هۆرمزیـار هـەتا ئێستـاش هۆزێکـی گـەورەن، دیـارە لەو سـەردەمەدا کاروبـاری ئاینـیـان بە دەستـەوە بـووە، لەلایـەن ئاینـە تازەکانـەوە بەتوونـدی دژایـەتـی کراون، ناو و ناتۆرەی زۆریان بۆ هـەڵبـەستوون، هەر لـەبـەرئـەوەی

ملکەچیان بکەن لەگەڵ ئەم هۆزانەدا، چونکە یەکبیر و باوەڕیان هەبووە و لە یەک ناوچەشدا بوون، ئێستاش بەهەمان شێوەیە، وەکو: باجەڵان، زەنگەنە، دەلۆ، سورەمەیری، تایشەیی، هۆرمزیار، کاکەیی، پاڵانی، فەیلی، ڕۆژبەیانی، بێویانی کەڵوڕ، لەک، لوڕ، هەورامی وداویَ ویان داودە و جەلالی، یان گەڵاڵی و زۆرێک لە هۆزەکانی تری ئەم ناوچەیە بەئاسانی سەریان دانەنەواند بۆ نەیارەکانیان، یان بەڕاستی کەلتوورەکەیان پاراست بە هەموو بۆنەکانیانەوە، بەتایبەت مەقام و بەستە و گۆرانی، بۆ نموونە: مەقامی بانگەواز، یان قەتار، ئەم مەقامە ستایشی خوای گەورەی پێکراوە بە تایبەت لەسەردەمی زەردەشت دا ئاوازەکە بووە لەپێشدا زۆر کۆنە بۆیە خاوەنەکەی ناناسرێتەوە بۆتە فۆلکلۆر بەهەمان شێوە لەو سەردەمەدا هەر خودایەکیان پەرستبێت بەم ئاوازە وێردیان خوێندوەو ستایشیان کردوە چونکە مرۆڤ هەرچی زیانی پێگەیاند بێت، نەزریان بۆ کردووە و نزایان کردووە و بە ئاواز و میوزیکەوە پاڕاونەتەوە، بە تێکستی گاتاوە، واتا گاتا ئایەتەکانی ئاڤێستای پێغەمبەر (زەردەشت)،ئەمناوەش هەر لەوکاتەوە بڕاوەتە بەر ئاوازەکە تەنانەت لە پێش زەردەشتیشدا ئەمانە هەر بوون، بێگومان لە سەردەمی نوحەوە هاتووە، لە سەرەوەش ئاماژەم پێداوە هەرچی بوو، چوو، بەڵام ئەمانە هەموو بەڵگەن بۆ ئێمەی کورد، جێگای شانازییە بەپێی قورئان و تەورات و ئنجیل و زەبوریش بێت ئێمە باوکی هەموو گەلانین، بناغەی هەموو داهێنانێک و دابونەریتێکین، بڕوانە شوێنەوارە مێژووییەکان هەر هەموویان شایەتی دەدەن کە کورد کۆنترین گەلە لەم ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەدا، ڕاستە ئەم گەلانەی چواردەورمان بە ڕەشەکوژیی بوونەتە خاوەن کیانی ئەمڕۆی خۆیان، مێژوو شایەتە لە کوێوە هاتوون، دیارە کە ئێمەی کوردی ئاشتیخواز لە

پێش هەزارەها ساڵـەوە ئێـرە جێگەمـانە، کێـوی گودی شایەتـە. بڕوانە ئەم مەقامە، کە بەڵگەی ناوێت و خۆی بەڵگەیە، خاوکەر، واتا دەتخەوێنێت، چەند وردە بۆچونێک هەیە بە بۆچونی خۆم بڕوانە خاو یان خۆر لێرەوە بۆچونەکان لێکبدەرەوە و شییان بکەرەوە وەکو وتمان خۆر یان هۆر خاو یان خەو یان هەتا خێڵ خەوتن زکریان کردوە ئەوەتا خۆر لەکەل دەرکەوتە یان گوێگر لە ژێر گاریگەری ئاوازەکەدا خەوی لێکەوتە ئەم مەقامە لەگەڵ قەتاردا دەگوترێت، خاوکەر بە واتای خاوکردنەوە دێت، واتا خەو، یان ئەوەتا هەتا خێڵ خەوتن بەردەوام بوون لە زیکر و تەلیلەیان، واتاکەی لەوەوە هاتووە گوێگرەکەی دەخەوێنێت، یان بەهەمان شێوە پەیوەندی بە خۆرەوە هەیە، خاوکەر و خۆر زۆر دوور نین لە یەکەوە لەسەرەوە ڕونم کردووەتەوە، مەقامی خورشیدی، ئەم مەقامە ناوەکەی بە خۆیەوەیەتی، زیکری خۆری پێ کراوە لە زەمانی میترایییەکاندا کە پێش زەردەشتییەکان بوون، خورشید واتا چەرموو، یان سفید، بەڕێزان دەمەوێ کەمێک ڕونکردنەوەش لەسەر ناوو وشە کوردیەکان بدەم لە چیوە هاتووە پێموابێت ئەم پیتانە ئەوە دەسەلمێنن زمانی کوردی سروشتیو بنەڕەتیە وەکو دەڵێن سپێدەی بەیان ئەم وشەیە لەسپیایەتی بەیانەوە وەرگیراوە ،لەخوارەوە زیاتر ئاماژەی پێدەکەین بۆ زانیاری زیاتر هەموو گۆرانییەک بۆ سەرلەبەیانی نابێت، هەر گۆرانییەک کاتی خۆی هەیە. مەقامی خورشیدی، ئەم مەقامە سەرلەبەیانی لەگەڵ خۆر دەرکەوتندا زیکری خۆریان پێ کردووە، لە پێشتریشدا ئاماژەم پێ کردووە. ئەڵلاوەیسی، ئەم مەقامە دەگەڕێتەوە بۆ نەریتی وەیسییەکان، کە ئێستاش ئیمامەکانیان و شیعر و تێکستەکانیشیان تا ئێستا هەر ماون، هەتا دوای هاتنی دینی ئیسلامیش هەر مابوون، دیارە ئەم مەقامەش لە پەرستگاکانی

ئەوان خوێنـراوە و ڕۆڵـی ئایـنی خـۆی گێـڕاوە، کە لە سـەردەمی ساسانییەکاندا بووە و یەکتاپەرست بوون.

مەقامی سەبا، پێموایە ئەم مەقامە لە سبەینانا گوتـراوە، بۆیە ناوی سـەبایە، واتـا مقامێـک لە سپێـدەدا گوتـراوە و دەگوترێت، پێمـوایە سوبحی عەرەبیش لەو وشەیـەوە هاتـووە، سپێـدە سوبح، چـونکە عەرەب خوێنـدن و نووسینـیان نەبـووە، لە بێگانەکـانەوە فێـری خوێنـدن بـوون، ڕوون و ئاشـکرایە نەریـتی نەتـەوەکانی تـر وەردەگـرن، هەموویـان لە دەوروبەرەکەیـان وەرگرتـووە، ئەگـەر دەڵێیت چۆن وا گـەورە بون ئەو گـەلە هەر هۆزە و هیزو سوپای تایـبەت بەخـۆیان هەبـووە و هەرکامەیـان بەهێزبـووە غەزوی ئەویتری کردووە زۆربەبێ ڕەحمانە کاتێکیش هەمویان بونەیـەک هێـز ویەکیـان گـرت لە ژێـر ئـاڵای ئیسـلامدا بەهەمـان کەلتـورەوە دەسیان دایە فەتحکردنـی وڵاتـانی دەوروبەر ئەوەتـا مێژوو باسـیان دەکـات و بون بـەو ئەونەتـەوە ئەیاینـیەیەی ئێسـتا. ببـورن کـەمێک دورکـەوتینەوە لەباسەکەمان مەقامی ئەفشار، یان هەوشار، وا دیـارە لە شاری هەوشارەوە داهێنراوە، بەستەکەی نازیلێی مامۆستا عەلی مەردانە، هەوشار شارێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستانە. مقـامی نەهاوەند، ئەمیش شارێکی ڕۆژهەڵاتی کوردستـانە.مەقامی ئۆرفـە، ئەمەش هـی شاری ئۆرفەی باکووری کوردستانە، شارەکەی ئیبراهیم تـاتڵیساز.

مەقامی دەشت، ئەم مەقامە، یان هی دەشتەکییەکانە، واتا لادێـیەکان، یـان مەبەسـت لە بەرزیـیەکەیەتی دەبێـت لە دەشتـدا بگوترێـت هەروەکو حەیـرانی سەرچیـایی لەبەر شـەرم و عەیبە لەنـاو شـاردا، یـان لەبەر دەرکەی ماڵانـدا، یـان لەنـاو ماڵانـدا نەگـوتراوە، ئێسـتاش هەروایە، خـۆ دونیـا بـووەتە گـۆرانی و میـوزیک. مقـامی سێـگا، لە یەکەوە هەتـا حەوت هەیە، ئەم مقامـانە لەسـەر حەوت پەیـژەکە گـوتراون، واتـا (دۆ، ڕێ، مـی، فـا، سـۆڵ، لا، سـی). حەوت سـروودی

ئاینی زەمانی زەردەشت بوون بە ئایەتەکانی گاتا، بە مانای گاز، یان گاتار، یان بانگەواز دێت ئەوەتا لە هەولێر و موکریان و هەندێک ناوچەی کوردەواریدا ئەگەر بانگی یەکێک بکەن دەڵێن گازی کە، بڕوانە با+ ن + گ + واز دەکاتە بانگەواز، کورتکراوەتەوە بووەتە گاز، ئەوەتا تا ئێستاش بانگی مزگەوتان پێنج فەرزە بانگدەدات و پێی دەڵێین بانگ، واتا بانگەواز، بانگەواز دەکەن بۆ خوداپەرستی، گاتاش بانگەوازی کردووە بۆ خوداپەرستی بەهەمان شێوەی قورئانی پیرۆز، خوێندنی ئەمڕۆ لە هەموو بۆنەیەکدا دەخوێنرێت لەو کاتەشدا گاتاش بە سروود و ئاوازی خۆش خوێنراوە لە پەرستگاکاندا، لەبەرئەوەی زیاتر سەرنجی خەڵکی ڕابکێشێت بۆ سەر ئاینەکەی، بەهەمان شێوەی ئەمڕۆ، واتا (ئاڤێستا) لە پەرستگاکاندا خوێندراوە وەکو چۆن ئەمڕۆ (قورئانی پیرۆز) لەسەر هەمان مەقام دەخوێندرێت، هەر لەوکاتەوە ناونراون جا لەچ بۆنەیەکا وترابێت بەوناوەوە بووە ئەوانەش دین و ناوەکانیان شایەتی دەدەن ئەمڕۆش وتنەوەی لەلایەن زمانانی ترەوە گۆڕانکاری تێکەوتووە لەکاتی خۆیشیدا بەو جۆرەی ئێستا وتراونناوەکانیان گۆڕاوەو کەمو زیاد کراوە، جا ئەم مقامانە زۆر لقیان لێبووەتەوە لەسەرەوە ئاماژەم پێکردون هەروها زۆربەی داب ونەریتەکان لە کوردەوارییەوە وەرگیراون، ئەوە مێژوو و شوێن هەوارەکانن وا دەڵێن و من نیم بەڕێزان، دەزانم زۆر کەس هەیە ئەم گوتەیەیان پێ ناخۆشە، بێگومان وردە وردە تەکنەلۆژیا هەمووی ئاشکرا دەکات پێویست بە خۆگێلکردن و خۆسغڵەتکردن ناکات، لە زۆر سەرچاوەدا بەرچاوم کەوتووە (زەردەشت) نەیگوتووە (ئاڤێستا) ئایاتی سەماوییە، بۆ نموونە لە هێرشی ئەسکەندەری مەکدۆنیدا هەمووی لەناوبراوە و سووتاندوویانە، چەندەها جار لەناوبراون و لە پاشان کۆکراونەتەوە و کاریان پێکراوە، بەتایبەت لە سەردەمی

ساسانییەکاندا، یەکێک لە شتە جوانەکانی (ئاڤێستا) دەڵێت: بیری چاک، کرداری چاک، گوفتاری چاک. پشتوێنە سێگرێکەی لە کوردەواریدا هەیە، بە مانای ئەم سێ وشەیە دێت؛ بیری چاک، کرداری چاک، گوفتاری چاک، ئایا هەموو کەسێک ئەمە ڕەفتاری بێت، هەرگیز خراپە ڕوو دەدات؟ بەتایبەت بۆ ئەو گەنجانەی کە تازە پێدەگەن و پشتوێن دەبەستن، مانای وایە ئیتر بووی بە پیاو، برۆ پشتت ببەستە و کردار و ڕەفتار و گوفتارت چاک بێت، خراپەکار مەبە، خەڵکانێک هاتن بە زۆر و زۆرداریی شتەکەیان لە ئێمە پێچەوانە کردەوە و پێیان فرۆشتینەوە، هەر لەبەرئەوەی فەرهودمان بکەن و کردیشیان و خۆمان گێل دەکەین، (زەردەشت) هەر لەبەر ڕەفتار جوانیی و لێهاتوویی و دانایی خۆی پەیڕەو و یاسای بۆ جیهان دارشت بۆ نەهێشتنی تەنگوچەڵەمەکانی ڕۆژانەیان، دەیەها داهێنانی کردووە لەڕووی مرۆڤایەتی و سیاسی و ئابووری و تەندروستیشدا، بۆ نموونە وەکو: شەترەنج، تاوڵە و چەندەها دەرمانی پزیشکی و چەندەها ئامێری نەشتەرگەریی و پەرەپێدانی کەرتی کشتوکاڵ و لە ڕووی ئەستێرەناسیشەوە دەستێکی باڵای هەبووە بە ووتەی زۆر لە سەرچاوەکانی مێژووی مرۆڤایەتیدا و زۆر شتی تر لەلایەن قوتابییەکانیشییەوە داهێنراوە لەسەر ڕێباز و بەرنامەی زەردەشت، تەنانەت لە ڕووی هونەریشەوە داهێنانی کردووە، زەردەشت و ڕێبازەکەی زۆر هانی مرۆڤایەتییان داوە بۆ خاڵیکردنەوەی ناخیان لە خەم و پەژارە بە گۆرانی و ئاهەنگ و خۆشی، بۆئەوەی مرۆڤ هەمیشە بەتوانا و دەروون ئارام بێت، مرۆڤ چەندە دەروونی ئارام بێت، هێندە سەرکەوتوو دەبێت لە ژیاندا، چونکە مرۆڤ بە خەم و مەراق زوو تێکدەشکێت، بۆیە هەمیشە هانی مرۆڤایەتی داوە شاد و کەیف خۆش بن با خەم و خەفەت تێکتان نەشکێنێت، هەر لەبەر ئەم هۆیە بووە شیعر و

بەستە و گۆرانی و مەقام پەرەی سەندووە لە وڵاتی هۆریانە،بەتایبەت لەزەمانی زەردەشتدا بێگومان لە هەر وڵاتێکدا هونەر ئازاد بوو، ئەو وڵاتە ئارام وئاشتی خواز و پێشکەودەبێت و بەرهەمەکەشی بۆ جیهان دەبێت، چونکە هونەر و ئەدەب دایـنەمۆی خۆشگوزەرانی و پێشکەوتنن لە هەموو ڕوویەکەوە، هەر بۆیە دەتوانم بڵێم ئەم پیاوە بەڕاستی مرۆڤدۆست بووە، زۆر لە زانایانی ناودار و فەیلەسوفانی جیهان دانیان بەم ڕاستییەدا ناوە، وەکو سوقرات و ئەرستۆ و نیچە و هەتا شکسپیر و گالیلۆش، چونکە گالیلۆ بەوە ناسراوە سوڕخواردنی ئەستێرەکانی بەدەوری خۆردا دۆزیوەتەوە، بەڵام زەردەشت زۆر لە پێش ئەودا ئەو ڕاستییەی ئاشکرا کردووە، هەروەها دەیەهای تر لە زانایانی جیهان ئەم ڕاستییەیان سەلماندووە، زانست و لێهاتوویی زەردەشت و داب ونەریتەکەی وئاشتی خوازێکەی و ژینگە دۆستێکەی زۆریش ئاشقی مۆزیک وگۆرانی و هونەر بووە هەتا ئەو لەژیاندا بووە ئەم وڵاتە هەمیشە لەپێشکەوتندا بووە هەموڕۆژێک ئاهەنگ ومۆزیک وشایی وخۆشی ومقامات بەردەوام بووە هەتا کۆتایی ساسانییەکان و هاتنی سوپای ئیسلام بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە برەودا بووە،لەوکاتەشدا دوو گۆرانیبێژی بەتوانا بونە بەناوەکانی باربەدو نەگیسا ڕۆژانە لەدیوانی پاشاکان و بۆنە فەرمیەکانا ئیشو کاریان سرودو مقاماتیان چڕیوەو هەمیشە داهێنانیان کردوە بڕوانە کتێبی دووسەدە بێدەنگی زەڕینکوب وەهەروەها بڕوانە مێژووی دەوڵەتی ساسانی چۆنێتی مەقامات و دروسکردنیان. بەندە لەبەرئەوەی خۆم مەقامزانم و گۆرانیبێژم، بەشبەحاڵی خۆم ئەوەی لێی حاڵی بووم بە شانازییەوە دەتوانم بڵێم مقام چۆن دروست دەبێت، بۆ نموونە دە کەس یەک مەقام بڵێن، هەریەکە و بەجۆرێک و لەسەر پەیژەیەک دەیڵێن، کەوایە ئەمە بووە شێوازێکی جیاواز

لەوەی پێشوو یان هەرکەسێک گۆرانییەک یان بەستەیەکی یەکێکی تر بڵێتەوە، هەرگیز وەکو خۆی نایڵێتەوە، مانای وایە بووە چەند گۆرانییەکی تر و هەریەکە و لەسەر پەیژەیەکی تر و بە ئارەزووی خۆی دەیڵێتەوە، بەم شێوەیە گۆرانی و مەقامی تر دێتەکایەوە و دروست دەبێت، بۆ نموونە: هونەرمەندی گەورەی کورد، خودا لێی خۆشبێت سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی زۆربەی گۆرانییەکانی لەسەر (لا و سی) دەخوێند و زۆربەی ژنانیش بەهەمان شێوە، بەڵام یەکێکی وەکو ئەحمەد شەماڵ ڕووحی شادبێت، لەسەر (دۆ، یان ڕێ) یان پەیژەکانی خوارەو گۆرانی گوتووە، یان زیرەکی ڕەحمەتی پێموایە لەسەر پەیژەی (ڕێ و می و لا)، لە ناوەندی ئەم سی پەیژەیەدا گۆرانی گوتووە. ڕەشۆڵی ڕەحمەتی گوێم لە گۆرانییەکانی بووە، زۆربەیان لە پەیژەی (لا، یان سی) گوتووە. بەندە بۆخۆم قورگم بە (لا. سۆڵ) جێگیرە، واتا بەو پەیژانە ئارامە، گۆرانیبێژم، بۆیە هیچ گۆرانیبێژێک؛ وەک خۆی گۆرانی گۆرانیبێژێکی تر ناڵێتەوە، بۆنمونە گۆرانی بێژەگەورەکانی خۆمان زیرەک وماملێ وشەماڵ ومەزهەری خالقی وناسر وحسێن عەلی وشاروخی وزۆریتر مەگەر هەمان گۆرانی و مقامەکانیتر نین بۆ چونکە شێواز و ستایلیان جیاوازە لەو ڕوانەوە کە باسمکردن بۆیە ئاواز و گۆرانی و مقاماتی جیاواز و تازە دێنە ئاراوە چ جای ئەوەی عەرەبێک گۆرانی کوردیێک بڵێتەوە؟ دەکرێت چەند گۆڕانکاریی بەسەریدا بێنێت، یان تورکێک گۆرانی عەرەبێک بڵێتەوە، دەکرێت چۆن بێت، بۆیە مەقام و گۆرانییەکان هیچیان وەک یەک نین و لەسەر یەکیش دەرچوونە، چونکە هەر گۆرانیبێژێک سروشتی قورگی جیاوازە و ئارەزوو و بیرکردنەوەشی جیاوازە و ناتوانێت قورگی لەسەر هەموو پەیژەکان نەسب بکات، چۆن دووزەلە نەسب ناکرێت، زوورنایش

بەهەمان شێوە، بەڵام خۆ باڵەبانیش بەهەمان شێوە هەر فیقەنەیە، بەڵام نەسب دەکرێت بەهەمان شێوە، کەمانچە، عود، ساز، جەمبووش، چەلۆ، گیتار، تار، تەمور، سەنتوور و هەتا شمشاڵیش نەسب دەکرێت، واتا دەستکاری پەیژەکانی دەکرێت، گۆرانیبێژیش هەروەها ناتوانێت لەسەر هەموو پەیژەکان نەسبی قورگی بکات، ئیلا بە پرۆڤەیەکی زۆر نەبێت، هەر گۆرانیبێژە و لەسەر پەیژەیەک ئاسوودەیە گۆرانی بڵێت، بۆ نموونە ئەگەر گۆرانیبێژێک لەسەر (لا) گۆرانی بڵێت، دەبێت گرووپی میوزیک هەر لەسەر (لا) میوزیک بژەنن، ئەگینا بەپێچەوانەوە گۆرانییەکە سەقەت دەردەچێت، گۆرانیبێژەکەش بەهەمان شێوە دەبێت لەو تەبەقەیە دەرنەچێت. نموونەیەکی تر، مەقامی ئای ئای باجەلان، کە لقێکە لە بەیات، زۆر لە گۆرانیبێژان گوتوویانە، وەکو هونەرمەندانی کۆچکردوو ڕووحیان شادبێت: سەلاح داودە، حسێن عەلی، عەلی مەردان، خوداداد عەلی و زۆری تریش، هەروەها مەقامی قەتار و خاوکەریش زۆر لە گۆرانیبێژان گوتوویانە و هیچیان وەکو یەک نەیانگوتووە، بە ناوی سلەمی میوزیکی ئەمڕۆوە قەتار بەیاتە و خاوکەریش حیجازە، حیجازیش پێموابێت هەر لە گازەوە هاتووە، ئەگینا هیچ پەیوەندیی بە حیجاز و جەزیرەی عەرەبییەوە نییە، یان هەیگاز بووە، یان گاز، وەکو گاتار، یان قەتار لە بنەڕەتدا بانگەواز بووە، یان مەقامی قەزاز، ئەم مەقامە بە گوتەی مامۆستای کەمانچەژەنی کەرکووکی بەڕێز، کاک چالاک دەڵێت: حەمە هیوا گوتوویەتی هەمان واتای هەیە. قەزاز، یان گاز، یان بانگەواز لە هەمان سروودەکانی زەردەشتن، کاک ستاری هونەرمەندی ڕۆژهەڵاتیش لەو بارەیەوە گوێم لێبوو وتووێژی کرد لەسەر هەمان بابەت، لە تەلەفزیۆنی سەحەری کوردی ڕۆژهەڵات، مامۆستا چالاکیش باوەڕی وایە هەمان واتای هەیە، واتا گاز. دەمەوێت ئەو ڕوونکردنەوەیەش بدەم،

گۆرانیبێژ هەیە دەتوانێت ئای ئای، یان هیجران، یان حەیران لەسەر پەیژەی (سی) بڵێت، ناتوانێت لەسەر (دۆ) بیڵێت زۆربەیان لەسەر بەیات ئەیچڕن یان حیجاز ئیتر هەریەکەو لەسەر پەیژەیەک دەتوانێت بەئاسودەیی گۆرانی بڵێت  چونکە قورگی یارمەتی نادات. گۆرانیبێژ هەیە هیچ لەرینەوەیەک، یان چەهچەهەیەک لە قورگیدا نییە و ناتوانێت مەقامەکانی هومایۆن و دەشت و سێگا بڵێت، چونکە ئەمانە نەبەراتیان دەوێت، یان زەبزەبەیان دەوێت، بەبێ زەبزەبە سەرکەوتوو نابن، بۆ نموونە وەکو: ئیرەجی دەشتی، محەمەد ڕەزای شەجەریان، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی خوا لێی خۆشبێت، گۆرانیبێژمان هەبوو بەدرێژایی تەمەنی گۆرانی گوت، مەقامێکی نەگوت، دەنگیش هەیە هیچ چەهچەهەیەکی تیادا نییە، بەڕاستی دەنگی کاریگەر هەیە هەر مرۆڤێک گوێی لێبێت یەکسەر دەگری، گۆرانیبێژمان هەبوو دەنگێکی ساف و زیق و پتەوی هەبوو، پەیژەیەکی زۆر بەتوانای هەبوو، قورگێکی تیژ و بێ زەبزەبەی هەبوو، دەنگیشی خۆش بوو، بەڵام بۆ هەموو گۆرانییەک نەدەگونجا، دەنگ هەیە وەکو کەمانچە وایە کە ژەنیارەکە دەنگی لێبێنێت و پەنجەکانی نەجوولێنێت لەسەر ژێکان دایان نەنێت تا ئاوازەکان دەربڕێت هەر بڵێت هاهاها بە گوتەی نووسەران و مەقامبێژان؛ مەقامەکان (حەوت) مەقامن، واتا حەوت پەیژەکە، واتا: (دۆ، ڕێ، می، فا، سۆڵ، لا، سی)، بەڵام لقەکان زیاترن لە حەفتا بۆ هەشتا لقن و بگرە زیاتریش، ئەم لقانە هەر هونەرمەندێک بە ئارەزووی خۆی گوتوویەتی، بەڵام گۆڕانکاریی تیادا کردووە، بۆیە گۆڕاوە بە ناوی خۆیەوە ناوزەد کراوە وەکو حوسەینی، یان دورنیە بۆمەرگی حوسێنی کوڕی ئیمامی عەلی وترابێت وەکو برایمی، یان وەکو تاهیری وەکو هیجرانەکەی مامۆستا عەلی مەردان دەیلێت، دەڵێن هیجرانەکەی م.عەلی مەردان خۆشی بەیاتە، یان وەکو خوداداد عەلی

هەر ئەم مەقامانە دەڵێت و زۆر زۆر جیاوازی هەیە وەکو مەقامی ئەڵوەن بەیاتە و بووەتە مەقامێکی تایبەت، ئەمانە و زۆری تر، بۆ نموونە مەقام هەر هونەرمەندێک، لە هەر نەتەوەیەک بێت بە هەرشێوەیەک بیڵێت بۆ نموونە بەیات، هەر بەیاتە، بۆی هەیە لە ناوچەکانی تر ناوەکەشی بگۆڕن، بەڵام هەر هەمان مەقامە و لە کوردستاندا لەدایک بووە، بەپێی بەڵگە مێژووییەکان زۆر لە کۆندا مامۆستا گەورە عەرەبەکان هاتوون لە کفری لەلای مامۆستای مەقاماتی کوردی ڕەحمەتوڵڵا شەڵتاغ خوێندویانە. مامۆستا شەڵتاغ لە ساڵی (١٧٩٣) لە کفری لەدایک بووە و مامۆستا مەلا وەلی مەقامبێژی گەورەی کورد، ئەم دوو مامۆستا بلیمەتەی کورد لە شاری کفریدا بوون، ئەو هونەرمەندە گەورانەی کە قوتابی ئەمان بوون لەوانە: هونەرمەند ، یوسف عومەر، نازم غەزالی و چەندەهای تر... لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات، ئەگەر لە ئەمانیشەوە فێر نەبووبن هەر لە کوردەوە فێربوون، چونکە سەدەها مقامبێژ و هونەرمەندمان هەبووە لەپێش پەیدابوونی تەکنەلۆژیادا کۆچیان کردووە و نەگەیشتوونەتە سەردەمی میدیاکان، هەروەها لە کوردەکانیش مامۆستای گەورە عەلی مەردان و ئەوانەی لە عەلی مەردانەوە فێربوون هەر دەبنە قوتابی ئەم دوو بەڕێزەو بێگومان ئەمانیش لەپێشینان وەریانگرتووە بێگومان ئەم مەقامانە زۆر کۆنن، ئەم مامۆستا بەڕێزانە لەلای خۆیان پاراستوویانە. دەمەوێت ئەو ڕاستییە بڵێم ماڵی سەلاح داودە و ئەحمەد داودە و زۆر لە داودییەکان هەرچەندە مامۆستا سەلاح داودە، داودی نییە و خەڵکی ناوچەی خانەقینە، پێموابێت لەهۆزی کەلوڕە، هەرچۆنێ هۆزی داودی دەگەڕێنەوە سەر یارسان لەئەسلا خزمەتێکی گەورەیان بە هونەری کوردی کردووە، بەڕاستی دەتوانم بڵێم ئەرشیفی گەورەی هونەر و کەلەپووری کوردی بوون لە گەرمیاندا، بەداخەوە میدیاکان

زۆربەی ئەمانەیـان نەبینیـوە مەبەسـتم لە پێشینانــە و سیـنە بە سینە هاتووە هەتا سەردەمی مامۆستا حەسـەن زیرەک و مامۆستا عەلـی مەردانـیش لەم دواییـانە تـۆماری دەنگـی داهـات، دەنـا هەر ڕاستەوخۆ گۆرانییان دەگوت، ولاتانی چواردەورمـان ئەوان دەوڵەت بوون، چەندەها ئێزگەی ڕادیـۆیـیان هـەبـوو، کەس ئەم مەقامانەی لە هیـچ ڕادیـۆیەکی ولاتە عەرەبیـیەکان نەدەبیسـت. دەمەوێت ئامـاژە بەوە بکەم ئەگەر عەرەب مەقامبێـژی هەبووە، چۆن یەکێـکی وەکو یوسـف عـومەر دێت و لەلای مامۆسـتا شەڵتـاغ دەخوێنێـت بەنـدە بەچاوی خۆم بەرنامەیەکم بینی لـە تەلەفـزیۆنی عەرەبی بەغداد لە هەشتـاکاندا لەسـەر مامۆسـتا شەڵتـاغ ئەنجامـیاندا نەمبسیـت بلێـن کـوردە کـەباسی لێهاتوییـیان دەکرد ئەگەر خۆیـان مقام بێژێکیـان هەبا باسـیان دەکرد بەشـانازیوە کاتێ عەرەب باسـی مقامـات دەکەن دەڵێن مقاماتی عێراقی بۆ چونکو خۆیان نیانە و مقام بێژێکیانیش نیە ئەگەریـش هەبێ لەکوردەوە فـێربووە مقامەکـان زۆربەیـان کـوردین ئەگەر بلێـی محەمەد عەبولوهـاب ئەویش لەئەسـلا دەگەڕێتەوە سـەر قوبتیەکـان یــان یوسـف عـومەر ئەویـش لە شــەڵتاغەوە فێربــوەو مقامەکانی کوردین ئەگەر هەرمرۆڤێ گوێ لەمقامی عەرەبی بگرێت دەزانێت لەئەسلاکوردیە چونکو زۆربەی وشەکان کوردین جا ئەسلی عەرەب بەدووە لە یەک مەقام زیاتـر شک نابەن ئەویش فەرعەومقامی ڕەسـەن وسـەرەکینیە جاباسـمان لەکۆنی گـۆرانی و مقامـات هـات گۆرانی پەیوەنـدی نەبـوە بەمـۆزیکەوە لەپێشـدا گۆرانی و مقـام زۆر لەپێش مۆزیکدا بووە بڕوانە ئەسڵ جا مقامەکـەیان ئەویش هەمـوو کەسێـک گـوێی لێبــووە چۆنەبێگومانــبە بەڕەگــەز عەرەب نـیە مەبەسـتم مامۆستاشـەڵتاغە وەکو ئوم کەلسوم و فەرید ئەترەش و زۆریـتریان هــەیە کوردن و غەیری کوردن لەخوارەوە زیاتر ڕونـی دەکـەینـەوە هەروەها شایەنی باسە زۆربەی شاعیـران و شانۆکاران

و سینەماکاران و نووسەران و هونەرمەندانی ئەم ولاتانەی چواردەورمان کوردن، دەتوانم بلێم هەتا لە ئاستی جیهانیشدا، بەتایبەت لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا زۆر لە سەرکردەکانی ولاتانی چواردەورمان لە کۆن و نوێدا کورد بوون، ئەمانە هەمووی بەلگەن بۆ سەلماندنی بلیمەتی کوردو داهێنانەکانیان لەهەموو ڕویەکەوە نەک تەنها مقامات جا بەلگە زۆرە ئەم مەقامانە کوردین. مەقام چۆن دروست دەبێت؟ بە بۆچوونی من بێگومان لە خەم و خەفەتەوە، خەم و خەفەتیش لە کارەساتی ناخۆشەوە پەیدا دەبێت، چۆن پەیدابوو، بێگومان بەپێی مێژوو و شوێنەوار و کتێبە ئاسمانییەکان و دۆزراوەکان بێت بنەڕەتی ژیان و لانکەی مرۆڤایەتیە جا بۆیە کوردستان لە هەموو ڕوویەکەوە دەولەمەندە و دەولەمەندیش بووە، بۆیە هەموو ولاتان چاویان تێبڕیوە و بووەتە جێگای ململانێ و شەڕ و شۆڕ، دوو هەزار سالە کۆتایی نەهاتووە وژیانیش قەت بێشەڕ نەبووە ژیان خۆی بریتیە لە شەڕ بۆمانەوە بەهەموو شێوازێک با لە باسەکەمان دەرنەچین، شاعیر و هونەرمەند بە زۆری لە خەم و مەینەتییەوە گۆرانی و مقاماتیان بۆ دێت ، چی هۆنراوە بێت، یان گۆرانی، بەتایبەت مەقام، هەموو کەسێک دەزانێت لە کورد چەوساوەتر نییە بە ئەمڕۆشەوە، بۆیە زۆربەی کورد شاعیر و هونەرمەندن ،بڕوانە شیعرەکانیان بریتیە لە خەم وئازارو سکالا لە دەستی جەفا و زولم وزۆرو مەینەتیەکانی ڕۆژگار شاعیر و هونەرمەندانی کوردیش لە هەموو ولاتان بە تواناترن، لەسەرەوە ئاماژەم پێکردە زۆر لەهونەرمەدە دیارەکانی جیهان کوردن تواناو بلیمەتی کوردیش ئینکار ناکرێت لەهەموو بوارەکاندا دەلێن شەجەریانیش کوردە، پێموابێت لوڕە، شەجەریان دەلێت من کاریگەریی هونەرمەندی گەورەی کورد سەید عەلی ئەسغەری کوردستانیم لەسەرە، هەروەها

عوسمان کێمنەییش بە مامۆستای خۆم دەزانم، سەید عەلی لە سالّی (١٩٣٦) کۆچی دوایی کردووە، لە سەردەمی دەوڵەتی ساسانییەکاندا بیستوومە دوو گۆرانیبێژی بەتوانا هەبوون بەناوەکانی باربەد و نەکیسا، ئەوانیش کورد بوون ، لە دیوانی شاهانەدا دادەنیشتن بەلاّم ئێمە خاوەنی: سەید عەلی، مامۆستا شەڵتاغ ، مەلا وەلی، مامۆستا حەسەن زیرەک، خوداداد عەلی، مامۆستا تایەر تۆفیق، عایشەشان، محەمەد عارف، مەلا کەریم، کاوێس ئاغا، مامە سێوە، عەلی مەردان، سەید محێدین (خەڵکی دێی حەمکە، ناسراو بە کوێستانی)، مامۆستا حەمەساڵح دیلانی شاعیر و مەقامزان و خاوەنی سروودی نەورۆز و چەندەها گۆرانی و بە ستەی بەسۆز، مامۆستا عەزیزی شارۆخی لە ڕۆژهەلاّتی کوردستان و چەندەها مەقامبێژی گەورە هەن لە کوردستانی گەورەدا لە دوایدا ناوەکانیان دەخەمە بەر دیدەی بەڕێزتان، دەتوانم بڵێم زۆر لە هونەرمەندە دیارەکانی ئەم ولاّتانەی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست کوردن، بۆ نموونە: ئوم کەلسوم، مامۆستا عەلی مەردان ئەوەی سەلماندووە، هەروەها وەزیری دەرەوەی چیکیش ئەوەی دووپات کردووەتەوە کە ئوم کەلسوم کوردە، باشە من پرسیارێکم هەیە لە ڕۆشنبیران و هونەرمەندان بەگشتی، ئایا یەکێکی وەکو ئوم کەلسوم کورد بێت و دەیەهای وەکو ئوم کەلسوم، ئیتر چۆن مەقام و هونەری کوردی ناگاتە ولاّتان، یان یەکێکی وەکو ئیبراهیم تاتلّیساز، چونکە خۆی کوردە، هەموو مەقام و گۆرانی کوردی دزیوە بۆ تورک، ئەوەتا بە ئاشکرا مەقامی لاوک دەچڕێت و بەستە کوردییەکان دەکاتە تورکی و بە تێکستی تورکییەوە، ناشلّێت ئەمانە موڵکی گەلی کوردن، دەیەهای تری وەکو براهیم تاتلّیس هەیە لە عەرەب و لە فارس لە تورک بوونەتە هونەرمەند بەسەر هونەری کوردەوە، ئەگەر هونەرمەندێکی کورد هونەرێک بنوێنێت، یان داهێنانێک بکات، ڕاستەوخۆ هەزار و

یەک ناو و ناتۆرەی لێ دەردەکەن و ئەمە هی فلان نەتەوەیە و هی فلانە کەسی بێگانەیە، بەڵام هیچ کاتێک لەسەر کەلتوورە ئەنفالکراوەکەی خۆیان نایەنە وەڵام، بەداخەوە کورد زوو مودمین دەبن بە ئەفیونەکانی بێگانە و بێئاگا لەوەی بزانن چ زیانێکی گەورە لە خۆیان و نەتەوەکەیان دەدەن، بۆیە کورد لە هەموو ڕوویەکەوە وا بچووککرایەوە هەموو شتێکمان لەدەست دا و بووە موڵکی بێگانە. خوێنەری بەڕێز، ئەمانە هەموو بەڵگەن، ئەمانەش نۆکەری بێگانەن وکار بۆ نەهێشتنی مێژووو کەلتورەکەمان دەکەن دەیانەوێت هەموو داب ونەریتێکمان بشۆرنەوە چۆن مێشکی نەوەکانمان دەشۆرنەوە، ئەمانیش بەهەمان شێوە کەلتوورەکەمان دەشۆرنەوە مەبەستم هونەرمەندە جاشەکانی کوردە لە ئێرانیشدا زۆر هەن، بۆ نموونە وەکو: ئیرەج دەشتی، هایدە و مەهەستی خوشکی و دەیەهای تر، ئێمە چۆن وڵاتەکەمان داگیرکراوە، ئاوەهایش هونەر و کەلتوورمان داگیرکراوە من مەبەستم ڕەگەز پەرستینیە و دەزانم هونەر سنوری نیە و بۆ هەموگەلانە بەڵام ماف وشانازیەکەی دەبێت  بۆ داهێنەرەکەی بێت هەموو جیهان ئەوخاڵەیان ڕەچاوکردووە کەس ناتوانێ دەس بۆماڵی هیچ کەسێ ببات  بەبێ مۆڵەت ئەگینا کار دەگاتە یاساو دادگا ئەوەتا ئێستا بە چاوی خۆم و بە گوێی خۆم دەبیسم و دەبینم چۆن چۆنی گۆرانی و مەقامەکانمان تەعریب و تەفریس و تەتریک دەکەن و هیچ باکیان نییە، چونکە ئێمە دەوڵەت نین، هەروەک چۆن خاکەکەمان دابەشکراوە، ئاوەهاش کەلتوورەکەمان دابەشکراوە، بەڵگەی ڕەسەنایەتی مەقامی کوردی چین؟ بۆ نموونە: ئەڵلاوەیسی، بە بۆچوونی من پەیوەندی بە وەیسەکانەوە هەیە، وەکو وێردێکی ئاینی خوێندراوە لە زەمانی ساسانییەکاندا، لەو سەردەمەدا بە وتارخوێن و پیاوی ئاینییان گوتووە وەیسی، لەسەر هەمان دینی

زەردەشت پێغەمبەر، بووە ئێستاش هەر پەرستگا و گۆڕەکانیان لە زۆر شوێن ماون، گومەزییەک هەبوو لە ڕێی خانەقین- شارەبان لەم دواییەدا عەرەبەکان تەقاندیانەوە بە ناوی بیدعەوە بە ناوی ئیمام وەیس، هەر جادەکەش بە ناوی ئیمام وەیسەوەیە، لە (١٩٧٩) خۆم کارم تیادا کردووە، خۆم ئیمامەکەم بینیوە و چوومەتە ناوی، مەبەستم مەرقەدەکەیە، دوژمنەکانی کورد هەموو شتێکی ئێمە دەکەنە بیدعە تاوەکو لەناوی بەرن، ئێمەش شانازیی پێوە دەکەین بە ناوی ئاینەوە، جامن مەبەستم پیلانەکانی ناحەزان دوژمنەکانی کوردە مەبەستم دارو بەردنیە خۆ خۆی هەزاران بیدعەی هەیە ئەی بۆ ناپرووخێنێت بەو بیانووەوە دەیەوێت لە هەموشتێک داتماڵێت و ڕوتوو قوتت بکاتەوە وڵات بە یادگاری و بەکەلتورەوە جوانە و خۆشەویستە گەر ئەمانەی لێداماڵرێت هیچ بەهایەکی نامێنێت ئەمانە هەموو نموونەن بۆ لەناوبردنی هەموو نەریتێکی ئێمەی کوردی نەخوێندەوار، مەبەستم لە ئێستایە، هەتا خوێندەوار بووین، کۆیلە نەبووین، بەڵام ئێستا سەدەها مەرقەد لە کوردستانە، هاتوون باو و باپیری ئێمەیان کوشتووە و بە هانی لایەنگرانی بیروباوەڕە جیاجیاکانەوە کراونەتە شەهید و پیرۆز کراون و هەتا ئێستاکەش ماون و خەڵکی دەچنە زیارەتیان، ئەوانە بیدعە نین، بەڵکو زۆربەشیان پاسەوان و خزمەتکاریان بۆ دانراوە، گوایە ئەمانە شەهیدن و لەگەڵ کافردا جەنگاون، کافرەکانیش خوداپەرست و زەردەشتی بوون و باو و باپیری خۆمان بوون، ئەوانەش خۆیان دا بە کوشت لەسەر ئەم خاک و ئاوە، نە گۆڕیان دیارە و نە ناونیشانیان، بەڵکو کافر کراون، هەرچی دابونەریتیشمان هەبوو لە ئێمە حەرامکرا و کرا بە بیدعە بەئێستاشەوە، بەتایبەت گۆرانی و مەقام و سروودەکانمان، لە پاشان بۆ خۆیان بەکاریانهێنا، لەهەمو بۆنەکاندا کردیانە موڵکی خۆیان جا بۆنمونە یەکێ وەکو بەڕێز

مامۆستا شێخ محەمەد عبدلباست عەبدلسەمەد فێری خوێندنی قورئانی پیرۆزی کردن وەک لەسەرەوە باسمکردوە زۆربەی پێشەواکانی دینی ئیسلام لەپێشدا کوردبون و هەزارانیتر دیارن، هەتا ئەمرۆ بە شانازییەوە خزمەتێکی بەرچاویش دەکات و شانازیشی پێوە دەکەن، باوەڕ بکەن کوردستان ئەمەشی ماوەتەوە هەژاران و دڵسۆزانە هێناویانە تا ئەمرۆ، ئەگینا زۆربەی کورد ڕاستەوخۆ، یان ناڕاستەوخۆ بازرگانی بەکەلتوری کورد و خاکی کوردەوە دەکەن، هەرچیش ڕوویدابێت هەر هەژاران و دڵسۆزان باجەکەیان داوە، ئەگینا بە پیاوە ئاینییەکانمان و ڕێکخراوە ئاینییەکانمان و کاربەدەستانی وڵات و ئەوانەش زۆر بە گەرمی خاوەنی بیروباوەڕی ئاینین، هەر خزمەتی دوژمنانی کورد دەکەن، چونکە هەر ئاین و ڕێبازێک لە کوێوە دەرچوو و بگاتە هەر کوێ، لە ژێر هەرناوێکدا بێت خزمەتی ئەو وڵاتە دەکات لێوەی هاتووە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت من ڕقم لێیبێت نەخێر وانیە چونکە ئەو ڕێبازە لەهەرکوێوە سەری هەڵدابێت حەتمەن لە دژی زوڵم وزۆر و ناعەدالەتی ئەو وڵاتە سەری هەڵداوە جا ئەگەر سەریگرت و پەیڕەوکرا خێرو بێری بۆ ئەو وڵاتەیە لەهەموو ڕویەکەوە جا لە هەرکوێ جێ بەجێ کرا خزمەتە بەو وڵاتە خۆ هەموو کەسێک دەزانێت وڵاتی نەجد و حیجاز چۆن بووە بەر لە هەزارو چوارسەدو پەنجا ساڵ هەرکەسە بە تەواوی پەیڕەوی بکات، ڕێک دەبێتە یەکێک لەوان، نمونەیەکتان بۆدێنمەوە لە شوڕشی ئۆکتۆبەرەوە ساڵی ١٩١٧ ـ هەتا کۆتایی حەفتاکان لە زۆربەی حزبە چەپەکان خزمەتی بەرچاویان دەکرد بە سۆڤیەت لەبەر ڕێبازی مارکسی ولینینی زۆربەی جیهانیش بەتایبەت سەرمایەدارانی جیهان بەهەموو ئایینەکانیشەوە دژی بوون لە پاش سۆڤیەتیش وڵاتانی ڕۆژئاوا لەڕێگای زانستەوە و بەهێز دەستیان گرد بەسەر ئابوری

وبیرو باوەڕی جیهاندا وئێستا جیهان بۆ ئەوان هیلاک دەبێت هەرچی بازرگان و سەرمایەدارانی وڵاتان هەیە ڕاستەوخۆ لە بەر بەرژەوندی خۆیان خزمەتکاری ئەوانن جا خەڵکانێک هەن لە بەر سودوو قازانجی خۆیان خزمەتی بەرژەوندی گشتی وڵاتان دەکەن ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ و ڕۆژانە زەرەری مادی ومەعنەوی دەدەن لەوڵاتی خۆیان لەهەموو ڕوویەکەوە هیوادارم مرۆڤەکان بیربکەنەوە هەر وەها ئێستا بە هەزاران خەڵکمان هەیە لەبەر بەرژەوەندی ڕێبازەکەی یان بەرژەوەندی تایبەتی خۆی زۆربەتوندی دژایەتی ئەو کەسانە دەکەن کە خۆیان فیدا کردووە بۆ پارێزگاری لەخاک و ئاوی وڵات و بەرژەوندی گشتی ئەگەر لە ناوچوو هەمووی دەڕوخێت و پێی هەموو دەگرێتەوە زەرەرەکەی وەک چۆن ئێمە خاوەنی دەسەڵات و دین و جوگرافیایەکی فرەو فروان بوین و خاوەنی دینی زەردەشتی بوین، بۆیە دەسەڵاتمان گەیشتە دەریای خوێ، یان دەریای مردوو بەڵام ئاینەکەیان لێسەندینەوە، ئاوامان بەسەرداهات کە دەیبینیت، ئاین پێش هەموو شتێک دروست بووە و مرۆڤ بێ ئاین نەبووە، هەموو جیهان ئاینی هەبووە و وەکو ئێمە خۆی نەکردووە بە کۆیلەی بێگانە بۆ دوو فلس، یان ئێسک مژین، ئێمەش خاوەنی ئاینێک بووین بە بۆنەی ئاینەکەمانەوە خاوەنی کیان و خاکێکی پان و بەرین بووین، بەڕاستی ئاینەکەشمان زۆر بۆ پێشەوەی بردوین و پێم وابێت وڵاتانی عەرەبیش هەر بە ئاین بوون بە ئەم عەرەبە و هەر لە بەر پیرۆزی ئاینەکەشیان ئاوا گەورە بوون، ئێمە و دەیەها وڵاتی وەکو ئێمەیان لە گێژاودا خنکاندووە هەرلە بەر خاتری پەروەردگارو پیرۆزی ئاینەکەشە هەموو شتێکی لەبیر ئێمە بردووەتەوەو لەبەر پیرۆزی و خودا پەرستی خۆمان کردۆتە قوربانی بەرژەوەندیەکانی مێشک خۆرەکانی مرۆڤایەتی

بەلام پێموابێت زانست گەیشتووەتە ئاستێک هەر بەو چەکەی خۆیان لەناویان دەبەن، حەزدەکەم بۆ زانیاری زیاتر بڕوانیتە کتێبی (پشتیوان هەڵەبجەیی، بکوژی خوا)، ئەوە ناوی کتێبەکەیە، ئاینیش زۆر شتی کرد و زۆریش زەرەری دا، زۆر شتی دروستکردووە، وەکو سروود و زیکر و شیعر و ئاواز بۆ نیشتمان و دژایەتیکردنی غەیرە ئاینەکەیان، هەر ولاتێک ئاینەکەی سەرکەوتووە، ولاتەکەشی سەرکەوتووە، خاک و ئاو و نەریت و دینەکانی تریشی هەڵلوشیوە وەکو حزب چۆن لە دژی حزبی تر دروست دەبێت، دینەکانیش لە دژی یەکتری دابەزینە. دەتوانم بڵێم دینیش هەر حیزبە و حزبایەتیش هەر لە دینەوە سەری هەڵداوە خوای گەورەش لەقورئاندا ئاماژەی داوە بەحزبایەتی ، بێگومان ئێمەی کوردیش لەپێش هەموو میللەتانی دونیادا خاوەنی خاک و ئاو و دین و نەریت و کەلتووری خۆمان بووین، بەلام لە دەستمان دا، ئێستاش پێمان عەیبە بلێین ئەوە هی ئێمەیە، نموونەیەکی تری زیندوو، ئێستا هۆرە، بە بۆچوونی من زۆر بەڵگەش هەیە بە ناوەکەیدا دیارە کە هۆرە لە زەمانی ئاهۆراییەکاندا هەر هەبووە و هەر ماوە و ئێستاش گوێگری زۆرە، بە بۆچوونی من ئەوانەی هۆرەیان گوتووە؛ وەکو پیاوی ئاینی ئەو سەردەمە بوون و زیکری خۆریان کردووە، یان مۆغی ئەو سەردەمە بوون، چونکە ناوی زۆریش هەبوو وەکو هۆریزا، واتا ئەوەی پیاوی ئاینی، بۆ نموونە سەیزادە، یان شێخ زادە، لە پێشتریشدا ئاماژەم پێ کردووە، بێگومان هۆرەش بەشێکی سەرەکی بووە لە میوزیکی کوردی لە سەردەمی میترایییەکاندا، یان هۆرییەکاندا، ئەگەر بتەوێت بەڵگە زۆرە بۆ سەلماندنی مقام کە موڵکی کوردن، پێش ئەوەی موڵکی هەر نەتەوەیەکیتر بن، مامۆستا محەمەد هاشم ڕەجەب نووسەری عەرەب، لێکۆڵینەوەی

کـردووە لەبـارەی مقـاماتەوە، دەڵێـت: مەقـامی ئـای ئـای لەنـاو باجەڵانەکانـەوە سـەری هەڵـداوە، هەروەهـا مامـۆستا عەلـی مەردانیش ئەوە دەسەلمێنێت لـە کتێبەکەیدا، (بڕوانە کتێبەکـەی مامۆستا عەلی مەردان، مقامبێژی گەورەی کورد). م. عەزیز خەیات ئێسـتاش خەیاتە و لە خانەقینە، دەڵێت: لە سەردەمی پێغەمبەری ئیسلامدا (ﷺ) ئەم مەقامە گوتراوە بە ناوی مەقامی باجەڵانەوە، بەڵام ئێسـتا کـراوە بە بەیـات، بەیاتیـش بەیـادە، نەک بەیـات، بەڵام یەک پیتـیان لابـردووە (د) یـان کـردووە بە (ت). پـرسیاریک لـێرەدا سەرهەڵدەدات، ئەڵلاوەیسی سێ بەشە، یان سێ پەیژەیە، دەتوانم بڵێم لە سێ گـۆشە مەقام پێکهاتـووە: عەجەم و نەهاوەند و ڕاست، بەڵام قورگی گۆرانیبێژ لە یەک شوێندا ناوەستێت و یاریی دەکات بە نێو مقامەکاندا، بە گوتەی میوزیکزانەکان، یان ئەکادیمییـەکان کە کار لەسـەر نۆتـە دەکەن (لە پێشـتردا ئامـاژەم پێ کـردووە)، لە پێش ئیسـلامدا بە غەیری عەرەبیان گوتووە عەجەم، ئەڵلاوەیسـیش زۆرجار گوێم لێبووە هونەرمەندان دەڵێن گوایە عەبدوڵلا وەیسی ناوێک گوتوویەتی، دەشێت ئەم پیاوەش گوتبێتی و داهێنانی تیادا کردبێت، بەڵام زۆر کۆنە مەقامەکە. کورد بە عەبدوڵلا دەڵێت ئەولا، واتا بووەتە ئەولاوەیسی، بەڵام لەسەدا سەد پەیوەندی ئەڵلاوەیسی بە وەیسـییەکانەوە هەیە، خـودی نـاوی وەیسـیش لە وەیسـەکانەوە هاتووە، زۆرجـار دەبیـستم و گوێم لێ دەبێت لە کەناڵەکاندا لێدوان لەسـەر ئەڵلاوەیسـی دەدەن بەجۆراوجـۆرهەریەکەو بەپـێی زانـینی خـۆی چـۆنی بیسـتووە و چۆنـیان بـۆباسکردووە ئاوەهـا دەیگێڕێـتەوە بەبـێ بەڵگـەو بەبـێ سـەرچاوەی باوەڕپێـکراو ئەڵلاوەیسـی زۆر کۆنە، مانـای وایە ئەم مەقامە پەیوەندی بەگەلانی ترەوە نییە، بڕوانە ئەم دێرە شیعرە، ئەمە بەڵگەیە بۆ ئەم وتـانەم شاعیر دەڵێت: **با بچینە سەر وەیس بۆ تۆبەکاری**

## تۆبە لــە گشتی نەک لە دڵداری.

هەروەها مەقامی خورشیدی بە ناوەکەیدا دیارە هی زەمانی هۆریەکانەو بگرە لەزەمانی میترایەکانیشدا هەبوبێت وەکو ئاوازەکە چونکە هەموو ئاوازەکان تێکستەکەی ئاساییە بگۆڕێت هەرکەسەو دەتوانێت بۆمەبەست و بۆنەیەک بەکاری بێهێنێت ، لەپێشی هۆریەکانەوە بووە هۆرییەکان، هۆر واتا خۆر، یان وەر، دەمەوێت زیاتر ڕوونی بکەمەوە، میتراییەکان ئاگریان پەرستووە، لە پاشان بوونە خۆرپەرست، بۆ ئاگاداری میتراییەکان چەند قۆناغێک پێش هۆرییەکان بوون، واتا ئارییەکان، بێگومان دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای ژیان لە ئاگرپەرستییەوە گەیشتنە هۆرپەرستی، واتا خۆر، خۆرپەرستییەکەش هەتا سەردەمی حوکمی ئیمبراتۆری نەمروود شا، واتا سەردەمی ئۆرک و شەڕەکەی پێغەمبەر ئیبراهیم بەردەوام بووە، هەتا سەرهەڵدانی ئاشوریەکان لەو سەردەمەدا ئاشوریەکان بون هێرشیان کردەسەر وڵاتی خۆریان وکاولکاری زۆریان ئەنجامداوە لە خوارەوە زیاتر ئاماژەم پێکردووە، بەڵام لێرەدا مەبەستم سەلماندنی مەقامەکەیە کەناوی خۆری پێوەیە بڕوانە خۆرشیدی دیارە لە بنەڕەتدا کوردییە، ئەم مەقامە بە تێکستی ماچۆش دەگوترێت، زمانی ماچۆش خودی زمانی زەردەشت بووە، واتا ئاڤێستا، ئاڤێستاش واتا کتێبی بانگەوازی خوداپەرستی، واتا گازەکان، بۆ نموونە وەکو قورئانی پیرۆز، قورئان واتا خوێندنەوە، نووسینەکەشی بە ئایەتەکان ناسراوە و سورەتەکان کە بانگی مرۆڤ دەکات بۆ چاکەکاریی و خوداپەرستی، بە خوێنەرەکانیشیان دەڵێن قورئانخوێن و وتارخوێن و مەلا و زانایانی ئیسلام، بێگومان ئەم مەقامەش لە زەمانی هۆرییەکانەوە هەر هەبووە، قەسیدەی ئاینی پێ خوێنراوە، بۆیە ناوی خۆرشیدییە. خوێنەری ئازیز، لەم کتێبەدا ئەم گوتانەم زۆر دووپات کردووەتەوە، بۆئەوەی بیسەلمێنم بۆ تۆی ئازیز و هێژا، چونکە قسە

قسـه دەردەكـات، كـورد واتەنـی، چـونكه باسـەكەم لەسـەر مەقـامی كـوردییه، واتـا له كـاتی خۆرهەڵاتنـدا زیكـری خۆریـان كـردووه له سپێدەی بەیانیدا، بۆیه گوتوویـانه خورشـیدی، ئەمەش هەر به زمـانی مـاچۆ دەگوترێـت، یـان به شـیعری مـاچۆ زۆر زۆر جیـاوازە له زمانەكـانی سـەر زەوی، ئەم زمـانەش كـۆنترین زمـانی سـەر گـۆی زەوییه، لەسەرەوە ئاماژەم پێكردووە، بۆ نموونه هەموو نووسـەران و شاعیران بەم زمانه نووسیویانه، بۆیه نووسینەكانیان ئەوەنده بەهێز و پووخت و پاراوە، بڕوانه جەنابی مامۆستایانی پایەبەرز: مەولەوی، نالی، مەلا عومەری ڕەنجوری، مەلا سـەید عەباسـی كاكەیی، سـەیدی هەورامی، بێسارانی، وەلی دێوانه، شێخ بابـاعەلی (ناسـراو به بێدار) و چەندەهای تر، هەروەها زمانی كۆنترین نەتەوەیه، بۆچی هێنده پاراو و بەهێزە؟ چونكه زمانێكی ستانداردی، واتا گشـتی كوردی، دینی ئەو سـەردەمه بـووە، لەبەر خوداپەرسـتی هەمـوو بوارەكـان پەیوەنـدییان پێوە كردووە، لەبەرئەوەی باش شـارەزابن، چـونكه سـەرچاوەی ژیان بووە له ڕووە مەعنەوییەكەوە و هەم ڕۆژانەشیان، ئینجا هەموو كەس هەوڵـی داوە لەو ڕووەوە خـۆی دەربخـات، بـۆیه زمـانەكەش زیـاتر و زیاتر پەرەی سەندووە و پـاراو بـووە، وەكـو زمـانی (قورئـان)، بڕوانه (قورئانی پیرۆز)، ئێستا هیچ كەس ناتوانێت دەستكاریی بكات، هەمـوو هەوڵـی جوانكـاریی دەدەن بـۆی، چـونكه خەڵكێكـی زۆر نـانی پێـوە دەخـوات، ئەوەی نـانی لـێ دەخـوات، بـڕوانه چەنـده بەتوانـایه، چەنـد دڵسۆزە بۆی، هەركەسێك به تەواوی لەبەری بكات، چەنده ناتقه، واتـا زمـان پـاراوە، كـاتی خـۆی دینـی زەردەشـتیش نانیان پێوە دەخـوارد، بۆیه گەشەی كرد و گەیشته زۆربەی وڵاتـانی دەوروبەر، كه نـانەكەی نەمـا، ئەویـش دای له كزیـی و ئەوەش زمـانی كـوردە كه خـاوەنی كۆنترین دینه و ئەو دینەش دینـی (زەردەشـتییه)، ئەوەش سـەلمێنراوە بۆ هەموو سـەر زەوی، بەڵگەش بۆ ئەم گوتـانەم ئەوە شـوێن هەواری

زەردەشتییەکانە، بگرە زۆر زۆر پێش زەردەشتییەکان و میتراییەکان و هۆرییەکانیشـــە، لە بـــاکووری کوردســـتان شـــارێکی گەورە هەیە، مـاوەیەکە دۆزراوەتەوە (٨٠) مەتـر لەژێر زەویـدایە، ئێسـتاش جێگـای (٣٠٠٠٠) سـی هەزار کەس دەکاتەوە، ئێستا تورکیـا دەیەوێت بیکـات بەژێـــر ئـــاوەوە، چـــونکە شـــوێن هەواری کـــوردە، کە مێـــژووەکەی دەگەڕێـــتەوە بـــۆ زەمـــانی چـــاخی بەســـتەڵەک هەروەهـــا دەیەهـــا شـوێنەواری تـر هەیـە لە بـاکوری کوردسـتان بەتـایبەت لە دیـاربەکرو شـــاری ئـــامەد دا مێژووەکەیـــان دەگەڕێـــتەوە بـــۆ دوازدە هەزارســـاڵ وکـــۆنتریش جـــا دیـــن ودیـــانەتی زۆر هەبـــووە و هەرلەگۆڕانـــدابووە خـودای زیـاتر هاتوونـەتەئاراوە هەتـا گەیشـتونەتە ئەمـڕۆ لەو دەمەدا خوداکـانی: ڕەشـەبا، لافـاو، بـاران وبەهـار، زسـتان، مانـگ، ئەسـتێرە، تاریکی، هاوین، هەورە بروسکە ، تاریکی و وشکەساڵی و بـۆرکان و هەروەها زۆر لە دارو درەخت و هەتا ئاژەڵیش پەرستراوە زۆرئاین و خـــودای تـــر هەبـــوون، لەو کـــاتەدا دیـــن و دیـــانەت لەم وڵاتـــی کـــوردەوارییەوە داهـــاتووە، ئەمـــانە پـــێم وابێـــت لەپـــێش لافـــاوەکەی زودزودرادا بـوە لەگلگامێشـدا نـاوی هـاتوە ، یـان نـوح، لە پێشـتردا ئاماژەم پێکردووە، لەپاش لافاوەکە، دینی هۆری هاتووەتە ئاراوە، بە بـۆنەی دەرکەوتنـی تیشـکی خـۆرەوە یـان هـۆرەوە بەنسـبەت دینـی میترایەکان واتا ئاگریەکان یائاریەکان پێم وابێ لەپێش نوح دا بون و دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای مرۆڤ و گەشەکرنی ژیانی مرۆڤایەتی ئـاگر زۆرکۆنترە دورسکردنی کەشتیەکە ئاگرو قیرو زفت و هەڕە و دار و چەکـوش و چەقـۆ و بســـماری ویســـتووە بێگومـــان دروســـتکردنی کەشـــتیەکە ئەمـــانەی تیـــا بەکـــار هێنـــراوە ئەوەش بڵـێم کە نـــوح وگەلەکەی ڕزگاریـان بـوو خۆشـیان کـردوو ئاگریـان کـردەوە لەسـەر چیای گودی ئەو جودی دیارە لەپێشدا ئاگر هەبووە ئەم وتەیەم ئەوە دەسـەلمێنێت کە دینـی میتراییەکـان، واتـا ئارییەکـان پێش نـوح هەبونە

هۆرییەکـان و میتریەکـان بەدوای یەکـدا هـاتوون، لێـرەدا دەمەوێـت ڕونکـردنەوەیەک بـدەم چـۆن خۆرپەرسـی هاتەکـایەوە لەبەر ئەوەی ئـاوو لافـاو و تەمومژ نەمـا تیشکی خـۆر پەرەی سـەندوو زەوی لە ڕۆژهەڵاتەوە شـین بـوو بـووژایەوەو بەروبـوم پەیـدابوو ژیـانی مرۆڤەکـان خۆشـبوو بەرەو ئاسـودەیی دەڕۆیشـت بەبۆنەی تیشکی خۆرەوە بۆیە بەچاوی پیرۆزی دەیان ڕوانیە خۆرو تا گەیشتە ڕادەی پەرسـتن لەپاشـان بۆ مـاوەیەکی دورو درێـژ دینی زەردەشتی پەیدا بووە و ئەوەندە بەتوانا بوون، کورد لەژێر زەویدا خانوویـان کـردووە، زاناکـان دەڵـێن لەبەر ئاگرێک ئەوەیـان کـردووە، کە باڵدارێک هەبـووە ئاگری وەشاندووە، مەبەستیان لە دەینەسور بووە. دیارە کـورد هەر دەینەسـورە کـاتی خـۆی پیـان وتـوە سـیمرخ ئەوان دەڵـێن شـتێکی سـەماوی بـووە، دەیبەسـتنەوە بە ئـاینەوە، بە بۆچـوونی خـۆم دەڵـێم لەبەر هەورەبروسـکە بـووە، چـونکە زەمـانی بەفـر و بەسـتەڵەک بـووە دەینەسـوریش هەبـووە، چـونکە لەو سـەردەمەدا دەینەسـورەکان هەبـوون، ئەوە بـۆ خـۆی مێـژوو سـەلماندوویەتی کە دەینەسـوری باڵـداریان هەبـووە لە شـێرێک گەورەتـر بـووە لە دەمیـیەوە ئـاگری وەشـاندووە، بەڵـگەش ناشـیۆناڵ جـوگرافیکی عەرەبـی بەرنـامەیەکی تێروتەسـەلی بێ پێچ و پەنـای نیشـان دا بەر لە یەک دوو سـاڵ، واتـا لەم سـەردەمەدا دەینەسـورێکیان دۆزیـوەتەوە لە ئەشـکەوتێکدا باڵـدار بـوو، کە لە ئاگروەشـێنەکان بـوو، چەنـد مرۆڤێکـی کوشـتبوو، فەرەنجییـان لەبەردا بـوو و شمشـێریان پێـبوو، لە کەڵـوەزێکدا دۆزییانەوە کە لەگەڵ دەینەسورێکدا خـوێنی تەڕیان لە دەینەسورەکە دەرهێنـا، چـونکە لەژێـر بەفـردا دەریانهێنـا، ئەو نـاوچەیە هەمـووی بەسـتەڵەک بـوو، ئێسـتاش لە مۆزەخـانەی ئەڵمانیـایە و هەتـا کـاتی دەرهێنـانی لەژێـر بەفـردا بـوون. تیمێکـی بیـانی بـوون چەنـدجار دووبـارەی کـردەوە، هەربـۆیە ئەو خانووانەیـان لەژێـر زەویـدا

دروسـتکردووه، مەبەسـتم لەکۆنی گەلـی کـوردە چەنـدە دێـرینە لەم سـەرزەمینە و بەتـایبەت لەڕۆژ هەڵات و کوردسـتاندا بگەڕێـرەوە بـۆ بەڵگەنامە نهێنییەکانی کورد لە بەریتانیـا، لە یەکێک لەو ڕاپـۆرتانەی لە ئەرشیفەکەدا بینیویەتی؛ د.کەمال مەزهەر دەڵێت: سێ هەزار ساڵە کـورد لەم نـاوچەیە دەژی. بە گـوتەی بەریتانیـیەکان ئەم مێـژووە شتێکی تازەیە، دەڵێن سێ هەزار ساڵە هەم ماڵیان ئاوابێ دانیان ناوە بە سێ هەزار ساڵ کەم نیە مەبەستم دان پێـدانانەکەیانە دەڵێن سێ هەزار سـاڵە زۆر لەگەلان دان نانێـن بەبـونی کـوردا بەڵام شوێـنەوار هەیە لە کوردسـتاندا هـی دوازدە هەزارسـاڵە بێـگومان بەنـدە بەدوای بەڵـــگەدا دەگەڕێـــم بـــۆ دێریـــنی گەلـــی کـــوردو کەلـــتورەکیدا لە هەموڕوویەکەوە بەتایبەت هونەری مقامات مۆزیک ئەم هەمـوو بەڵگانە دەیسـەلمێنن ئەم مەقامـانە مـوڵکی کـوردن، مەبەسـتم کـۆنیی میللەتـی کوردە لە ناوچەکەدا، ئەم بەڵگانەم بۆ ئەوە هێنایەوە وەکو سـەرچاوە، بـــــڕوانە ئەمەش ئەم ئـــــامێرانەن لە کوردســـــتان دۆزاونەتەوەو دروسـتکراون، ئەمـانەن: سێـتار، عـود، تەنبـور، چەنـگ، شمشـاڵ، چەغەوانە، یان چەقەوانە و خۆی چەچەوانەیە، باڵەبـان تـارو قیسـارە، بێگومـان گیتـاریش پەیوەنـدی هەیە بە گاتـاوە، کـورد و ئـاینەکەی کـۆنترین خەڵکـی ئەم نـاوچەیەن و خـاوەنی زۆر داهێنـان بـوون، بـۆ نمـوونە وەکـو خـانووبەرە و کشـتوکاڵ و پیشەسـازیی و میوزیـک و گۆرانی و مەقام، بگرە تـا دروستکردنی زێڕ و زیـو و پەیکەرتاشـی و وێنەکێشـان و زۆر شـتی تـر، بـۆ نمـوونە دەمەوێـت ئەم ڕاسـتییانە بسەلمێنم تا نەوەی کورد خۆی بە کەم نەزانێت، ئەگینـا مـن پەیوەنـدیم بەسەر ئەوەوە نییە تۆ چ دینێک دەپەرستیت یان لەسـەر چ دینێکیت، بەڵام ئەرکە لەسەر هەمووکوردێک پارێزگـاریی لە کـەلتوور و خـاک و ئـاوی خـۆی بکـات، مـن مەبەسـتم ئەوە نییە تـۆ بگەڕێنمەوە بـۆ پێش چـوار پێـنج هەزار سـاڵ هەتـا (پێغەمـبەری ئـاخر زەمـانیش) درودی

خودای لەسەربێت، لەو سەردەمەدا هانی خەڵکی داوە بۆ پێشەوە چوون، کەچی ئێستا خەڵکێک پەیدابوون دەڵێن بەر لە دوو هەزار ساڵ خەڵک چۆن ژیاون، ئێوەش ئاوەها بژین، دەیانەوێت ژیان بوەستێنن، بێگومان کەس ناتوانێت رێ لە پێشکەوتن بگرێت، ئەم بەرنامەیە بۆ ئاقوڵخۆرەکانی بیابانەکان زۆر باشە و لە قازانجی ئەوانە، ئەوان حەزیان لە پێشکەوتن نییە، چونکە مێشکی مرۆڤ گەشە دەکات، کەلتوورەکان لە زۆر بواردا دەگۆڕێن، هەموو ولاتێک گرنگی دەدات بە کەلتووری خۆی، یان بە تەنها دەمێنێتەوە، چونکە هەر بەو کەلتوورە هەموو کەلتوورەکانی لەناوبرد، بۆ نموونە لە ناوچەی گەرمەسێردا هەتا ساڵی حەفتاو پێنج زمانی ماچۆ کۆتایی نەهاتبوو، کە زمانی فەرمی کوردی زەردەشتییە، بەڵێ وەکو مێژوونووسان باسی دەکەن (دینی زەردەشتی) و دەوڵەتەکەی کە ئیمبراتۆری ماد بوو لە ساڵی (٢٥٠) پ.ز لەلایەن ئەستیاکەوە دوا ئیمبراتۆری مادەکان و فەرماندەی سوپای مادەکان (ئارپاک) کۆتایی هات و ڕووخا و کەوتە دەستی فارسەکان، ئیتر لەو ڕۆژەوە خاک و ئاو و کەلتوورمان شارۆدرا و هەریەکێک بۆ خۆی هەتا ئێستاش دیلی ئەو نەتەوە بچووکانەین کە کورد خۆی لەژێر چەپۆکی ئاشوور پانیباڵ ڕزگاری کردن. بەڵێ ئەم نموونانەم هێنایەوە وەکو بەڵگە کە ئەم خاکە؛ خاک و ئاوی کورد و زەردەشتییەکانە، با بێمەوە سەر باسی مەقامەکان و چۆنێتیان. مەقامی ئەڵلاوەیسی سێ پەیژەیە و لە سێ گۆشە مەقام پێکهاتووە، ئەم هونەرمەندانە سەلماندوویانە: م. ئەنوەر قەرەداخی، م. ئامانج غازی هەولێری و ژەنیاری کەمانچە م. چالاک سدیق کەرکووکی، هەرسێکیان ژەنیاری بەتوانان و بەناوبانگن، سوپاسیان دەکەم ئەمەیان بۆ ڕاستکردمەوە، ڕاستە من میوزیکزان نیم، بەڵام شارەزاییم هەیە لە مەقام، بەندە نزیکەی سی بۆ چل ساڵە ناوبەناو کاری مەقام دەکەم، وەکو شاگردێکی خزمەتکاری کەلتووری کوردم.

مەقامی ئەڵلاوەیسی گوتمان سێ پەیژەیە و لە سێ گۆشە مەقام پێکهاتووە، ناتوانین بڵێین سێ مەقامە، چونکە لە کاتی مەقام گوتندا قورگی هونەرمەند لەسەر نۆتەکان، یان وەتەرەکان، یان مەقامەکان سەر و خوار دەکات، یان یاریی دەکات، بە گوتەی ژەنیارانی ئازیز کە لەسەرەوە ناوم هێنان، پەیژە چی دەگەیەنێت، بە واتای تەبەقەی دەنگ گۆڕینی دەنگەکان لە مەقامێکەوە بۆ مەقامێکی تر، ناوی پەیژەکان کێ ناوی ناون؟ لە ساڵی چەند بوو؟ بۆ یەکەمجار میوزیکزانێک بوو بە ناوی (جی دارتزو) لە ساڵی (٩٩٠-١٠٥٠)ز پەیژەی میوزیکی داناوە، واتە نۆتە بەم ناوانەوە یەکەم دۆ ڕێ می (دۆ+ڕێ+می+ فا+سۆڵ+لا+سی)، بەم شێوەیە لەسەر ئەم پەیژانە لە مەقامێکەوە بچیتە سەر مەقامێکی تر، هەموو جیهان لەسەر ئەم حەوت تەبەقەیە دەدوێن و گۆرانی دەڵێن، هەموو مەقامەکان لەسەر ئەم پەیژانە پێکهاتوون، لە کاتی گۆرانی گوتندا دەبێت میوزیکییەکان و گۆرانیبێژ لەسەر یەک پەیژە بن، کاتی وا هەیە گۆرانیبێژ لە کاتی مەقام گوتندا دەڕواتە ناو مەقامێکی ترەوە، بەڵام بەلێهاتوویی خۆی دێتەوە سەر هەمان دەزگا بەبێ نەشاز، بەڵام دەبێت گرووپی میوزیک لێهاتوو بن و نەپەشۆکێن، هەموو هونەرمەندێک ئەو توانایەی نییە، کاتێک دەڵێن حەوت دەزگا سەرەکییەکە (دۆ، ڕێ، می، فا، سۆڵ، لا، سی): ئەمانەن دەزگا سەرەکییەکان، بۆ نموونە تۆ دەنگێک دەربڕیت، هەر ڕاست بڵێ (ئائائا) هیچی تیادا نییە، بەڵام بە زمانت وشەی بۆ دروست دەکەیت، پێچ وپەنای تێدەخەیت، ئاوازی لێ دروست دەکەیت، دەیلەرێنیتەوە، بەرزی دەکەیتەوە، دایدەبەزێنیت وەکو هەر ئامێرێکی میوزیکی میوزیکزان، کە ئامێرەکە دەگرێت بە دەستەوە، لە دەستپێکدا کۆدەکە لێدەدات، لەپاشان پەنجەکانی دەخاتە سەر ژێکانی و پەردەکانی، ئەوکات ئاوازەکەی لێ دروست دەکات، لە هەمان کاتدا قورگی مرۆڤیش وایە بۆ هەردووکیان، هەم گۆرانیبێژ

و هەم میوزیکزان دەبێت بخوێنن و هەوڵبدەن، ئەگینا سەرکەوتوو نابن، لێرەدا پرسیارێک سەرهەڵدەدات، هونەرمەندی گۆرانیبێژ ئەوەی لە قورگیدایە سروشتییە و خودا پێی داوە، تەنها ئەوەی لەسەرە چۆن بەکاری بهێنێت و ئەویندار هونەرەکەی بێت، سەرشێتانە وەکو هونەرمەندی دێوانەی هونەر، مامۆستا حەسەن زیرەکی نەمر، بەڵام دەبێت شەرم نەکات و ڕۆژانە گۆرانی بڵێت، پیاداچوونەوە بکات، لێکۆڵینەوە بکات لەسەر مەقام و چۆنێتییان، هەتاوەکو دەبێتە هونەرمەندێکی دیار، بۆ نموونە وەکو هونەرمەند ناسری ڕەزازی، ئەمجار هەر هونەرمەندێک بە ئارەزووی خۆی لەسەر ئەم مەقامانە گۆرانی دەڵێت و بە شێوازی خۆی دەریدەبڕێت و گونجاندنی بۆ دەکات، بۆیە هەر مقامێک بە ناوی یەکێکەوە ناوی نراوە، یان بە ناوی ناوچەکەیەوە، یان بە ناوی ئاینەکەیەوە، بۆ نموونە وەکو ئەڵڵاوەیسی، لە سەردەمی وەیسییەکاندا خوێندوویانە و لەوانەوە داهاتووە، شاعیرێک گوتوویەتی (با بچینە سەر وەیس بۆ تۆبەکاری، تۆبە لە گشتی، نەک لە دڵداری). وەیسییەکان پیاوی ئاینی سەردەمی ساسانییەکان بوون، ئەڵڵاوەیسی لە سێ گۆشە مەقام پێکهاتووە، ئەمە مەقامی ئەڵڵاوەیسی بوو. لە زۆر شوێندا دووپاتم کردووەتەوە بۆئەوەی جوان ڕوونی بکەمەوە بۆ خوێنەرانی ئازیزی کورد، لەبەرئەوەی من باسەکەم لەسەر مەقامی کوردییە، مەقامی قەتار و خاوکەر، تۆ بڕوانە زۆربەی مەقامەکان ناوەکانیان کوردین و پەیوەندییان بە بۆنە و نەریت و ڕووداو و مێژووی کوردەوارییەوە هەیە، بەداخەوە کەچی زۆر لە هونەرمەندان و ڕۆشنبیران فەزڵی فارس، یان تورک، یان عەرەب دەدەن بەسەر کورد دا، بەنیسبەت فارسەوە هەتا ساڵی(٢٥٠ )ی پ.ز کیان و دەوڵەتیان نەبووە، بە خیانەتی ئارپاک سوپاسالاری لەشکری ماد لە ڕقی ئەستیاک وەکو لەزۆر سەرچاوەدا هاتووە تەخت و تاجەکەی ئیمبراتۆری مادی

ڕادەستی کۆرشی هەخامەنشی کرد، کە کچەزای ئەستیاک بوو، کوڕی کەیخەسرەو شا، کوڕەزای دیاکۆ، ڕووخێنەری ئاشور پانیبالّ، کە پایتەختەکەی لە نەینەوا بوو، یان (نێو ئاوان) موسڵی ئێستا، مەبەستی من تەنها سەلماندنی مەقامەکانە، بۆیە ئەم بەڵگانە دەهێنمەوە، ئەم مەقامەش بە ناوەکەیدا دیارە کوردییە، ئەمەیشیان دوو تەبەقەیە، پێکهاتووە لە بەیات، یان بەیاد و حیجاز یان گاز ئەو هەیگاز کەمەبەستم قەتار و خاوکەرە لە نزمەوە دەست پێ دەکات و بەرز دەبێتەوە، مەقامی ئای ئای باجەلان، ئەمەش ئەمڕۆ پێی دەڵێن بەیات، یەک مەقامە لە نزمەوە بۆ بەرز، ئینجا دەچێتە ناو بەستەکەوە (بەستەی کەمەرە شل)، یان هەر بەستەیەکی بەیاتی تر بێت، مەقامی حیجاز کار خورشیدی یەک مەقامە، لە نزمەوە بۆ بەرز، لە بەرزەوە بۆ نزم، چوارگا، بنەڕەت ئەمەش یەک پەیژەیە پێنج لقە لەسەرەوە باسم کردووە، بەرز و نزم، بە ناوەکەیدا دیارە کوردییە، بڕوانە چوارگا، واتا چوارەم سروودی گاتا لە حەوت سروودەکە بەیات، ئەم بەیاتە لە زمانی عەرەبییەوە هاتووە بە مانای بەیت، یانی بەیتی شیعر، واتا هەڵبەست و بەستە خۆی لە بنەڕەتدا مەقامی بەیادە، یاد و زکری خودایان پێ کردووە، زیکر واتا یاد. دەکرێت بە یادی پێشەواکانیانەوە، یان بە یادی خوداوە گوتوویانە. مەقامی شوشتەر ئەو مەقامەیە کە مامە سێوە دەیچڕێت، مەقامی شوور بنەڕەت یەک مەقامە، ئەسڵی کوردییە و عەرەبەکان گوتوویانە و گۆڕیوییانە، لقێکی لێبووەتەوە پێی دەڵێن شوور، عەرەب نەهاوەند، بنەڕەت یەک مەقامە بەرز و نزم، حیجاز کورد نیوەشەو، یەک مەقامە، بەرز و نزم، ئەم مەقامە مامە سێوە دەیچڕێت. موخالیف یەک مەقامە لە نزمەوە بۆ بەرز، ئەم مەقامانە مامۆستا مەلا بێستون دەیانچڕێت لە لای خۆم هەیە بە دەنگی مامۆستا بێستون، بەڵام کەمێک تێکەڵیان دەکات کەمێکیش بەلای عەرەبیدا ڕایاندەکێشێت، ناوی مەقامەکانیشی

نووسیوە و لەسەر سیدییەک تۆماری کردوون، لەلای خۆم هەڵمگرتووە، من دەستخۆشی لە برای بەڕێزم مامۆستا نەجم کەلاری دەکەم، هەڵبەتە ئەو، سیدییەکەی مامۆستا مەلا بێستونی بۆ ناردم، بەڕاستی سوودم لێوەرگرتووە، هەروەها مامۆستای مەقاماتی عێراقی؛ کاک عەزیز خەیات، خۆم چاوم پێی کەوت لەگەڵ هاوڕێی ئازیزم شاعیر و هونەرمەند مامۆستا ئەحمەد شەوکەت باجەڵان چووینە خزمەتی و لەبارەی مەقاماتەوە وتووێژمان کردووە، ئەویش شارەزاییەکی باشی هەیە لە مەقاماتی ڕەسەنی کوردی، زۆر دەنگیشی خۆشە، لە ماڵی کاک شێرکۆ میروەیس بەرپرسی مەڵبەندی خانەقین و ئەندامی سەرکردایەتیی یەکێتیی نیشتمانی کوردستان یەکترمان ناسی، بانگهێشتی کردبووین بۆ یادی چایچییە کۆنەکانی خانەقین یادیان بەخێر هەتا کاک عومەری خاوەن چایخانەی شەعبیش لەوێ بوو، دەمەوێت ئاماژە بە ناوی ئەو مەقامبێژانە بکەم کە لە مەقامە ڕەسەنەکاندا شارەزان، یان دەیچڕن لە ناوچەی گەرمیان، تەنانەت ئەو کەسانەش کە مەقامبێژ نین و تەنها شارەزان لە شاری خانەقین و ناوچەی بنکوورە و شاری کەرکووک و کفری و خورماتوو، یان وەرماتوو و چەمچەماڵ و شاری دەربەندیخان و دەوروبەریان. بەڵێ بە شانازییەوە دەتوانم بڵێم مامۆستای پایەبەرز مامۆستای مەقاماتی ڕەسەنی کوردی، یەکەم: مامۆستا شەڵتاغە، جێی شانازی گەلەکەمانە، دووەم: مەلا وەلی، هەرچۆنێک ئەمانە لە میدیاکانەوە نەبینراون، بەڵام مێژوو بە شانازییەوە باسیان دەکات، بەندە لە هەشتاکاندا لە تەلەفزیۆنی بەغدادا بەشی عەرەبییەکەی باسی لێهاتوویی مامۆستا شەڵتاغیان دەکرد، ئەوجا من نەمدەزانی شەڵتاغ کێیە. خۆم بینیم چاوپێکەتنیان لەگەڵ مامۆستا عەلی مەرداندا دەکرد لەو دەمەدا تەلەفزیۆنی ڕەنگاو ڕەنگ تازە پەیدا ببوو، هەروەها سێیەم: عەلی مەردان مەقامبێژی گەورەی کورد و کوردستان.

چوارەم: حسێن عەلی حەفت تەغاری. پێنجەم: مامۆستا سەلاح داودە، شوکر خەیات، مام شەوکەت لە کەرکووک، عومەرە درێژ، مسەفا نانەوا، ئەحمەد نانەوا لە کفری، کاک ئیحسان زیرەک وکاک ڕەمەزان چەمچەماڵی لە چەمچەماڵ، کاک ئەحمەد فەرەج دێی قەڵخانلوو، وەستا عەلی و لفتی برای لە دێی لفتی ئاغاوە، حاجی حەمە ڕووتە لە زنانە، کاک حەمەی خواکەرەم لە زنانە، سوپاس بۆ هونەرمەندی خۆشەویست کاک لوقمان نوری ناسراوە بە دووزی ئەم ناوانەی بۆ ناردم، هەروەها مامۆستا خودداد عەلی، کاک حەسەن هەیاس لە خانەقین، کاک عەزیز خەیات ئێستا دەرسی مەقامات دەدات لە خانەقین، سەید فوئاد، مەجید مورادخان، حەسەن فەرەج مەحمویلان، نوری باریکەیی، حەمە نەقارە، مامۆستا ئەحمەد شەوکەت، سەید ئەحمەد بەرزنجی لە دەربەندیخان، خودا لێخۆشبوو خاڵۆ حەمید جومعە لە شێرەوەن، کاک سالح حسێن لە کەلاری کۆن، کاک صالح و هونەرمەند دلشاد یەدولا لەکەلار و فەرەجی حاجی تایەر لە شێرەوەن، مام ئەحمەد سەلمانە لە سەوز بلاخ، خاڵۆ مەجید ڕەسول لە شێرەوەن، سمایلی کوڕی کاک عەلی مەلا لە تۆپ عەسکەر، کاک تایەر عوسمان دزەیی هەر لە تۆپ عەسکەر، محەمەد خاوەرە لە تۆپ عەسکەر، خاڵۆ کەریم شانە لە کەلار (خۆم گوێم لێبووە مەقامی ئای ئای گوتووە)، بەختیار مەجید محەمەد عەلی فەتی، گەنجێکی تازەپێگەیشتووە لە ئاوایی حاجی خەلیل، کاک حەمەعەلی ڕیش قوت، هۆرەچڕێکی باشیشە، جگە لە مەقام، کاک لوقمان دووزی، یانی خورماتوو، ژەنیاریشە، کە زوورنا و باڵەبان و شمشاڵ دەژەنێت بەجوانی بە دەنگ و بە ژەنینیش و بە باڵەبان و بە زوورنایش و جووتزەلە، یان دووزەلە، هەتا کاکە حەمەی کوڕیشی شارەزایە و زۆر بە جوانی باڵەبان و شمشاڵ و زوورنا دەژەنێت و بە دەنگیش دەنگیشی زۆر خۆشە، شوکر بۆ خودا لەم ڕۆژانەدا زانکۆ تەواو

دەکات، پشت بەخودا دەبێتە ئەستێرەیەکی بەناوبانگی کورد، کاک مینەی پۆلیس، ئێستا لە کەلارە، کاک فەریق حەمەعەلی زەڕک لە ئاوایی غەیدان بنکورە و عەدنانی کوڕی ناسراو بوو بە زیرەک، ڕوحی شادبێت. ڕزگار حەمەئەمین کەلاری، مامۆستا توانای مەلا نەقی لە کەلار، ئێستا بێژەرە لە کەنالی ئێن ئارتی، کاک فەریق ئەوڕەحمان ناسراوە بە نەوتە، لە هۆزی لەکن لە کەلار، کاک سەڵاح باوەنووری، کاک جەمال ڕەشید و کاک فەریق، کاک حەیدەر سەید فواد لە دێی غەیدان، کاک مەجید زیرەک ئێستا لە کەلارە، کاک مەلا سمایل شاتری، کاک مەلا ئازاد و کاک مەلا عەباسی برای، کاک مەلا ئەمین، کاک مەهدی کەڵوڕ، کاک مەلا سەڵاح جەلەولا، کاک مەلا ستار، مامۆستا مەلا ساڵحی مەیدان، مەلا ڕەشید داوێ، کاک خەلیل وەندی، گۆرانی بێژی دێرین بەڕێز عەدنان حەمەساڵح گوڵ، مامەی کۆچ کردوو لە شێرەوەن، مامۆستا عەباس گەرمکی کەمانچەژەن، مامۆستای خۆشەویست، ژەنیاری ئۆرکۆردیۆن دانەر و بەڕێوەبەری تیپی مۆسیقای کەلار مستەفا سەعید ئێستا سەرقاڵە بە نووسین و وەرگێڕانەوە، بەڕێوەبەری یەکێک لە قوتابخانەکانی کەلاری ئازیزە، ناوبراو لە هۆزی هۆرمزیارە، مەقامبێژی دەنگخۆش کاک سمایل خەمە لە گردەگۆزینە و کاک فواد غەریب وبەڕێز کاک کاروخ شەماڵ مەجید باوکی ناوبراو پیاوێکی هونەردۆست و ڕۆشنبیرەو زۆر قسەخۆشە، لە سلێمانی کۆمەڵێک مقامبێژ و گۆرانیبێژی چاک هەیە، ئەگەر شارەزای تەواوی مەقامەکان نەبن، هەریەکە و شارەزایی لە بواری بەستەشدا هەیە و بەتوانایە لەگەڵ میوزیکدا ژیاوە، وەکو ئەم بەڕێزانە: کاک ڕێبواری مەلازادە، کاک ڕەزا جولەکانی، کاک مەحمود محەمەد، کاک ئەحمەد دەروێشی برای، کاک ئازادی مەحمود تۆفیق شلک، کاک کامەران عوسمانی خولە سنەیی، بەڕێز جاسمی ساز ژەنیارە، مامۆستای بەتوانا کاک حامیدی ژەنیاری شەقام بەڕێز

کاک ئەحمەد بێکەس وەکاک بورهان محمدناسراوە بە بورهانی ماملێ و کاک موحەمەد جەزاو کاک بەرهەم حسن لەخانقینش ستاردەشتی وکاک محەمەد ناسراوە بەئەمگە، بێگومان مەقامبێژی تریش هەن من نایانناسم. دەمەوێت ڕوونکردنەوەیەک بدەم، بەندە کە باسی مەقام دەکەم، من وەکو سەماعی، واتا گوێگرتن، فێربووم، نەک ئەکادیمی، ئەمانەشی فێریان بووم لە ڕێی خولیایی خۆمەوە بووە، لە خۆشەویستیم بووە بۆ گۆرانی و میوزیکی کوردی، هەڵسوکەوتم لەگەڵ هونەرمەنداندا و خوێندنەوە و گوێگرتن لە ڕادیۆکان و گۆرانی و مەقام، هەوڵدان بووە بۆ تێگەیشتن لە هونەر و کەلتووری میللەتەکەم، ئەگینا من لە ڕووی نۆتە و ئەکادیمییەوە شارەزا نیم وەکو کردار شارەزام، یان بە گوتن و لە ڕووی مێژووییەوە دەربارەی مقام و کولتوور دەخوێنمەوە، بەڵام هونەرمەندە گەورە و میوزیکزانەکانی کورد، وەکو ئەم مامۆستایانە دەتوانن ڕوونکردنەوە لەسەری بدەن: مامۆستا وریا ئەحمەد مامۆستای هونەرمەند فەیزی نەژادی، مامۆستا ئەنوەر قەرەداخی، سەید ئەحمەد، کاک چالاک سدیق، مامۆستا ئامانج، مامۆستا حامید و زۆری ترمان هەیە، وەنەبێت مامۆستا و میوزیکزانی ترمان نەبێت، بە شانازیشەوە زۆر زۆرمان هەیە، بەڵام بەندە ناویان نازانم و ئاشنایەتیم لەگەڵ ئەم بەڕێزانەدا هەیە. بابێمەوە سەر ئەوکەسانەی شارەزان لە بواری مەقامدا، بەڵام مەقامبێژ نین وەکو کاک نەجم باجەلان، ئەوەتا دەڵێت موجێبێ هەبووە مەقامبێژێکی چاک بووە، مەقامێکی تایبەت بە خۆی بووە، بە ناوی (موجیلا) لە پاشان بەغدایییەکان کردوویانە بە مەدمی هونەرمەند موجیب لەسەرەوە ئاماژەمان پێ کردووە زۆر بەجوانی، بۆ زانیاریتان هەموو مەقامەکانی بەجوانی گوتووە، بەتایبەت مەقامی باجەلان، کە ئێستا پێی دەڵێن بەیات، هەروەها ناوبراو هونەرمەندی کۆچکردوو موجیب لەساڵی (١٨٠٢)ز لە شاری کفری لەدایک بووە و

له ساڵی (١٨٨١)ز کۆچی دوایی کردووه، بەڵێ دەتوانم بڵێم هەزارەها مەقامبێژمان هەبووە ناویان تۆمار نەکراوە، یان ئێستا من نایانناسم، یان نایەنە بیرم، بەڵام بێگومان دەماودەم لێرەو لەوێ ناویان بەر گوێ دەکەون، جاربەجار بەڵێ، بێگومان ئەمڕۆ هەموو ڕۆشنبیرێک دەزانێت زلهێزەکانی جیهان چ ڕۆڵێکیان هەبووە لە کاولکاریی وڵاتاندا، هەر دەسەڵاتدارێک دەستی ڕۆیشتووە، مێژوو و کەلتووری ئەوی تری لەناو بردووە، یەکەم کەس کە مێژووی ئێمەی لەناوبرد بێت، ئاشوورییەکان بوون. دووەم: ئەسکەندەری مەکدۆنی بووە. سێیەم: فارس. چوارەم: عەرەب. پێنجەم: تورک، لە کاتی ئیمپراتۆری عوسمانیدا کە (٥٠٠) ساڵ فەرمانڕەوایی ئاسیا و بەشێک لە ئەفەریقا و ئەوروپاشی کردووە، بۆ نموونە دوژمنی خوێنەخۆری کورد بووە، لە هەموویان زیاتر ڕقی لە کورد بووە، ئەمە هاندان نییە بۆ نەژادپەرستی، بەڵکو گەواهییەکی ڕەوایە و هەموو ڕۆشنبیران دەیزانن، وەنەبێت هەر خەتای ئەوان بێت، دەستپێشخەریی هەموو ئەو جاش و خۆفرۆشانەی کورد خۆیان بوون، ئەوەش ڕاستییەکی حاشاهەڵنەگرە، ئەگینا هیچ دوژمنێک بە تەنها هیچی پێ ناکرێت، بڕوانە هەموو ناوی دێهات و شارۆچکەکانی گۆڕیوە، ئەوەتا هەر هەمووی قەرەیەکی پێوەیە، نموونەی ئەوانە: قەرەداخ، زەردی ئاوا بووە. قەرەخان، گولاڵە بووە لە پاشان عەرەب کردوویەتی بە جەلەولا. گوندی قەرەبلاخ، سەوزبلاخ سو. واتا ئاو ، واتا کانی ڕەش. قەرەتەپە تەپە ڕەش، تاوغ یانی مریشک، یان وەکو قەرەخان واتا خانەڕەش. تورک لە دەوروبەری وڵاتی چینەوە هاتوون بۆ ئەم شوێنەی ئێستا، ئەوەش کورد خۆی هێناونی، ئەمانە هەر خەریکی کوشتن و بڕین و ڕاوڕووت بوون، چین ڕاوینان، کوردیش بۆ دژایەتی یەکتر هێنانی بۆ ئەم وڵاتە، بۆیەکەم جاریش هاتوونەتە ئاترۆپاتیان، کەچی بوون بە خاوەنی جوگرافیایەکی گەورە و فراوان

له ڕێی بەرنامەی ئیسلامەوە، چونکە ئیسلامی بۆ خۆی بەکارهێنا، نەوەک بۆ خودا و ئیسلام، ئەوەتا ئێستا دەبینیت بە چاوی خۆت لەبەر چی، چونکە تێگەیشتوون دەزانن دونیا چییە، خۆی و میللەتەکەی ناکاتە قوربانی تاکە شەخسێک، یان مەرامی خەڵکی قۆڵبڕو تەڵەکەباز، نەک وەکو سەلاحەدینی ئەیوبی، خۆ فارسیش هەروەکو تورکی کرد، ئەوەتا ئەویش دەبینیت، خۆ کوردیش ئەو هەلەی دەستکەوت، لەباتی جارێ دەیەها جار بۆ ئێمە بە کورتییەکەی بە قسەی دوژمن زوو دەخەڵەتێین زۆریش حەزمان لە جاشایەتییە، بەرامبەر بە یەکتر ناپاکین، بێگانەپەرستین، بەڵگەی هەموو ئەمانە میللەتێک لەم جۆرە لەسەر زەویدا ماوە دەوڵەتی نەبێت؟ هیچ شتێکی خۆمان بەلای خۆمانەوە ڕێزی نییە، هەر ئەمەشە ئێمەی گەیاندووەتە ئەم دۆخە، بڕوانە ئێمە خاوەنی هەموو پێویستییەکانی ژیان بووین، هەمووومان لەدەست داو ئاقڵیش نابین، ئەوەندە ڕقمان لە خۆمانە نیو ئەوەندە ڕقمان لە دووژمنەکەمان نییە، من مەبەستم ئەوە نییە ڕقمان لە خەڵک بێت، ئەی خۆ فەرزە بەرگریی لە خۆمان بکەین، ئەوەندە شتی بێگانەمان بەلاوە بەنرخە، نیو ئەوەندە شتی خۆمان نرخی نییە بەلامانەوە زێڕ لەلای ئێمە نرخی نیە ئەگەر هی خۆمانبێت بەڵام کەچوە لای بێگانە و گەڕایەوە مرۆڤ دەکوژین لەسەری ،میللەتێک وا بێ چۆن لەزیللەت ڕزگاردەبێت ئیتر چۆن سەردەکەوین، بۆ نموونە شارستانیەت و پیشەسازی ویاسای مرۆڤایەتی لەلای ئێمەوە گەیشتە وڵاتان، بۆنموونە حەزرەتی ئیبراهیم بناغەی حەجەرول ئەسوەدی داناوە واتابەردە ڕەشەکە کە بنەڕەتی شاری مەککەیە دیارە ئەوگەلانەی ئەوێ لەم پیاوەوە فێری ڕەوشت و دین و دیانەت بونە ئەم پیاوەش عالەم دەزانێ لەکوێوە گەیشتۆتە ئەوێ ونەوەکانی کێن چ نەتەوەیەکەو زمانەکەی چ بووە کەچی ئێمە دوای ئەوان کەوتووین، خوێنەری ئازیز تێدەگەیت مەبەستم کێیە ئایا حەزرەتی

ابـــراهیم عەرەبە؟ لە کوێـــوە چـــووە بـــۆ مەکـــکە؟ ئەوە هەمـــوو ڕۆشنبیـریێک دەیزانێت بێگومان؟ ئەی کشتوکاڵ بۆ یەکەمجار لە دێـــی چەرمـــوو بەر لە (٥٠٠٠) ســـاڵ پ.ز بەکارهێـــنراوە، ئەی پیشەسازیی، ئەوە بۆ هەموو جیهان سەلمێنراوە پێویست ناکات باسی لێوە بکەم، چونکە لە پێشتردا ئاماژەم پێکردووە، یان مەقام و میوزیک و ئاوازەکان، بەداخەوە هەموومان لەدەست دا لە ئاکامی ناتەبایی خۆمان، ئەوەتا بەدرێژایی هەزار و پێنج سەد ساڵ و ئێستاشی لەگەڵدا بێت هەموو ڕۆژێک باسی نەوە لەدوای نەوەی دوژمنەکانی خۆمان دەکەین، تێریش نابین، ئەی خۆ خۆمان لەپاڵ بنجک نەهاتووین، بەڕاستی هەر ئێمەین ئەمەشمان ماوە بەداخەوە، بۆ کورد هەرگیز تێر ناخوات لە وەسفی دوژمنەکانی، خۆی سەفەوی ڕۆڵێکی باڵایان هەبوو لە گۆڕینی دیمۆگرافیای کوردستاندا، لەپاشان بیابانیەکان هاتن بە ناوی ڕەوا و ناڕەواوە زۆر شوێنەواری کورد و مێژووەکەیان لەناوبرد، بۆ نموونە بە دەستی خۆمان گۆڕی باووباپیری خۆمان هەڵدەتەکێنین، دەڵێین ئەمە گۆڕی گاورەکانە، هیچ دڵمان بۆی نائێشێت، لە دوولاوە وامان لێ دەکات ڕەحم بە مێژووی خۆمان نەکەین، یەک: ڕووخانی ئابووری. دوو: شۆردنەوەی مێشکمان بە بیدعە و حەرام و حەڵاڵ، کەچی هەموو شتێک بۆ ئەو حەڵاڵە و بۆ من حەرامە کەماڵی خۆمە، وەرە نەگبەتی لەوەدایە وەکو نەخوێنەوارەکـــانمان شارەزانـــین و نەخوێـــنەوارن ئەی تۆبـــۆ مامۆســـتای زانکـــۆ چـــاوەڕوانی گەمژەیەکـــی کۆیـــلەو خەڵـــەفاوی بەکرێگیـــراوی قومقـــومەک خۆرەکـــانی بیابانیـــت هەر ئەم کـــۆیلەو بەکرێگیراوانە کەلتوری ئێمەیان سڕیەوە لەهەمووڕوویەکەو هەروەها ناوی مەقامەکانیشیان گۆڕیوە و کردوویانە بە قۆریات، یان حیجاز و بەیات و دەیەها ناوی تر، بۆ ئاگاداری سروودی مارشی نەتەوەیی تورکیا سروودێکی مامۆستا حەسەن زیرەکە، ئەی کوردینە، ئەی

لاوەکـان ڕاپەڕن شـێرەکان، بەبـێ میوزیـک گوتـوویەتی لە ترسـی
خوێنـمژەکانی کـورد، خـۆ هەمووڵاتـان داگیرکـراون و ئازادیـیان لـێ
زەوتکـراوە بەڵام چونکـە وشـیاربون هەمویـان خۆیـان ڕزگـارکردو
ئەوەتا هەمودەوڵەتن وخاوەنی کەلتورو کیانی خۆیانن و ماونەتەوەوە
و مێـژوو و خـاک و ئـاو و کەلـتووری خۆیـان پاراسـت و هەڵسـانە
سەر پێی خۆیان، بەڵام ئێمەی کورد هەتا ئێستاش وپاکتاوی ڕەگەزی
دەکرێـین، لە سـاڵی (٢٥٠) پ.ز تـاوەکو ئەمڕۆ ئێـمە ژێـردەستەی ئەم
وڵاتانەی دەوروبەرین ، ئەوا خۆی دەدا لە سێ هەزار سـاڵ هەتـاوەکو
ئەمڕۆ موڵـک و مـاڵ و کەلـتوور و هەمـوو نەریتە پـیرۆزەکانی ئێمە
دەکەنە هـی خۆیـان و زۆر بـێ شـەرمانە شـانازیی پـێوە دەکەن و
خـۆیان پـێوە هەڵدەکێشـن، کـوردیش تـازە بەتـازە دەکەونە گیـانی
یەکتری، ئەوەتا ئەمە ماوەیەکە نیمچە ئازادییەک گەڕاوەتەوە بۆ کورد
لە باشـووری کوردسـتان، واتـا بەشـی عێـراق، زۆرشـت گەڕاوەتەوە
جێگای خۆی، من هیوادارم کە گەلی کورد یەکگرتووبن هەمـوو شتێک
بـاش دەبێـت و دەگەڕێتەوە سـەر بنچینەی خـۆی بە هەمـوو چـین و
توێـژەکانییەوە، مـن وای بـۆ دەچـم کـورد وەک خـانەوادەیەک وایە
گەورەکـان لەنـاو دەچـن، نەوەکـان زیـاد دەکەن، هەژار دەکەوێـت و
دەوڵەمەنـدیش دەبێـتەوە، بەبـێ یەکگـرتن پەرشـوبڵاو دەبێـت و هەر
ژێـردەستە دەبێـت ئەوجـا مردن زۆرخۆشـترە وەک لە ژێـردەستەیی
ژێـردەستە، هەرچیشـت هەبێت لە دەسـتی دەدەیت، وەکـو ئێسـتا ئەم
وڵاتـانەی دەوروبەرمـان بەسـەر خـاک و ئـاو و کـەلتووری ئـێمەوە
دەژین و لەناویشمان دەبەن، لە ڕێگای جیاجیاوە ئێمەیان کردووەتە
کۆیلەی خۆیان و ئێمەش هەر خەریکی خزمەتکاریین و هەموو شتێک
بـۆ ئەوان حەڵاڵە و بـۆ ئـێمە حەرامە، مـن هیـوادارم نەوەی نـوێ
بخوێنـنەوە و بنووسـن، ئەوەتـا مـن ئەم زانیـارانە لەسـەر کـاغەز
دەنووسم ، ئەگەر تۆ نەخوێنیتەوە، چۆن تێدەگەیت لە ڕابردوو و لە

داهاتوو؟ چۆن دەزانیت ئەم ئاو و خاکە و ئەم کەلتوورە هی تۆن، چۆن دەزانیت گەلانی تر دزی لە تۆ دەکەن؟ بۆ نموونە مەقامی ڕاست و ئەڵڵاوەیسی لەلای کورد هەیە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ پێش هەزارەها ساڵ، لەو کاتەوە ناوی وا هاتووە، ئایا ئەمڕۆ کردوویانە بە ناوێکی بێگانە، ئەمە غەدرو خیانەت نییە؟ مەقامی قەتار و مەقامی خاوکەر ئەمڕۆ پێیان دەڵێن حیجاز و بەیات، ئەم دوو مەقامە دیارە کوردین، مەقامی قەتار بە واتای گازە، لە کۆندا بەو سروودەی خوێندوویانە گوتوویانە گاز، واتا بانگەواز، بەئاشکرا ناوی گاتا هاتووە، ئەمڕۆش هەر پێی دەڵێن گاتار، یان قەتار. پیرۆزیی میوزیک بەلای مەزهەبەکانی دینی (زەردەشتییەوە)، یان دینی ئالحەقەوە: دەگێڕنەوە لەکاتی دروستکردنی حەزرەتی ئادەمدا، کە خوای گەورە لە قوڕ دروستی کرد، فریشتەکان داوایان لە خودای گەورە کرد گیان بخاتە بەری، خودا داواکەیانی وەرگرت و ئەمری کردە گیان بڕواتە بەدەنی حەزرەتی ئادەمەوە، گیان نەڕۆیشت، فریشتەکان گەڕانەوە بۆ لای خودای گەورە گوتیان: پەروەردگارمان، گیان ناڕواتە بەدەنی حەزرەتی ئادەمەوە، خودای گەورە فەرمووی بڕۆن میوزیکی بۆ بژەنن، فریشتەکانیش بە ئاوازەوە میوزیکیان بۆ لێدا و ئەوجا چووە بەدەنی باوە ئادەمەوە، ئەو میوزیکەش سێتار بووە، بۆیە میوزیکیش لەلای تەواوی دنیا و ئاینی زەردەشتییەکان پیرۆزە و ڕێزی لێدەگرن، جگە لە دینی ئیسلام، هەر لەبەر ئەوەشە میوزیک و ئاواز و هونەر لەم وڵاتەدا پەرەی سەندووە، بەڵێ وڵاتی ئێمە لە هەموو ڕوویەکەوە دەوڵەمەند بووە، بۆیە هەموو وڵاتان چاویان تێبڕیوە، هەرکاتێک هێزیان پەیدا کردووە، هێرشیان هێناوە و داگیریان کردووە و هەموو خێراتەکەیان بردووە و گەلی عەرەب لەکاتی فتوحاتە هێندە کێبڕکێیان بووە بۆ تالانی و دەستکەوت و غەنیمە، هێندە پەرۆشی دینەکە نەبوون، چونکە ئیمامی عومەر بڕیاری دابوو ئەوەی

بەشدارییی لە شەڕی کافراندا (کە ناویان نابوو غەزا)یان فتوحات نەکات، هیچی بەرناکەوێت، بۆیە جا بە لێشاو عەرەب بۆ زێڕوزیوو ژنی جوان وئەسپ وغولام سەروەت وسامان و کۆشک و تەلاری جوان و تالانی و هەموشتێکی جوانی کورد و ڕۆژهەلاتی و ئەورووپی بە گەرمی هێرشیان دەهێنا بۆ ولاتی ساسانی و ڕۆژهەلات و هەموویان تالانکرد و داگیریان کرد و فەرهودیان کرد، ئەم هەموو عەرەبەی کە ئێستا لێرەن، لەو کاتەوە هاتن و لێرەدا نیشتەجێ بوون و بوونە خاوەنی هەموو شتێکی ئەم ولاتانە و کەلتوورە بۆگەنەکەی خۆیان سەپاند بەسەر ئێمەدا، ئەو دەستوورەی کە خزمەتی کوردەوارییان دەکرد؛ هەموویان بە ناوی بیدعە و کوفرەوە حەرامکرد و هەتا ئەمڕۆش کورد پەیڕەوی دەکەن وەک ئەوە وایە ئێستاش ئیمامی عومەر حوکوممان بکات و فەرمانڕەوامان بێت، ناوێریت باسی هیچ زەرەر و زیانێکی ئەم دەستوورە بکەیت کە لە سودی عەرەبدا دانراوە، یەکسەر کافرت دەکەن، ئەی خۆ باشە تورک و فارس و زۆر لە ولاتانی تر وەکو ئێمە موسڵمان بوون، بۆ وەکو ئێمە نەبوونە کۆیلە، بەڵکو خەڵکی کۆیلە دەکەن لە بەرژەوەندیی خاک و گەلەکەیان، دەیانەوێت هەر ئێمە ساویلکە و گەمژەبین باوەڕ بە هەموو شتێک بکەین لەپێناو بەرژەوەندیی تایبەتی و شەخسی خۆمان، ئایە کەسێک هەیە نەزانێت مەرامی دوژمن چییە و دوژمنی خۆشی نەناسێت، بەداخەوە گەلەکەمان بە سیاسی و ئاینییەوە هەمووی کۆیلە کراون بە پارەی زۆرو زەبەندی تالانکەرەکان و دوژمنی مرۆڤایەتی و ولاتە دەوڵەمەندەکانی کەنداوی نۆکەری ئەمەریکاو دۆستەکانی وئێمەشیان فریوداوە و دەستمان ناوەتە بینەقاقای یەک وخوێنی یەکتری دەمژین لەژێر بیرو باوەڕو ناوی جیاجیادا، هەروەها ئێران و تورک و دۆستەکانیشیان هەموو شتێکی ئێمەشیان کردووەتە موڵکی خۆیان بە کەلتوورەکەشمانەوە، کەلتوورەکەشیان بردووین، هەرچیشمان

هەبووە سرپیویانەتەوە، بەتایبەتی ئەم وڵاتانەی چواردەورمان ، هاتون بە ناوی گاورەوە هەموو شتێکی ئێمەیان لەناوبردووە و هەرچیش ماوە حەرامی کردووە گەنجەکانمانیان کوشتووە و کچە جوانەکانیشیان بردووین، ئەوەشی ماوەتەوە کردوویانە بە کۆیلەی خۆیان لەناو زەوی و ئاوەکەی خۆیاندا، بەتایبەتی لە سەردەمی خەلیفەکاندا هەروەها لەلایەن هەموزلهێزەکانی جیهانەوە ، (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی: فیتنە مشتومڕی ئاین و سیاسەت، نووسینی: هاشم جعێت، وەرگێرانی لە عەرەبییەوە: مامۆستا سابیر عەبدوڵلا کەریم)، زۆر جار لە پیاوەئایینیەکانی کوردستانەوە بیستومە دەڵێن کاتێ لەشکری موسوڵمانان هاتوون و هێرشیان هێناوە بۆ سەرکوردستان منداڵێک خوێن لەپەنجەی نەهاتووە جا ئەوەم هاتەوە یاد خەلیفەی ( ع )ی موسڵمانان نامەیەکی ناردبوو بۆ والی بەسرە، بەنێکی تیادا بووە نزیکەی مەتر و بیست سانتیم بووە، ئەمری کردە هەر ئێرانییەک، یان زەردەشتێک باڵای گەیشتە ئەم بەنە، یەکسەر بیکوژە، واتا ئیبادەیان بکەن، بەڵام کوڕی ئەبو سوفیان لەوێ کاربەدەست دەبێت، ڕجا و تکای لێدەکات کارەکە ئەنجام نەدرێت، چونکە میللەت لێیان هەڵدەگەڕێنەوە، لەپاشان خەلیفە پاشگەز دەبێتەوە، بەڵام کاتێک کوڕی ئەبو سوفیان دەبێتە والی بەسرا، ئەبو سوفیان هەمان بڕیار دەردەکاتەوە و هەمان نامەی بۆ دەنێرێت و دەڵێت تۆ کاتی خۆی زۆر سەهوو بوویت کە نەتهێشت ئەو بڕیارە جێبەجێ بکرێت، فەرمان دەکات بەسەر کوڕەکەیدا و دەڵێت دەبێت هەر ئێستا ئەو بڕیارە جێبەجێ بکەیت، بۆ پشتڕاسکردنەوەی ئەم گوتانەم، (بڕوانە: ئاڤێستا یەسنا، بەشی دوو. بڕوانە: مەریوان وریا قانیعی شاعیر) زۆر جوانتر بۆت ڕوون دەبێتەوە لە سەردەمانێکدا کورد خۆی ئەم دەوڵەتانەی ڕزگار کرد لەژێر چەپۆکی ئاشوور پانیباڵ، دەسەڵاتی بەسەر بەشی زۆری کیشوەری ئاسیادا ڕۆیشتووە،

خــاوەنی یاســای مرۆڤــایەتی بــووە و لە هیچــی کەم نەبــووە، لە ســەردەمی دەســەڵاتی کــورد دا هەمــوو گەلان بە ئاشــتی و ئــارامی ژیاون هەر لەبەر ئاشتیخوازیی و هۆشیارییەکەیەوە بوو گەیشتە ئەم ڕۆژە، چــونکە گەلــی کــورد وەکــو گەلانــی تــر وەکــو ڕانەمەڕ دوای شــوانەکەیان نەکەوتــوون و چاویــان نەبڕیــوەتە مــاڵی هــیچ کەســێک هەتــاوەکو مــاڵ وەدەســت بهێنن، کــورد لەپــێش هەمــوو نەتەوەیەکــدا خۆشگوزەران بووە و وڵاتــی ســەربەخۆی هەبــووە لەوپەڕی خۆشــیدا بــوون، بــۆیە حەزیــان لە شــەڕ و شــۆڕ نەبــووە، ئەوە بــێ مــاڵ و بــێ حاڵەکــانن نرخــی ژیــان نــازانن، بــۆیە بەزەییــان بە گیــانی خۆیانیشــدا نەدەهاتەوە، کوردیش زۆر هەوڵی دا تا گەیشتە خۆشگوزەرانی و چــی لە ئاســتی تــاک، یــان لە ئاســتی دەوڵەتــدا، بێگومــان دەوڵەمەنــد چــاوی لەســەرە و دوژمنــی زۆرە، بە کــورتییەکەی کــورد میللەتێکــی خۆڕســک بــووە، وردە وردە زیــادی کــردووە و بەپێــی مێــژوو و شــوێنەوارەکان بێــت، گەلــی کــورد تەنهــا گەل بــوون لەم نــاوچەیەدا. (بــڕوانە: قورئــانی پیرۆز، تەورات و ئنجیلیش) ڕاستی ئەم گوتەیەمت بۆ دەردەکەوێت کە کورد بۆ پێویستییەکانی ژیــان هەوڵیداوە و داهێنــانی کــردووە، وەکــو گەلانی تر بە شەڕ و تاڵانکاریی پێــنەگەیشتووە، هەر بــۆیە بەدرێژایــی مێــژوو هێرشــمان کــراوەتە ســەر و ئەمە حاڵمــانە، هیــوادارم هەمــوو گەلانی دونیا مافی یەکتر بدەن و هیچ کەسێک مافی ئەوی تر پێشــێل نەکات، چونکە ئەمڕۆ ئەستێرەکەمان بووەتە یەک ماڵ، بۆیە دەبێت بە هەمووومان بیپارێزین، تاوەکو هەموو چین و توێژەکــان لەم مــاڵەدا بە ئاسوودەیی بژین، با هەمووومان گوێ لە گۆرانی و میوزیک بگرین و وەکو میوزیک بین، چــونکە میوزیــک زمــانی هەمــوو مــرۆڤێکە، هەمــوو مرۆڤێــک وەکــو یەک چێــژی لــێ دەبیــنن بــەبێ جیــاوازی، مێــژوو ســەلماندوویەتی کــورد چەنــدە ئاشــتیخوازە، ئەوەتــا لە ســەردەمی دەسەڵاتدارێتــیدا پەنــای نەبــردووە بــۆ چەک و کۆمەڵکــوژیی، بەڵکــو

پەنای بردووە بۆ ئەو شتانەی کە مرۆڤی دڵخۆش کردووە، وەکو ئەم ئامێرە میوزیکییانە: (سێتار، عود، باڵەبان، زوڕنا، دووزەلە، چەقەوانە، دەف، تەپڵ، کەڕەنا، چەنگ، تەموورە، ڕووباب، بلوێر و زۆری تر)، بێگومان ئەمانە زۆربەیان پەیوەندییان بە سروودەکانی گاتاوە هەیە، لە سەردەمی خۆیدا قیسارەیان دۆزیوەتەوە، لە لای موسڵ قیسارەش هەر پەیوەندی بە دینەکانی زەردەشت و پێش زەردەشتەوە هەیە، بڕوانە قیسارە سەری گایەکی پێوەیە، سەردەمانێک گا پیرۆز بووە، گەیشتووەتە ڕادەی پەرستن، ئێستاش لە هیندستاندا گاپەرست هەیە، ئەو دینانەش هەر لێرەوە چوون، لەپێشدا هیند و کورد زۆر تێکەڵ بوون، بڕوانە جلوبەرگیان و تەنانەت زمانەکەشیان زۆر لە کوردەوە نزیکە، (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە کتێبی: مێژووی مرۆڤ و ئاینەکان، میشیل مالرب)، زۆر بە جوانی لێیان دەدوێت و ڕوونیان دەکاتەوە، دیارە ئامێری میوزیکی گیتار لەو سەردەمەدا هەبووە و هەتا ئێستاش هەیە، ناوەکەی بە خۆوەیە، گیتار واتا گاتار، یان گاز، بانگەوازیان پێکردووە، واتا زیکر و گاتایان پێ خوێندووە، (لە پێشتریشدا باسم کردووە)، لە گاتاکانەوە هاتووە و ئامێری قیسارە لە کوردستاندا دۆزرایەوە، بەبۆچوونی من قیسارەش هەر پەیوەندیی بە گاتاکانەوە هەیە، چونکە زۆربەی میوزیکەکانی کوردی (گا و تا)یان پێوەیە، قیسارە، گاتارە، گیتار، قیتار، ئەو قەتار، وەکو بانی موغان، یان مۆگاکان، دیارە مەقام لە مۆغامەوە هاتووە، لە پاشان لەلای عەرب بووە بە مەقام، لەلای فارسەکان و گەلانی تر بە مۆغ، چونکە عەرەب پیتی (غ) گۆ ناکات، تۆ بڕوانە گۆکانی سەردەمی مۆغەکان و ناوەکانیان بۆ نموومە: (مۆ+ ز+ی+ ک) دوور نییە مۆغیک بووبێت، یان بڕوانە مۆغەکان، واتا مەلای زەردەشتییەکان. تەنها پیتی (غ) یان گۆڕیوە، پیتی (ق)یان بۆ داناوە. دیارە مەقام هەر موغامە، یان مۆگاکانە، لە سەردەمی مادەکاندا بە مەلاکانیان و گوتووە مۆگاکان،

یان مۆغەکان، ئێستاش دێیەک هەیە لە ناوچەی پیرەمەگروون بە ناوی کەلاوەی، یان کەیلی مەرزنگان، واتا جێگای کەسایەتییە مەزنەکانی دینی زەردەشتی بووە، هەروەها ناوی خودی پیرەمەگروون ناوێکی ئاینی زەردەشتییە، لە سەردەمی زەردەشتیدا بە پیاوی ئاینییان گوتووە پیر، بۆ نموونە وەکو پیر شالیار، پیر قەرە، چێوار پیر خدر، ئێستاش هۆزێک هەیە بە ناوی پیر خدرییەوە، لەکاتێکدا دوژمن هێرشی هێناوەتە سەریان، پیری گەورە هەڵاتووە و خۆی گەیاندووەتە شاخی پیرەمەگروونی ئێستا، کە هەمیشە پشت و پەنای گەلەکەی بووە، واتا پیرەکەمان دەگرن، ئەم وشەیە ئاڤێستاییە، واتا ماچۆ زوانییە، پیرە مەورن، ئیتر نازانم گیراوە، یان نا، بۆیە شاخەکەش بەو ناوەوە ناوزەند کراوە، زۆر زۆر کۆنە، بە گوتەی شاعیری بەڕێز کاک خالید (ناسراو بە مامە خەمە)، هەتا بڵێی پیاوێکی خۆشمەشرەب و ئەدیب و ڕۆشنبیر و هونەردۆست و میوان پەروەرە، کوردێکی دڵسۆز، خۆی دانشتووی پیرەمەگروونە، تەمەنیشی خۆی دەدات لە (٧٠) ساڵ خودا تەمەندرێژی بکات، کە لە دایک بووی (١٩٥٢)ی ز، دەڵێت: ئەم دێیە، لەپێشتر ناوم هێناوە، لە بناری شاخی پیرەمەگروونە، هەروەها دێیەکی تریش هەیە بە ناوی موغاغەوە لە نزیکی جادەکەی ئێستای پیرەمەگروونە، هەروەها بانی مەقان، واتا شوێنی مۆغەکان، یان مۆگاکان و واتا بانگخوێنەکان وەکو قورئانخوێنەکان، بە عەرەبی پێیان دەڵێن (القارىء القرآن)، ئەمە گەواهیدەرێکی حاشاهەڵنەگرە کە مەقام مولکی کوردە و لە هەموو سەردەمەکاندا گوتراوە و هەموو ئاینەکان سودیان لێ بینیوە، دەتوانم بڵێم ئاواز و گۆرانی و میوزیک ڕۆڵێکی باڵایان هەبووە لە بەرەوپێشەوەچوونی هەموو بوارەکانی ژیاندا، بەتایبەت دین، بە ئاوازی پڕجۆش و خرۆش مەتحی خوداکان و پێشەواکانی دین و کۆمەڵیان کردووە، هەتا گەیشتووەتە یەزدانی یەک دانە، خۆی بۆخۆی

ئێزدییەکـان بەڵگەیەکـی بێگومـانە لە ئێزدییەکـانەوە هـاتووە، وشـەی ئێزدیان، واتا یەزدانییەکان، یان یەزدان پەرستەکان، لە سـەدەها ئاواز و گۆرانیـدا ڕەنگیـداوەتەوە، دیـارە وشـەی یەزدان هەمـان وشـەی ئـاهورامەزدایە، پێموابێـت عەرەب وشـەی شـەیتانی لەم وشـەیەوە داهێناوە، لە زۆر سەرچاوەشدا هاتووە، بۆیە ئێزدییەکـان بە شـەیتان پەرسـت تۆمەتبـار دەکەن، لەپێشـدا وا نەبـووە، زۆر هەوڵیانـداوە بـۆ شـێواندنیان و تێکـدانی کـەلتوور و ئاینەکەیـان، هەتـاڵە بەر ئەوەی ناشرینیان بکەن، ئەگەر بڕوانیتە تەورات؛ ئیبراهیم پێغەمبەر هەر دینی ئێزدییە بردوویەتـی بەرەو خـوار، چونکە ئیبراهیم پێغەمـبەر خەڵکـی ڕوهـایە، کـاتێ هەڵ هـات لە دەسـتی نەمـروود، پەنـای بـردە بەر ئەو خەڵکـانەی لە پـێش ئەودا هەڵ هـاتبون بـۆ شـاخە سـەختەکانی کوردسـتان، ئەوانـیش هەمـان دیـن و بیروباوەڕیـان هەبـووە، کە دایە ئانانا ڕابەرایەتـی دەکردن، چونکە دایە ئانانـا دەیویسـت مرۆڤەکـان بە کشتوکاڵ و ئـاودێریی و ئاژەڵداریی بژین، بەڵام نەمـروود مەرامـی وا بـوو بیانبـاتە شـارەوە و بیانکـاتە پیشەسـاز وموچەخـۆر و کرێکـار و کۆیلەیان بکات، بە وێنەی ئەم سـەردەمەی ئێسـتامان، چۆن کۆیلەیـان کـــردووین بە نـــاوی دیموکراســـی و دیـــن و ئـــاین و ڕزگـــاری وڵاتەوە،هەموخەڵکیان کردۆتە موچەخۆر و ئەوەی ناوی داهێنـان بێت لەهەموو ڕویەکەوە نەیان هێشتووە هەتـا هەمـوو خەڵکـی چـاوەڕوانی دەسـتی دەسـەڵاتدارەکان بـن جـا هەرچیـان بوێـت بەمیللەتـی بـکەن بەنـاوی جیاجیـاوە هەمووشـی جـگە لە بەرژەوەنـدیی دەوڵەمەنـد و دەسـەڵاتداران هیچـی تـر نیـیە، پـێم وابێـت نەمـرودیش هەر ئەوە مەبەسـتی بـووە ئەم فیکـرو بیـرو بـاوەڕەش ئێسـتا بە بـۆنەی پێشکەوتنەوە زیـاتر برەوی سـەندووە لەهەمـان بیروبـاوەڕ و دینەوە هاتووە خۆرپەرستیش بوونە، یـان خۆریـان بە نـوری خـودا زانیـوە و ئاڵاکەشـیان هەر خـۆر بـووە و زۆر لە شـار و شـارۆچکە و

دێهاتەکانیان ناوی هۆریان پێوەیە، بە بۆچوونی من تەواوی خەڵکەکە لەگەڵیدا هاتوون بەرەوخوار، چونکە نەمروود وازی لێ نەهێناون و هەمان خەڵک و هەمان دین و ئالاش بووە لەگەڵ خۆیاندا گەیاندوویانەتە قیبتییەکان و فەلەستین و دەوروبەری، ئەگەر بڵێین ئەو خەڵکەی هەتا ئێستا بە هەمان دین و دەستوورەوە لەوێ ماونەتەوە، مەبەستم لە ئێزدییەکانە، چۆن بووە، بێگومان دەشێت لە پاشان خەڵکی تر یاخی بووبێتن و ڕوویان کردبێتە هەمان جێگا و خۆیان پاراستبێت و هەتا ئێستا مابێتنەوە، خۆ ئاگادارم کە زیاتر لە هەشتاوچوار جار ئەنفالکراون، تەنها بە دەستی عەرەب، جگە لە قەومانی تری وەکو ئاشوور و ئەسکەندەری مەکدۆنی و مەغۆل و تەتار و تورک و دەیەهای تر، بەلام پرسیارێک دێتە پێشەوە، ئەویش ئەوەیە؛ بۆچی هەردوو ئالا و هەردوو دین یەکن، چونکە نەمروود لایداوە لە دینەکەی و خەڵکەکەی بردووە بەرەو بتپەرستی، نابینیت ئیبراهیم پێغەمبەر بتەکانی شکاندووە و هەلاتووە، ئەگەر وا نەبێت، بۆچی ئۆرشەلیم بە ناوی هەمان دینی هۆرییەکانەوەیە، تۆ بڕوانە ناوی ئۆرشەلیم دەیەها شاریش هەیە بە ناوی هۆرەوە: ئۆرفە، ئۆرەبیلۆ، ئۆرمیە، ئۆرماتو و هەورامان و هۆراسان یان خۆراسان هۆرێن و ئۆرک کە ئێستاش شوێنەوارەکەی ماوە شاری سۆمەریەکان بووە و یەکێ لە پاشاکانی گلگامێش بووەوە شاری ئۆرک لەسەرچاوەکانا هاتوە بەر لەچوار هەزار ساڵ بەرلە زایین لەهۆریەکان جیا بونەتە وە هۆرە یان حوڕە وشاری حەڕان یان خۆریان و زۆری تر... ئەمانە شایەتی دەدەن کە ئەم شارانە و خەڵکەکەیان میترایی، یان هۆری بوون، هەر ئەم دین و دەسەلاتەش بووە شۆڕبووەتەوە بۆ باشوور و شاری کەرکوک و هۆرماتوویان ئاوەدانکردووەتەوە.

ناوی زنجیرەیەک لەپاشاکانی (گودی)یەکانی باوباپیرانی نەتەوەی کورد، کەبەهەڵە شێوێندراون بە گوتی کەلە شاری کەرکوک فەرمانڕەوا بوون :-

| ژ | ناوی پاشا | ماوەی فەرمانڕەوایی |
| --- | --- | --- |
| ١ | ئەمتا گودی نازناوی (گودیاگاوە)ی لێنراوەبەجۆرێکی تریش کە (گودی گاوە)دامەزرێنەرە | ٣ساڵ |
| ٢ | ئەنگیشۆگوردیس | ٦ساڵ |
| ٣ | سالاگاب کار | ٦ساڵ |
| ٤ | شولمە کەڵگا | ٦ساڵ |
| ٥ | ئەلۆلۆمش مەرد | ٦ساڵ |
| ٦ | ئەنیما باگشا شێر | ٦ساڵ |
| ٧ | ئەنگەشووشکۆردۆ دووەم | ٦ساڵ |
| ٨ | ئەیاب لاگاب دووەم | ١٥ ساڵ |
| ٩ | ئیباتە گودکار | ٣ساڵ |
| ١٠ | ئەیار لاگاش کوک | ٣ساڵ |
| ١١ | کوردۆم گوردۆ | ١ ساڵ |
| ١٢ | کوردۆم | ٣ساڵ |
| ١٣ | کوردۆم گورد | ٢ساڵ |
| ١٤ | ئیرروم نەمردۆ | ٢ساڵ |
| ١٥ | ئەبرانۆم ناخ | ١ساڵ |
| ١٦ | هالبوم هۆلگورد | ٢ساڵ |
| ١٧ | پۆزورسین ئەزما ئێل سیوما | ٧ساڵ |
| ١٨ | زیر یا کالی ژیرشا | ٧ساڵ |
| ١٩ | ئەیار لاگاب نەمروود | ٧ساڵ |
| ٢٠ | تیرە پکارکانئەزکاک | ٦ساڵ |
| ٢١ | تیرەکانی گوردای سەرجەمی سالەکانی حکومڕانی ئەم زنجیرە شایانە | ١٩٧ساڵ و ٤٠ ڕۆژ |



ئەم دروشمە گوزارشت لە ٢١ پاشای دەوڵەتی هۆرییەکان
دەکات لە قەڵای کەرکووک دا کە فەرمانڕەوا بوون
بۆیە بەم گەلەیان وتووە هۆرییەکان
ئەم ئاڵایە لە پاش لافاوە مەزنەکەی (نوح)ەوە هەڵکراوە

هەروەها ئەگەر خۆریان پەرستبێت، یان بە نوری خودایان زانیبێت، پەیوەندی بە خۆرەوە هەبووە، دیارە مەقامی ئۆرفە و خورشیدی و هۆرە، ئەم سێ مەقامە زیکری خۆریان پێ کراوە،
لە پاشان دینی زەردەشت لە ڕۆژهەڵاتەوە هاتووە و پەرەی بە دینەکە داوە و بە تەواوی بۆیان دەرکەوتووە کە ئەمانە خودا نین، هەروەها ئیبراهیم پێغەمبەریش بەهەمان شێوە بۆی دەرکەوتووە ئەم مانگ و ئەستێرە و خۆر و بارانە و هەموو جۆرەکانی، هیچ کامیان خودا نین،وەکو لەقورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت لەو کاتەدا حوکمی نەمرورد پاشای ڕوها بووە، لە هەندێک سەرچاوەدا دەڵێن مامی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە، مێژووش باسی دەسەلات و زاڵمیی نەمرورد دەکات کە چەندە زاڵم بووە، ئاشکرایە دەسەلات بەزەبرو زەنگ بەدەست دێت نەک بەماچ بەڵێ بۆیە ئەوکاتە نەمرود حوکمی ئاسیای کردووە بێگومان هەموو دەسەلاتداران بەزەبروزەنگ گەیشتونە بەپلەو پایە و جوگرافیایەکی فراوان جا کە نەمرود نەماوە ولاتەکە بەش بەش بووە و دیارە پارچە کراوەو لە لایەن نەوەکانی پاشاوە و نەتەوەکانی ترەوە وبال وتەیارەکانی سوپاو ولاتەوە بچوک کراوەتەوە ئەو ئمپراتۆریەتە جا هەریەکێ لەو بیرە جیاوازانەی یەکەم جار جیابۆتەوە حەزرەتی ئیبراهیم پێغەمبەر بووە دژی وەستاوەتەوە و لە پاشان بە خۆی و لایەنگرەکانییەوە بەرەوخوار بوونەتەوە و ئەو دین و دابونەریتەیان لەو ناوچانەدا بلاوکردووەتەوە و بۆ ماوەی زیاد لە (٤٠٠) ساڵ بەس فەرمانڕەوایی مەسر، واتا قیبتییەکان کردوە لەپاش دەرچونیان لەمیسر چونەتە ئەو ناوچانەی فەلەستین و هەتا سەرهەڵدانی ئیسلام وسوپاکەی لە فەلەستیندا بون و فەرمانرەواییان کردووە و ئەو ولاتەیان بە ناوی خۆیانەوە کردووە، واتا ئیسرایل نەوەکانی پێغەمبەر یعقوب کوڕی ئیسحاق کوڕی برایم هەتا ئێستاش هەر لەوێن و سەدەها هۆز و تیرەیان لێبووەتەوە و هەتا ئەمڕۆش

کـاریگەری دیـن و نەریتـی زمـانی کوردییـان پێـوە دیـارە، (بـڕوانە: تەورات، یان مرۆڤ و ئاینەکانی میشیل مالرب و تـاتە قوڕینەکانی)، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە، تەنانەت پێش زەردەشتیش هەمان دینی ئێزدی بوو، واتا هەر ئەو دینەی کە ئیبراهیم پێغەمبەر بردی بەرەوخوار، زۆریش لەپێش زەردەشتدا بووە، لێرەدا دەمەوێت ئەوە ڕوون بکەمەوە لە زۆر سـەرچاوەدا دەڵـێن گـوایە ئیبـراهیم پێغەمـبەر هەر زەردەشـتە، بەڵام زەردەشـت نـاوی سـیتامایە و لە ورمـێ لەدایـک بـووە و هەر لەوێـش خێزانـی پێکەوەنـاوە و نـاوی خێزانیشـی دۆغـدایە و سـێ کـچ و سـێ کـوڕی هەبـووە و نـاوی کـوڕ و کچەکانیشـی دیـارە و لە خـوارەوە نووسـیومەتەوە، هەروەهـا نـاوی خێزانـی ئیبـراهیمیش سـارایە، یـان زارایە و کوڕەکـانی ئیبـراهیم پێغەمـبەریش دیـارە کە ئیسـماعیل و ئیسـحاقە، بەڵام ئیبـراهیم نـاوی ئەسڵی نیـیە، نـاوی ئەسـڵی سـەفایە لەسـەرەوە باسـم کـردوە مەبەسـت لە ئیبـراهیم واتـا دینەکەی دینـی ئاشـتی و برایـیە و یەعقـوبیش کـوڕی ئیسـحاقە و بـاوەگەورەی بەنـی ئیسرائیلە، بەڵام دینەکەی ئیبراهیم و زەردەشت زۆر لەیەکەوە دوورن ئیبـــرایم خۆرپەرســـتبوەو زەڕدەشـــت خواپەرستـــبوە ئیبـــراهیم لە ناوچەکانی فەلەسـتین و بەنـی ئیسـرائیل مـردووە، بەڵام زۆریش پێش زەڕدەشـــت بـــووە زەردەشـــت بە دەســـتی تورکـــان کـــوژراوە، کە سـەردەمی فەرمـانڕەوایی و دەسـەڵاتداریێتی مادەکـان بـووە کە ئەکـاتە ساڵی حەفسەتی پێش زاین، لە پاش مادەکان دەسـەڵاتی ساسـانییەکان بـــووە و ساســـانییەکانیش بە دەســـتی ئیســـلام و خەلـــیفەی دووەم عـومەری کـوڕی خەتـاب کۆتاییـان هـاتووە، هەر بـۆیە لە سـەردەمی خەلـیفەی سـێیەم عوسـمانی کـوڕی عەفانـدا قورئـان چـاپکرا، چـونکە عەرەب خوێندەوارییان نەبوو هەتـا ئەو کـاتە، دەتـوانم بڵـێم قورئـان بە زمـــان و نووســـینی ســـەردەمی زەردەشـــتی نووســـراوەتەوە، ئەو فەرمـــوودەیەی پێغەمـــبەری ئیســـلام (ﷺ) بـــۆ شـــایەتی ئەم ووتەیەم

بەسـە، کە دەفەرموویـت: دیلەکـان مەکـوژن، بـا هەر یەکێک لەوان دە کەس فێـری خوێنـدەواریی بکـات، ئەوجـا ئازادیـان بـکەن، بە گرتنـی وڵاتـی ئاریـان و زەردەشـتیان و هەتـا وڵاتـی بەنـی ئیسـرائیل و دەوروبەری و پیـاوە خوێنـدەوار و ئاینییەکـانی زەردەشـتی و یەهودییەکـان خۆیـان فێری خوێندەواریی کـرد و ئەوکـات قورئانیـان نووسـییەوە، بەڵام ئیبـراهیم پێغەمـبەر لە پێشـی حـوکمڕانی سۆمەرییەکانەوە بووە، کە (٤٠٠٠) سـاڵ پـێش ئێسـتا لە هۆرییەکـان جیـابوونەوە، لەچـاو مێـژووی سـەردەمی حەزرەتـی ئیبـراهیم و سـەردەمی نەمروودا دوێنییە، زەردەشـت لە شـەڕێکدا هەر لە ورمـێ کـوژراوە، لە دواتـردا بەڕوونـی باسـم کـردووە، (بـۆ زانیـاری زیـاتر، بـڕوانە: ئاڤێسـتا)، کە خـودی زمـانی زەردەشـتە و هەر بۆخۆیشـی نووسـیویەتی، بەڵام زەردەشـت پەرەی پێـدا و ئاڤێسـتای نووسـی بە نـاوی گاتاکـانەوە، واتـا بـانگەوازی خوداپەرسـتی خـودای یەک تـا، هەرچۆنێـک بـاوەڕی بە دوو هێـز هەبـووە، بەڵام لایەنـی سـەرەکی خـودای خێـر و بەرەکەتـی گرتـووە، بگـرە زۆر چاکسـازیی لەو دابـونەریتەی پـێش خـۆی کـردووە، بێگومـان هەمـوو دینەکـان هەروا بوون و هەتـا ئەمڕۆش لە سیاسـەتدا هەر وەهـایە، هەتـا گەیشـتووەتە ئەمڕۆ هەموو داهێنانێک ئەوەندە دەوری هەیە تـا داهێنـانێکی تـر دێت، بێگومان ئەویش فـەرامۆش دەکرێت. ئەوەتا بە چاوی خۆتـان دەبینن ژیـان و دەوران چـۆن گـۆڕاوە، بـڕوانە هەتـا پێشـکەوتن لە هەمـوو شـتێکدا کـراوە، هەمـوو کەرەسـتەکانی ژیـان بە گشـتی تەنـانەت لە هونەریشـدا بە مەقامیشـەوە، وەک ووتمـان لە سـەردەمی هۆرییەکانـدا چەنـد مەقامێـک داهێنـراوە، لەپێشـتردا باسـمان کـردووە، وەکـو: خورشیدی، هۆرە، وەرڤا، یـان ئۆرڤا. ئەمـانە تـایبەت بوون بە زیکری وەر، یـان خـۆر، لە زەمـانی هۆرییەکانـدا، بەڵام لە زەمـانی گاتاکانـدا مەقـامی قەتـار و خـاوکەر داهێنـراوە، کە تـایبەت بووە بە گاتاکـان، لە

زەمانی ساسانییەکاندا مەقامی ئەڵلاوەیسی داهێنراوە بۆ زیکری خودا، لەو سەردەمەدا بە پیاوە ئاینییەکانیان گوتووە وەیسی، ئێستاش شوێن هەوارەکانیان دیارە، واتا بانگەواز بووە بۆ خوداپەرستی، دیارە حەزرەتی ئیبراهیم لە باکوورەوە بە تایبەت لە شاری ڕوها ئێستا پێی دەڵێن ڕوحا، لە باکوری کوردستان بووە نەمرود ویستویەتی خەڵکی ئازاد لەکشتوکاڵکردنەوە بگوازێتەوە بۆ شارستانی و بتپەرستی دژی نەمروود وەستاوەتەوەو بتەکانی شکاندووە هەتا ئەوکاتەش خودای ئەوان خۆربووە با ئەوەش بزانین زۆر پێش زەردەشت بووە، بەپێی مێژووەکەیان بێت پەرەی پێداوە و لە قورئان و تەوراتیشدا ئاماژەی پێکراوە، بڕوانە کاتێک ئیبراهیم پێغەمبەر ئەستێرە و مانگ و خۆر دەبینێت دەڵێت: ئەمانە خودان، بەڵام کە ئاوا دەبێت دەڵێت: ئەمانەش خودا نین، دیارە گەلەکەی حەزرەتی ئیبراهیم خۆریان بە خودا زانیوە، بۆچی؟ لەو سەردەمەدا زۆر ساردبووە و خەڵکیش بە گشتی خەریکی کشتوکاڵ و ئاژەڵداریی بوون، خۆریش سەرچاوەی هەموو ژیانە، نەمروودیش ویستوویەتی بیبانباتە شارەوە و بیانکاتە بت پەرەست وکۆیلە و فەرمانبەر و کۆیلەی خۆی، ئەمە لە قورئانی پیرۆزدا باسی دەکات و ئاماژەی پێکراوە، ئەم ئاینە شۆڕبووەتەوە هەتا زەردەشتییەکان و کۆتایی ساسانییەکان هاتووە. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕوانە: کتێبی فیتنە مشتومڕی ئاین و سیاسەت لە سەرەتای ئیسلام، لە نووسینی هاشم جعێت، وەرگێڕانی: مامۆستا سابیر عەبدوڵلا کەریم) (ڕۆژنامەنووس و وەرگێڕ و بەڕێوەبەری مافی مرۆڤ لە سلێمانی، چەندەها کتێبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی شیرینی کوردی، لە بوارەکانی: فیکری و مافی مرۆڤ و کۆمەڵایەتیدا، چەندەها کتێبی نووسیوە لە زۆر بواردا، نووسین و وەرگێڕدراوەکانی خۆی دەدات لە بیست کتێب و زیاتر)، هەر لە کتێبی فیتنەدا، کە دەڵێت ساسانییەکان قیبلەی ئەو دەوڵەتە عەرەبییە ئیسلامییە بوون، لە

هەموو ڕوویەکەوە هەموو دەستوور و یاسا و داب ونەریتێکیان لە ساسانییەکانەوە وەرگرتووە، چونکە ساسانییەکان دەوڵەتێکی گەورە و خاوەن شارستانی بوون و کورد بوون و هەورامیش بوون، هیچ کاتێک ناوی فارس نەهاتووە، خودی محەمەد پێغەمبەر (ﷺ) بە کاری بازرگانی هەر لە نۆ ساڵییەوە هاتوچۆی کردوون، کە دینەکەشیان زەردەشتی بووە و مۆگاکان و وەیسییەکان، پیاوە ئاینییەکانی ئەو دەوڵەتە بوون و تەواوکەری ئەم ئاینەن و بە تەواوەتی پەرەیان سەندووە و بڵاوەیان کردووە بە هەموو ڕۆژهەڵاتدا، بڕوانە شوێنی مۆگاکان، واتا بانگدەرەکانی زەمانی زەردەشتی، لەلای کەرکوک پێی دەڵێن بانی مەقان، واتا شوێنی مۆغەکان، دیارە وشەی مەقام لە مۆغەکانەوە وەرگیراوە، مۆغەکانیش لە مۆگاکانەوە هاتووە، بێگومان ئەوان مەقامی ئاینییان خوێندووە، ئەوەش دەیسەلمێنێت ئەم وڵاتە هەر موڵکی کورد بووە، مادەکان دەسەڵاتیان بە سەرەوە بووە و داب ونەریتیان بە ئێستاشەوە لەو ناوچانەدا بەڕوونی دیارە، هەر لەم ناوچەیەدا ئەم مەقامانە دەخوێندرێت، خاوکەر بە زمانی ماچۆ، بە خەو مەواچۆن، خاو واتا خاوی دەکاتەوە، یان خەوی لێ دەخات ئەوەندە مەقامێکی کاریگەرە، یان هەر پەیوەندیی بە خۆرەوە هەیە، ئەم ناوچانە ئێستاش تام و بۆنی زمانی ئاڤێستایی پێوە دیارە، زۆربەی هۆزەکانیش لە ماچۆگۆکانن، بەڵام داخەکەم ئێستاکە بەم مەقامانە دەڵێن حیجاز، کە هەر لە کۆنەوە پێی دەڵێن خاوکەر. بێینەوە سەر مەقامی باجەڵان، یان ئای ئای، دیارە ئەم مەقامە بە سەمەن گوڵا گوتراوە، بەسەرهاتی کچ و کوڕێکە لە ناوچەی بنکورەی سەر بە شارۆچکەی قۆرەتوو و شاری خانەقینی خۆشەویستی گەرمیانە، لە خەفەتەوە لەدایک بووە، بە بەسەرهاتەکەدا دیارە خاوەنی شیعرەکە دەڵێن دایکی سەمەن گوڵ بووە، ئەم شیعرەی بە کچەکەیدا هەڵگوتووە بە ناوی دەستگیرانەکەیەوە، لە پاش بەسەرهاتێکی

نــاخۆش، لە پــاش بەیەکگەیشــتنیان ڕوویــداوە و بــووەتە هــۆی جیابوونەوەیان، ئیتر ئەم شیعرە کەوتووەتە سەر زمانی هونەرمەندان و خەڵکــی نــاوچەکە و ئەوەتــا تــا ئەمــڕۆ هەر مــاوە، گــوایە دەســتگیرانەکەی بینیــویەتی جــوانێ دانیشــتووە کــونە پــڕ دەکــات، گەنجەکەش ناوی نەزانیوە و پێی گوتووە: سەمەن گوڵکەی دەم نوقڵ و نەوات وێم وە بی مەڵحەم، چەنـی چم لەلات. لە دواتـردا بە درێژیـی ئامــاژەم پێکــردووە، بە نیســبەت شــیعری شــاپەروەرەوە ئەمەش بەســەرهاتێکی تــرە، کە پەیوەنــدی هەیە بە شــاپەروەر و میــر مەنسوورەوە، شـاپەروەر خێزانـی میرمەنسوور بـووە، وە شـاکریش هاوڕێی میر مەنسوور بووە، ئەم شـیعرەش هەر بە مەقامی باجەڵان گوتراوە، ئەم شیعرە شیعری میر مەنسوورە، پێیان گوتووە مەسویرە بە زمانی گۆرانی. هاوڕێیەکیشی هەبووە میر مەنسوور نـاوی شـاکر بـووە بە ئەویشـیان گوتـووە شـاکە، بێگومـان شـاکریش شـاعیرێکی بەتوانا بووە، میر مەنسوور چی شعیرێکی گوتووە، شـاکەش هەر بە شــیعر وەڵامــی داوەتەوە، بــۆیە ئەگەر یەکێــک لەســەر شــتێ زۆر بڕۆیشتایە دەیانگوت دە ئیتر مەیکە شاکە و مەسویر، بۆیە گوتەیەکم گوێ لێبووە زۆرجار، بەتایبەت لە زاری دایکمەوە؛ یەکێک شتێک بڵێت و ئەوی تــریش بیڵێــتەوە، واتــا میــر مەنســوور هەرچــی گوتــووە، شــاکریش وەڵامیــداوەتەوە، بــۆ ڕاســت و دروســتی ئەم گــوتەیەم؛ زۆرجـار دەبیسـت دایکم دەیگوت ئیتـر نـاوڕتەوەی کردەی شـاکە و مەسـویرە. هەقـی خـۆیەتی لێـرەدا نـاوی بـرای ئـازیزم بهێـنم، کـاک نەعمەتـی زەحمەتکێـش، نووســەر و ڕونـاکبیری کـوردی یارسـانی، دانیشـتووی شـاری تـارانە یـادی بەخێـر، کە بەنـدە ئەم مەقـامەم بەم شیعرەوە بۆ چڕی، لە پاشان گوتی: دەمت خۆش، دەستت خۆشبێـت، ئەمە بەسـەرهاتی شـاکە و مەسـویرەیە. لە پاشـان ڕوونکردنەوەیەکـی پڕ بە پێستی خۆی دا لەسەری زۆر ڕوون بوو، سوپاس بۆ مامۆستا

نیعمەتـی بەڕێـز. لە سـەرەتای شیعرەکەشـدا وا دەسـت پێـدەکات بەڕاسـتی لەوانەیە ئەم شـیعرە نـاتەواو بێـت، بەڵام مـن هەر ئەمەم بیستووە لە مامۆستا حوسێن عەلی هونەرمەند. ئەمەش بەڕاستی زۆر تەواو نەبـوو، لەمـلاو لەولا کـۆمکردوونەتەوە لەلای هونەرمەنـدانی نـاوچەی بنکـورە و زۆر خەڵکـانی تـر. دەمەوێـت ئەوەش بڵـێم؛ بـۆ ماوەیەکی زۆر میر مەنسوور و شاکربەند بوون و لە بەندیخانە بێ سەروشـوێن بـوون لەگەڵ شـاکردا، کەس پێـیانی نەزانیـوە کە بەنـد بـوون، کاتێـک کە ئـازاد بـوون، میـر مەنسـوور و شـاکر تەکبـیرێک دەکەن دەڵێن: با کارێکی وا بکەین، خێزانەکانمان تـاقی بکەینەوە، ئێمە مـاوەیەکە بێئاگـاین، بـا بـزانین چـۆن وەڵاممـان دەدەنەوە، خـۆ هیچیشیان نەکردووە، بەڵام خێزانەکەی شاکر بێ پرسینەوە دەرگاکە دەکـاتەوە، هەر مێـردەکەی خۆشـی بـووە، میـر مەنسـوور شـەو کە دەگـاتەوە مـاڵی خۆیـان درەنگـانی شـەو دەبێـت، پـێش ئەوەی خـۆی ئاشـکرا بکـات، خێـزانەکەی تـاقی دەکـاتەوە، میـر مەنسـوور لەودیـو دەرگـاکەوە داوای پەیوەنـدی لە خێزانەکەی دەکـات وەکو بێگانەیەک. خێـزانەکەی بەم شـیعرە وەڵامـی میـر مەنسـوور دەداتەوە، بەڵام داخەکەم خێزانـی شـاکر زوو دەرگـاکەی کـردۆتەوە لەکۆتاییـدا جیـابوونەتەوە لە یەکتـری، شـیعرەکەش دەڵێـت: بەم شـێوە دەسـپێ دەکات لەخوارەوە:

**پەخشە مجەڕەت وەی بسمارەوە**
**وشتر لان بگرۆ وەی موغارەوە**
**هێسر بزایۆ کێکف بگرۆ بەر**
**مەر ئەوسا بوینی بالای شاپەروەر**
**داری پیرەدار یەتیم وەیدار نمە بۆ**
**عەبلەیش وەی خەیاڵ وەماڵ نمە بۆ**

**شەوار زمسان وەیسال نمە بۆ**

**دۆس دویر ولات وەی یار نمە بۆ.**

**دۆس دویرولات مەبەستی لەمیرمەنسوربووە هەرئەگەڕێتەوە**

بەم شێوەیە وەڵامی دەداتەوە و دەرگاش ناکاتەوە هەتا بەیانی،

ئەمەش شیعری سەمەنگوڵە:میرزام سەراوێ

**میرزام سەراوێ، میرزام سەراوێ ئارۆ**

**ڕاگەم کەفت وەی سەر سەراوێ**

**دیم دانیشتیەن باوان خراوێ**

**کونەش پڕ مەکەرد تەرک تەراوێ**

**وەی ناز و غەمزە ڕوومەت گولاوێ**

**کونەش پڕ مەکەرد چە بەحر بێ پەی**

**پەنجەی چوین شمشال، قامەت وێنەی نەی**

**پەنجەی شمشالی مەکەرد وەی ئاودا**

**مەشهاورد وەزوڵف خەیاتەی خاودا**

**من وەی زویخوو زام پەلاسە بەرگم**

**تیربرژانگی پێکاشان جەرگم**

**پانام چە ئەدەب سەلامێ کەردم**

**باڵش واوەردەن من ڕوح سپەردم**

**باڵ چاوشدا لێو وەی خەنەوە**

**عەلەیکم وەبان دییەی سەنەوە**

**واتم جامێ ئاوبەش پەنەم وەی دەست وجامت**

**وە فدای بالات بام نمەزانی نامت**

**وات ئاو مەیەم پەنەت وەی دەست و وەی دڵ**

**جامم چینیەن نامم سەمەن گوڵ**

**واتم سەمەن گوڵە کەی دەم نووقڵ ونەوات**

وێم وە بێ مەڵحەم چەنی چم لەلات
وات ئەی یەتیم چەن هەزارانێ چەتەورە بەردم
مەڵحەمم چەزام هیچ کەس نەکەردم
وات هەنی قەومانم بکەم خەوەردار
پارە پارەت مەکەن وەی تیغ ئاودار
واتم قەومم وەفدای قەوم وخوێشت بۆ
دڵەکەم وە فیدای دڵەی ڕێشت بۆ
دەم وێمیش وەیبان گۆنای تەڕت بۆ
بەڵکەم شوێن تیرت چە دڵ سارێژ بۆ
وە تیغ مەمکوژە زامم دیارەن
خەڵکان مەواچۆن یە گونا کارەن
تاڵێ چە زوڵفت بخە وەی گەردەن
خەڵکان باباچان ئەمر خواش کەردەن
وات یەتیم کەفتی وەی حاڵ و جەسە
دەمت باورەوە کۆمای خێر یەسە

پێم وابێت دایکی سەمەن گوڵ بەرپەرچی بڕو بووختانەکانی داوەتەوە، ئەم شیعرە خۆی شایەتە کە لە گەرمیان گوتراوە و بەسەرهاتێکە شێوەزاری ناوچەی بنکورەیە و تایبەتە بە هۆزی گەورەی باجەلان. بەسەرهاتی دوو خۆشەویستە و بەهۆی بەد و بەدکارەوە لە یەکتری جیابوونەتەوە، دیارە کارەساتەکە وەکو مەم و زین وابووە، لە پاشان ئەم شیعرەیان لەسەر نووسراوە و کەوتووەتە سەر زاری هونەرمەندان و بڵاوبووەتەوە بە هەموو کوردستاندا، ئەگەر گوێی بۆ ڕادێریت، بە جوانی بۆت دەردەکەوێت ئەمە شێوەزاری زمانی ماچۆی باشووری با شووری کوردستانە، واتا لەگەڵ ماچۆی هەورامانندا وەکو چۆن زمانی هەولێر و سلێمانی

کـــەمێک جیـــاوازە، بەو جـــۆرەیە، ئەگینـــا جیـــاوازییەکی وای نیـــیە. مامۆســـتای گەورەی مەقـــامی کـــوردی م.عەلـــی مەردان لەخـــۆڕا نەیگوتـووە ئەم مەقـامە هـی باجەڵانەکـانە، ئەوەتـا شـیعرەکە خـۆی شـــایەتی دەدات لەســـەر چـــۆنێتی زمـــان و نـــاوچەکە و کـــۆنیی بەسەرهاتەکە، زمانی شیعرەکەش هەر هی ناوچەکەیە، چونکە زمانی باجەڵان و زەنگەنە، یان کاکەیی، لەگەڵ زمانی هەورامیدا جیاوازییان هەیە، هەر لە ماچۆیشدا فەرق و جیاوازی هەبووە، لە کۆنیشدا وەکو زاراوەکانی ئێستا ئەم مەقامە ناوی ئای ئایە، چونکە بە ئای ئای دەست پێدەکات لەسەرەوە ئاماژەمان پێکرد، بەڵام ئێستا بووە بە بەیات، خۆی لە بنەڕەتدا بەیاد بووە، دەمەوێت ڕوونکردنەوەیەک بدەم لەســـەر چـــۆنێتی تێکەڵاوبـــوونی مەقـــامی کـــوردی لەگەڵ وڵاتـــانی چواردەورمانـــدا، ئـــێمە و فـــارس هەرچۆنێـــک بێـــت هاوســـێین لە دێرزەمـــانەوە، بێگومـــان بە یەک میللەتـــین، بەڵام خـــۆ عەرەب لە جەزیـرەی عەرەبییـەوە هـاتوون بـۆ لای ئـێمە، مانـای وایە ئەوان لە ئێمەوە وەریانگرتووە، یان تورک لە دەوروبەری چینەوە هاتوون بۆ ئێرە، خـۆ ئەوکـاتە تەلەفـۆن و کەنـاڵی ئاسـمانیی بوونیـان نەبـووە، فەیسبووکیش نەبووە تا بڵێین لە ڕێی ئەمانەوە وەرمانگرتووە، بەڵام خـــۆ مێـــژووی جیهـــان دەیگێـــڕنەوە کە ئـــێمە کـــۆنترین مرۆڤـــی ئەم نـــاوچەیەین، بەڵـــگەش ئەوەتـــا قەڵای هەولێـــر (٨٠٠٠) هەزار ســـاڵە ئـاوەدانە یـان چەنـدین قەڵا هەیە لە بـاکوری کوردسـتاندا لە شـاری ئامەد و شاری شەڕناخداو شارەکانی تردا لە باکوری کوردستاندا، بۆ مـــاوەیەکیش حـــوکمی ئەم وڵاتـــانەی چواردەورمـــانی کـــردووە، ئەمە لێرەدا ڕوون و ئاشکرایە نەریتی ئێمە ڕۆیشتووە، نەک نەریتی ئەوان هـــاتووە، بەڵام لە پاشـــان زلهێزەکـــان هـــاتون وەکـــو ئاشـــوریەکان و ئەسکەندەری مەکدۆنی و هۆلاکۆ و جەنگیزخان و تەیموری لەنگ و هەروەهـــا شـــاکانی فـــارس و ئینجـــا لەشـــکری ئیســـلام و لە پاشـــان

ئیمپراتـۆری تـورک، هەروەهـا ململانێـی نـاوخۆیی خۆمـان هەمـوو نەریتەکانی ئێمەیان لەناوبرد و شێواندویانە، لە لایەکی ترەوە کورد لـق و هـۆزێکی زۆری لێبـووەتەوە و هەر هـۆزەو بەگـوێرەی دەور و ڕۆژگـار نەریتـی گـۆڕاوە و پیـت و وشـەی تـازە هـاتووەنەتە نێـو ژیانیـانەوە ولەداب ونەریـت و زمانیشـدا بەتەواوی گۆڕانکاریـان بەسەردا هاتوەو وردە وردە هەریەکە و بووە بە وڵاتێکی سـەربەخۆ، لە سـەردەمی ئەمڕۆشـدا هەر مـاوە، ئەوەتـا هـۆزی گەورەی بـاجەڵان هـۆزێکی تـری لـێ جیـابووەتەوە بە نـاوی جمـویر، سـەرۆک هۆزەکانیشـیان ئـامۆزا و بـرازای یەکتـرن، یـان نمـونەی تاڵەبـانی لە زەنـگەنە جیابـۆتەوەو بـووە بە هـۆزێکی سـەربەخۆ هەر زەنـگەنەش بوون ئەوانەش کە بوون بە دەوڵەت بەهەمان شێوە جیابوونەتەوە، بۆ نمـوونە هەرلەسـەرەوە میترابیەکـان گومـانم نیـیە سـەردەمی ئـادەم و حەوایە، لە پاشـان گودییەکـان، کەسـەردەمی نـوحەو لە پـاش ئەوان ، هۆرییەکـان، سـۆمەرییەکان، ماگەکـان، یـان گاورەکـان و مادەکـان، پەهلەوییەکـان، ئارامییەکـان، کاشـییەکان، ئیلامییەکـان، ئیبراهیمییەکـان، ئێزدییەکان، نەوەکـانی حەزرەتـی ئیبراهیم (ئیسـحاق و ئیسـماعیل)، کە ئەمانە هەمویـان دەوڵەت بونەو لەکورد جیابونەتەوە جارێ دەوڵەتـی یەهود هەزاران ساڵ فەرمان ڕەواییان کردووە هەتا سەردمی ئیسلام هەزاران هــۆزو تیــرە و شــاریان لێبــووەتەوە هەمـوویــان لەم دوونەوەیەن ئسماعیل وئیسحاق بەتایبەت ئیسحاق کوڕی ساراخاتونە و ئیسـماعیلیش کـوڕی هـاجەرەیە و گـوبتییە، واتـا میسـرییە و کەنیزەکەکەی سارا خاتوونە،لەسەرەوەش باسم گردووە بەڕونی کە پادشـای قیبتییەکـان پێشکەشـی کـردە زارا خـاتوون، دایکـی ئیسـحاق لەپاشـان سـارا خـاتون هـاجەرەی مـارەکرد لە حەزرەتـی ایبـراهیم پێغەمبەر درودی خـوای لێبێ چونکـە سـارا خـاتون منداڵی نـەدەوبوو بۆئەوەی زوڕییەتیان هەبێت بۆیە گوتی بە ایبراهیم پێغەمبەر مارەی

بکه خۆمارەکردنیش نەبوه هەروەها کەنیزکي زارا خاتونبوه خۆي ئجازەیداوەو ئەویشچۆتەلای و مارەیکردە لە سەرقسەی سارای خێزانی ئەوە بو ئیسماعیلی بو لە پاشاندا ساراخاتون ئیسحاقی بوو ماوەیەکی زۆر سارا خاتون لەلای پادشا مایەوە و خزمەتی پادشای قیبتییەکانی کرد ئەو کەنیزەکەی پێشکەش بەساراخاتون کرد واتا هاجەرە هەموو پێغەمبەرەکان لەوانن، بەنی ئیسرایل زیاتر دەگەڕێنەوە سەر یەعقوبی کوڕی ئیسحاق یان ئەسهاک چونکە هەموویان نەوەی کوردن، کەلتوورەکە لە بنەڕەتدا کوردییە، چونکە ناوەکانیان کوردین و شایەتحاڵن بۆ ئەمڕۆ بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە تەوراتی پیرۆز کتێبی موسا درودی خوای لەسەربێت. شوێن هەوارەکانیان شایەتحاڵن بۆ ئەمڕۆ دیارە ئیلامییەکان ئەوەتا شاری ئیلام و کاشییەکان، شاری کاشان بە قاڵی کاشان بەناوبانگە، میترایيەکان دیارە شوێنی ئارییەکان، یان ئاگرییەکان، هۆرییەکان دەیەها شار و دێیان هەیە بە ناوی خۆیانەوە، وەکو: دێی هۆرێن لە بناری بەمۆ، هۆرماتوو، هەولێر، یان ئۆرەبیلۆ، ئۆرڤا، ئۆرشەلیم و ئۆرمێ، هورە، یان حورە، مەدائن شاری میدیاکان، یان مادەکان نزیکی بەغدادی پایتەختی ئێراکە، یان عێراق، هەموو ئەو حکومەتانەی کورد شوێنەوار و ناوونیشانی خۆیان هەیە و دیارە ئەگەر خوێنەری کورد بە جوانی بیری لێ بکاتەوە، لە ڕۆژئاوای کوردستان و زۆری تر نامەوێت درێژەی پێ بدەم لە پێشتردا بە دووورودرێژیی باسم کردووەبۆزانیاری زیاتر بڕوانە کتێبی م.شاسوار هەرشەمی ود.کتۆر عەبدوڵا دارتاش ناوی شارەکانی باشوری عێراق هەموی کوردی پەتییە ، سەرەڕای ئەم هەموو بگرە و بەردەیەی ڕۆژگارە چەندە زلهێز و زاڵم هاتوون و چوون تا بە ئەمڕۆ، نەیانتوانی بە تەواوەتی بمانسڕنەوە، (بۆ زانیاری زیاتر بڕوانە: مامۆستای بەڕێز و کوردپەروەر، مامۆستا چێنەر و کتێبی سێیەری شمشێرەکان، هەردوو

بەشەکەی، ئاش و ئەنفال و سێبەری شمشێرەکان، بەشی (١ و ٢)، ئاش و ئەنفال (ل٦٣-٩٠)). من دەستخۆشی لێدەکەم هێندە بە دڵگەرمییەوە داکۆکی لە گەل و خاکەکەی دەکات، هیوای خۆشی و بەختەوەریی بۆ دەخوازم، بەڵام من لێرەدا لەگەڵ ئەو بۆچوونەیدا نیم کە دەڵێت گوایە ناوی کورد لە سەردەمی ئیسلامەوە هاتووە، گوایە بۆ ناشرینکردنی کورد بووە، بڕوانە ناوی کورد چۆن هاتووە لەدوای لافاوەکەوە، لەو کاتەوەی کەشتییەکەیان گیرساوەتەوە گوتوویانە گود، شوێنێکی باشە، بەڵام عەرەب گۆڕانکاریی تیادا کردووە بۆ بەرژەوەندیی خۆی، بڕوانە گودی، گوردی، کوردی، دواتر بووەتە کورد لە سەردەمی عەرەبدا، چونکە عەرەب گ لەفز ناکات، بۆیە لەباتی گود، یان گورد کردوویانە بە کورد، ئەگینا خۆی گودە، واتا باش، کەواتە بەو خەڵکانەیان ووتووە باشەکان، شاری بۆتان، یان باشان، شایەتە بۆ ئەم گوتەیەم ئێستاش بوونی هەیە لە باکووری کوردستان، لە پاشان بووە بە کورد، ماوەیەکی زۆر عەرەب حوکمی ئەم ناوچانەی کردووە و بە ناوی بیدعەوە هەموو کەلتووری جیهانی حەرامکردووە و هەرکەسێک سەرپێچی بکردایە سزاکەی لە مل پەڕاندن کەمتر نەبووە، جا وردە وردە شتەکان سواون و کاڵبوونەتەوە لە پاش ئەوانیش سەدەها داگیرکەر و زلهێزی تر هاتوون و وڵاتیان کاولکردووین و داریان بەسەر بەردەوە نەهێشتووە، لە سەردەمی زەردەشتدا بێگانەکان بە ئاڤێستایان گوتووە دین کورد، بەڵێ دینی کورد بووە، ناوی کتێبەکەش ئاڤێستایە و ئایەتەکانیشی گازایە، گوایە لە سەردەمی ئیسلامەوە ئەم ناوە هاتووە، یان لە دینی کوردەوە هاتووە، ناوی کورد لە گودییەکانەوە هاتووە، گود واتا باش، مەبەست لە شوێنەکە بووە کە کەشتییەکەی لێ گیرساوەتەوە، جا کوردیش، واتا باشەکان، کاک چێنەر دەڵێت عەرەب زانیارییان نەبووە لەسەر ناوچەکە، بۆ ئەوە ئەم ناوەیان بڕیوە بەسەر

کورددا وەکو گاڵتەپێکردن، بەڵێ هەرچییان لەدەست هاتووە درێخییان نەکـــردووە، بەڵام لەپێشـــدا ئەبـــوبەکر، عوســـمان کـــوڕی عەفـــان، عەبدولموتەلیب و نەوفلی کوڕی وەرەقە، پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) ئەو کـاتە تەمەنـی نـۆ سـاڵان بـووە لەگەڵ باپیرەیدا هـاتوچۆی وڵاتانییـان کـــردووە بەبـــۆنەی بازرگـــانییەوە، بەتـــایبەت وڵاتـــی میزۆپۆتامیـــا و ئیمبراتـۆری ساسـانی، لە دەیەهـا سـەرچاوەدا بەم شـێوەیە باسـکراوە، تەنـانەت عوسـمانی کـوڕی عەفـان لەڕێـی بازرگـانییەوە زانیارییـان وەرگرتـــووە و میســـریان فـــتح کـــرد جـــا هەتـــا ئەوکـــاتەی مـــحەمەد، پێغەمـــبەری ئیســـلام (ﷺ) بـــوو بە پێغەمـــبەر هەر خەریکـــی کـــاری بازرگـــانی بـــوو کە گەورەش بوهەربازرگـــانی دەکـــرد لەگەڵ دایـــکە خەدیـجەدا، ئەو هەمـوو زانیارییـانەش دەربـارەی وڵاتـان هەر لە ڕێـی کـاری بازرگـانییەوە وەریـان گرتـووە، دەربـارەی هەمـوو شـتێک و لە هەمـوو ڕوویەکەوە بازرگانـانی ئێـرەش هـاتوچۆی ئەوێیـان کـردووە وهەمووشتێک ڕاستەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆ ئـاڵوگۆڕی پێکراوە دیـارە ململانێی نێوان دەوڵەتانیش هەبووە، وەکو نێوان یەهـود و مەسـیح و ساسـانیبەکان، هەروەهـا ڕۆمەکـانیش، جـا بـۆیە پێویسـتی کـردووە قەومێکی وەکو عەرەبی سەحرانشین و دڕو غەزاکەر و برسـی و هـیچ نەدیو لە دژی ئەمانە، بەتـایبەت یەهـود، بە هاوکـاری زاناکـانی مەسـیح دروسـت بکرێـت و لەم ناوەڕاسـتەدا سـاز و ئامـادە بکرێـت هەمیشـە لەبەینـی ئەم سـێ چـوار دەوڵەتە گەورایە کێشـمان کـێش هەبـووە هەمویـان دژی یەهودبـون هەتـا ئەوە بـوو خـوای گەورە جـوتی کـرد (مـوحەمەد ) (ﷺ) وەکـو پەیـامبەر بـۆ نـاردن وئەوەی ئەوان ئاواتـییان بوو بەدی هات و کرا، هەمـووی ڕامـاڵی، ئەوەش ئەنجامەکەی بـوو بە شـایەتی دەیەهـا سـەرچاوە کە سـەلماندوویانە، هەروەهـا ئەو نـاوەش مەبەستمان ناوی کورد بوو، لەپاش لافاوە گەورەکەوە پێم وابێت هەر لەو ڕۆژەوە گـۆی زەوی سـەقامگیر بـووە، بە تەواوەتـی کە ژیـانی

نوێکردووەتەوە. لە پێشتردا بەڕوونی باسم کردووە، هەتاکو ئەمڕۆ قوربانی و خوێنێکی زۆر دراوە، جا لێرەدا پێویستە سوپاسی هیمەتی ئەو دڵسۆز و هونەرمەند و ئەدیب و نووسەرانە بکەین دەم بەدەم و دەست بەدەست و سینە بەسینە بە کۆشش و بە خوێن گەیاندوویانەتە ئێرە، ئەگەر هیمەتی ئەم دڵسۆزانە نەبوایە، ئێستا خاک و نەتەوە و کەلتوورمان نەمابوو، هەقی وایە شانازییان پێوە بکەین، چونکە خۆیان بەخت کرد بۆ ئێمە، کە ئەمڕۆ خاوەنی ئەم خاکەین و بە ئازادی تیایدا دەژین، وەکو چۆن ئەمڕۆ خۆتان بە چاوی خۆتان دەیبینن هەزارەها ڕۆڵەی قارەمان خۆی فیدا دەکات بۆ میللەتەکەی، بەڵام بەداخەوە هەموو شتێک فەرامۆش کراوە، خۆ هەموومان دەمرین، هیچ نەبێت با بە ویژدانەوە بمرین، نابێت بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی تاکماڵی خۆمان و نەوەکانمان وێران بکەین، چونکە ئەم نیشتمانە هەمیشە ماڵی ئەوەیە لەپاش تۆ بەجێ دەمێنێت ئەو دێتە دنیاوە ئەوەتا ئێمە سی ساڵە خۆمان حوکمی خۆمان دەکەین، تەنها شتێک نەمانکردبێت، خەمی خۆمانە، دەتوانم بڵێم بە ناتەباییەکانمان خزمەتی دوژمنانمان کردووە، بڕوانە چەندە شتی پیرۆزمان لەدەست داوە و کەس خەمی ناخوات، ئەی ئەو هەموو قارەمانە لەبەر چی خۆیان بەخت کرد؟ بێگومان هەر لەبەر ئەمڕۆ نەبوو؟ ئەی برای بەڕێزم بەرپرسی وڵاتم، گەورەم، سەروەرم، داوات لێ دەکەم بە ویژدانەوە بمرە، تەنها شتێک کە مرۆڤ لەگەڵ خۆیدا بیباتە گۆڕەوە، دڵێکی ئاسوودەیە کە مرۆڤ لەگەڵیدا بیباتە گۆڕەوە، ویژدانی ئاسوودەیە تەنها شتێک لەپاشی بەجێ بمێنێت، شوورەتێکی پاکە، مێژوو بۆ هەمیشە هەرگیزاو هەرگیز لە یادیان ناکات و دەبێتە جێگای شانازیی بۆ نەوە لەدوای نەوەی، هەروەها بۆ میللەتەکەشی، ئەوەتا بۆ نموونە ئەم هونەرمەندانە: مامۆستا عەلی مەردان، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، حەسەن زیرەک، حسێن عەلی، محەمەدی

ماملیٚ، مەزهەری خالقی، عەزیزی شاروخی، ناسری ڕەزازی، سمایل ساابوری، سەید محەمەدی سەفایی، حیشمەتوڵڵای لورپنەژاد، مامۆستای بە توانا و پایەبەرز ڕەشیدی فەیزی نەژاد، بە کەمانچەکەی و بە مەقام و گۆرانی، ئەوەتا هەتا ئەمڕۆ خزمەت دەکات، مامۆستا حامیدی ژەنیاری بەتوانا لەم ڕۆژە سەختەدا لە کاتی ئەم نەخۆشییە نەگریسەدا (کۆرۆنا) ڕۆژانە لەسەر شەقامەکان و شوێنە گشتییەکان و لە کۆڕو کۆبوونەوە جوانەکانی شەوانەی دۆست و خۆشەویستانیدا بەبیٚ بەرامبەر دڵی مرۆڤەکان خۆش دەکات و خزمەت بە کەلتووری کوردی دەکات و کەلتووری کوردی زیندوو ڕادەگرێت، جێگای شانازیمانە و هەزارەهای تری وەک ئەمانە بە ئاواز و هونەرەکەیان خزمەتێکی گەورە بە خاک و ئاو و نەتەوەکەیان دەکەن و خۆشەویستی دەخەنە دڵەکانەوە، هەروەها بە هونەرەکەیان هەموو شارەکانی کوردستان گریٚ دەدەن بە یەکەوە و مێژوو و جوگرافیای نیشتمان دیاری و تۆمار دەکەن، بۆ نموونە من کە مهاباتم نەبینیوە، چۆن ئاشنا بووم پێیان؟ لە ڕێی هونەرمەندانەوە، یان لە ڕێی شاعیرانەوە، بۆیە میللەتانی تر ڕێزێکی بیٚ پایان لە هونەر دەگرن، چونکە ژیان بیٚ هونەر زۆر بێمانایە، ژیان بە هونەر دەڕوات بەڕێوە، هونەر تەنها گۆرانی نییە، بیناسازیی، دارتاشی، وێنەکێشان، پلانданان، نەخشەسازیی، ئاسنگەریی، سوپای سەربازیی، کشتوکاڵ و تەنانەت شۆڕشەکانیش بەبیٚ هونەر پەرەناسێنن، من دەڵێم زۆر بەداخەوە میللەتی کورد هەروەکو چۆن ڕێز لە ژن دەگرێت، هەرواش ڕێزی هەیە بۆ هونەر، هەر واش لە هونەر دەڕوانێت، تەنها بۆ خۆخاڵیکردنەوەی غەریزە سێکسییەکەی ژنی دەوێت، ژن زۆر زۆر پیرۆزە، هەتا ژن ئازاد نەبێت، هەتا هونەر لەلای کورد بەڕێز نەبێت، ئەم کوردە بە خاوەنی هیچ نابێت، دەبینیت سیاسەتمەداران ئەگەر بیانەوێت وتارێک پێشکەش بکەن، بەبیٚ هونەرمەندان و جوانی و

خۆڕازندنەوەی کچان و ژنان جەماوەریان بۆ کۆنابێتەوە، بەڵام سەد حەیف و مخابن، گەلی کورد ڕێز لە هونەر ناگرن و نەشیانگرتووە، نموونەیەکتان بۆ دێنمەوە: لە نەوەدەکاندا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەفدێکیان بە نوێنەرایەتی چووبوونە ئەمریکا، گوتیان هەزارەها دۆلارمان دا بە مایکل جاکسۆن بۆئەوەی دوو سێ کۆپلەمان بۆ بڵێ لەسەر کورد، من دەڵێم بەداخەوە، ئەوەیە ڕێزنەگرتن لە هونەری کوردی، خۆ ئەو پارەیە بۆ تیپێکی کوردی خەرج بکرایە، گەلانی دونیا باشتر کوردیان دەناسی، بەڵام لە ڕاستیدا هونەر ڕۆڵی سەرەکی هەبوو لە ناساندنی کورد و دۆزەکەی به میللەتانی دونیا لە هەموو بوارەکانی تردا و هەر لەڕێی هونەرەوە گەلانی دونیا زانییان کورد جینۆساید کراوە و هاتن بە هانامانەوە، بەڵێ دەتوانم بڵێم لە سەرەتای ژیان و مرۆڤایەتیدا خوێندەواریی نەبووە، تەکنۆلۆژیاش وەک ئێستا پێش نەکەوتبوو، بەڵام ئەوە هونەر بوو مێژوو و ئەدەب و کەلتووری گەیاندە ئەمڕۆ، بگرە جوگرافیاشی دیاری کرد، هەمیشە دڵانیشی لە غەم پاراستووە، بەڵێ ئەمڕۆ بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیاوە تێکەڵاوییەکی زۆر دروست بووە و بووەتە هۆی بێ سەروبەرییەکی زۆر، هونەر و کەلتووری هەموو وڵاتانی سەر ڕووی زەوی تێکەڵاو بووە، زۆریش بەناڕێکی بڵاو دەبێتەوە، نەک هەموویان، بەڵکو بەشێکی زۆری چی لە ڕووی درامی، یان هەر بەشێکی تری هونەر، بەتایبەت گۆرانی و میوزیک بەتایبەت، ڕەسەنایەتییان شێواندووە، من لەگەڵ پێشکەوتندام، بەڵام نەک شێواندن، با هەرکەس لە ئاستی وڵات و توانای هونەریی خۆیدا داهێنان بکات و خزمەتی وڵاتی خۆی و مرۆڤایەتی بکات، تەنانەت بۆ وڵاتانی تریش ببێتە کێبڕکێ، ئەوکاتە هەموو جیهان بە جوانی پێشدەکەوێت، من ناڵێم ئەوکاتە شتی کرچ و کاڵ نامێنێت، بەڵام با کەمتر بێت، هیوادارم هەموو مرۆڤێکی خاوەن ئەزموون، یان خاوەن

دەسـەڵات، یـان لە هەر بـوارێکی تـردا توانـای هەیە بـا لەخـزمەت مرۆڤایتیدا بێت و ببێتە سەرچاوەی خۆشی بۆ هەموو مرۆڤێکی سـەر ئەم زەوییە بەبێ جیاوازی، ئەگەر هەیبێت و کەس سـوودی لێنەبینێت چی بەچی دەکـات و بـۆ کوێی دەبـات، پێموابێت تەنها زیـان بە خـۆی دەگەیەنێت، ئەوەتا ئەم پارچە هۆنراوەیەش پێشکەش بەو کەسانە بێت لە مـنەوە کەوا دونیـا دەگـرن بە کۆڵیـانەوە، یـان خـوێنی هەژاری بـۆ دەڕژێنن لەپێنـاوی چـی؟ فەرمـوون لە کـانگەی دڵمەوە پیـرۆزت بێت ئەی ئەو کەسـەی دژی هەمـوو جوانییەکـانی سروشـتی جـوانی سـەر ئەم ئەسـتێرەیەیت، دەمەوێت کەمێک بەئاگـات بهێـنمەوە ئەگەر ئاگـات مابێـت، هیـوادارم بەئاگـات بێـنمەوە زۆر شـتم لەم چەشـنە بینیـوە، فەرموو ئەوەش هەڵبەستەکە، کە هەڵبەستی بەندەیە:

**بـۆ کوێی ئەبـات**

**ئەی قوڕ بە سەری جا بۆکوێی ئەبات**
**هـەرچەندێ مـاڵ وسـامان پـەیـدا کـات**
**گەردەلوولی مەینەت کاتێ هەڵ بکـات**
**هــەر بــە یــەک چـرکە لـەنـاوت ئـەبـات**
**چەندەها زلـهێز جیـهانیـان کـاول کرد**
**کوا چییان لێهات ئەی بۆ کوێیان برد**
**ئەوەش دونیـایە و بـۆ خـۆت دەیـبینی**
**تۆش وات بەسەردێ هەر ئەکەی شینی**
**هونەریش مێژوو جـوان تـۆمـار دەکـات**
**چـروک و خـۆفـرۆش زوو ڕیسـوادەکات**

**کەلار: ٢٠١٨\٤\٢٠**
**عومەر سـۆفی**

خوێنەری ئازیز، دەمەوێت ئەوەت پێ ڕابگەیەنم لەوانەیە بڵێی من میوزیکزان نیم چۆن دەتوانم لەسەر میوزیک بدوێم، یان تۆ ئەی مامۆستای میوزیکزانی بەڕێز، بەڵێ بێگومان مرۆڤ پێش هەموو دروستکراوەکانی دەستی یەزدان، دروست بووە و پێش هەموو شتێک مرۆڤ خاوەنی هەستە و ئەگەر هەستی بە بێزاریی کردبێت، پەنای بردووە بۆ شتێک تا دەروونی پێ ئارام بکاتەوە و بە دەنگ و قوڕگی و بە دەستەکانی و پەنجەی هەموو کەرەستەیەکی میوزیکی بە دەست و پەنجەکان دروستکراوە، بۆ لەبەر چی؟ بێگومان بۆ پێویستییەکانی ژیان هەموو ئاوازەکان بە قوڕگ گوتراون، لە پاشان بۆ یارمەتیدانی قوڕگ پەنایان بردووە بۆ دروستکردنی چەند ئامێرێک، بۆیە لە قامیش دووزەلەیان وەکو میوزیکێک دروستکردووە، کە ئەم ئامێرە هەواییە لە دوو زەل دروستکراوە، یان دوونەیجە، یان دوو قامیش، ئەوەتا ئەمڕۆ بە چاوی خۆت دەیبینیت، ئینجا پەنایان بردووە بۆ دار و پێستی ئاژەڵ بۆ دروستکردنی تەپڵ و دەهۆڵ، هەتا ساڵی حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو هەر تەپڵ و دەهۆڵ و زووڕنا بوو لە زۆربەی وڵاتی کوردەواریدا، لەهاتنی ئیسلامەوە هەموشتێک حەرامکراوە ئەگینا لەپێش ئیسلام زۆر ئالەتی مۆسیقی هەبووە  باسی سەرەتاکانی ژیان دەکەم، وردە وردە هەر لە دار زۆر ئامێری تریان دروستکرد، بۆ نموونە: باڵەبان، بلوێر، دەهۆڵ، تەپڵ، عود، تار، ساز، سەنتوور، قانوون و دووزەلە و لە پاشان کانزا دروست بوو، ئینجا کانزایان تێکەڵ بە ئالەتی میوزیک کرد و ئێستا ئالەتی کارەباییش دروست بووە بە هەموو جۆرەکانیانەوە، مەقام و ئاوازی بەستەش هەر بە قوڕگ گوتراوە، لە پاشان نووسین و تۆمار داهات و کردیان بە ئەکادیمی ئەگینا بە بۆچوونی من مەقام و ئاواز و بەستە لە پێش هەمووانەوەیە، چونکە ئەمانە لەگەڵ مرۆڤدا لەدایک بوون، بێگومان مرۆڤیش لە ژیانیدا ئەگەر هەستی بەخۆشی، یان ناخۆشی کردبێت،

ئەوە بە مەقام، یان بە گۆرانی ناخی خاڵیکردووەتەوە، بە ندە نزیکەی چل وپێنج ساڵە ئەو هەستەم هەیە، بەتایبەتی پیاوان، بەڵام لە کۆنیشدا ئافرەتان بە گریان ناخیان خاڵیکردووەتەوە، لە بادینان، یان ڕاستتر، لە باکووری کوردستان، ژنان لاوکیان گوتووە بە کوڕاندا، ئەمانە لە پاشان گوێزرانەوە بۆ ئاینەکان و سروودی نیشتمانی و سیاسی و خۆشەویستیش، بەپێی سەرچاوە مێژووییەکان و شوێنەوارەکان بێت، لە سەدا حەفتا ئەمانە لەناو کوردەواریدا پەیدابوون چونکە کورد مرۆڤە سەرەتایی وپێشکەوتوەکان بون بەبناغەی مرۆڤایەتی ناسراون واتا کوردستان لانکەی مرۆڤایەتیە ،بۆیە ئەم ئالەتانەش دەبنە موڵکی کوردەواری لە زۆر سەرچاوەدا سەلمێنراوە، لە پاشان پەرەیان پێدراوە تا گەیشتە سەمفۆنیای جیهانی، ئەوەتا ناوی ئەم ئامێرە کوردییانە هەر لە کۆنەوە هەبووە و هاتووە: (١) چەنگ. (٢) تەموور. (٣) کەڕەنای زەنگ. (٤) نای. (٥) دەهۆڵ. (٦) سوڕنای. (٧) ڕووباب. (٨) بەربەت. (٩) کۆس. ئەم کۆسە لەوانەیە لە بۆنەخەمناکەکانا وترابێت چۆن دەڵێن فلانەکەس کۆسی کەوتە ئەوناوە لەوەوە هاتبێت.

ئەوەتا لێرەدا سەرچاوە مێژووییەکانی جیهان دەڵێن: گۆرانی لە میوزیک کۆنترە، موسای پێغەمبەر دەفەرموێت: تۆپاڵ باوکی هەموو ئامێرەکانە، لە پێش لافاوەکەی نوح پێغەمبەر ژیاوە، نوح یەکەمین کەسە میوزیکی دۆزیوەتەوە، ئەو عودی دروستکردووە و ژەنیویەتی، بێگومان جاران فیقنەی دووزەلە لە شاباڵی داڵ دروست دەکرا، ئینجا دوو قامیشەکەیان بە بەنێک دەبەست بەیەکەوە، لەم دواییانەدا بە قیر دەیانلکاند بە یەکەوە، فیقنەکەیان لەسەرەوە تێدەخست، سەرچاوەکان دەگێڕنەوە و دەڵێن: لە فەڕەنسا لە ئەشکەوتێکدا دووزەلەیان دۆزیوەتەوە، لە لوولاقی بزن دروستکراوە، پێی دەڵێن نۆ تۆن، چونکە پێموایە ئێسقان دەنگی خۆشترە و لە قامیشیش قایمترە، بە شتێکی

گەرم کونەکانیان دەکرد و زۆر جوان دەردەچوو، ئەبوو بە نەقش، ئەوکات دەیاننا بە دەمیانەوە و فویان دەدا و بە پەنجەکانیان ئاوازەکانیان دەردەهێنا و دەیانکرد بە شایی و هەڵپەڕکێ و ئاهەنگ و خۆشی، دەمەوێت کەمێک ڕوونکردنەوە لەسەر دروستکردنی دووزەلە بدەم. دووزەلە واتا دوو قامیش، ئەو دوو زەل، لە پێشدا وەکو گیا دەڕوێت لە ڕۆخی ڕووبارەکاندا، کە گەورە بوو دەبێت بە قامیشێکی ورد و باریک، ئێمە لە گەرمیاندا پێی دەڵێین ، تەرکە ئەم تەرکەیە بۆ چیخ بەکاریدێنن بۆ دەوری دەوار، یان ڕەشماڵ و بۆ سەر کوڵەنان، واتا جێگای کونە و مەشکەی ئاو و دۆ، لە سەردەمی زوودا بۆ حەساری ساوای بەرخ و کارژەلە، واتا گیسک و بەرخ، یان بۆ ژێر فەرش و ڕایەخ لەم تەرکیە فیقنەی باڵەبان و دووزەلە دروست دەکرێت، لەبەرئەوەی لە قامیش ناسکترە، دەنگێکی خۆشی هەیە، ئەو دوو قامیشە کە کونەکانی تێدەکرێت، بە پەنجەکان ئاوازەکانی لێدەردەهێنرێت، دوو قامیشی گەورەن، هەریەکەیان بە ئەندازەی پەنجەیەکی دەستی مرۆڤێک، یان قامکی مرۆڤێک دەبێت، لە پاشان دوو قامیشی ناسکتر، یان دوو قامیشی باریکتر دێنن بە درێژیی چوار پێنج سانتیم لە سەرەوەی قامیشەکە، کە گرێیەکی تیادایە لە خوارەوە وازە وا تا کونە ئینجا لە دەمی گرێکەوە زمانەیەکی لێ درووست دەکەن هەر بەشێوەی زمانی مریشکێک، یان هەر پەلەوەرێکی تر، ئەوکات فووی لێدەکەن و دەنگی لێوە دێت و هەردوو فیقنەکە جووت دەکەن، واتا دەیکەن بە یەک تەبەقە و ئاوازەکان دروست دەکەن، چونکە ئەم ئامێرە پارەی تێناچێت، تەنها کاری دەوێت، قامیشەکانی لە چەمە و بە کێردێک، یان بڕوانە لەخوارەوە دەتوانیت لەباسەکە تێبگەیت .لەسەرەوە وتمان یان بە کێردێک ئەو چەقۆیەکی بچووک دروستی دەکەن و ئەم ئامێرە بە قیر و قامیش دروستی دەکەیت بە چەقۆیەک.



وێنەی دووزەلەیەک

بێگومان باڵەبانیش لە دار و تەرکە، ئەویش جۆرە قامیشێکە دروست دەکرێت، تەنها فیقنەکەی تەرکەیە، بلوێریش هەر بەهەمان شێوە دروست دەکرێت، بەڵام بلوێر بەدەم فووی تێدەکەیت وەکو شمشاڵ، یان نەی، واتا نەیجە شمشاڵ بەبۆچونی من، واتا شمەکی تویێی شاڵ، هەموو ئەوانەی شمشاڵژەنن دایمە شمشاڵکەی لە تویێی شاڵەکەیدایە، بۆیە ناوی بە شمشاڵ دەرکردووە، قامیشێکی درێژە و کونی تێکراوە، بەڵام هەموو کەسێک ناتوانێ کونەکان بە ئەندازەی هونەری دروست بکات، ئەویش وەکو پەردەی میوزیکەکانی تروایە بۆیە دەتوانم بڵێم ئەم ئامێرە سەرەتاییانە بناغەی داهێنانی هونەر و میوزیکی گەلانن، بەتایبەت لە کوردستاندا، بە ناوەکەیاندا دیارە دەستکاری کوردن، بۆ نموونە کەمان، یان کەمانچە بە واتای لە شتێکی چەماوەوە دروستکراوە وەکو کەمەی گۆچان، تیروکەوان، هەموو ئەو دەزگایەی ژێکانی لێ دەبەستیت بە تەختەیەکی تەنکی دار دروست دەکرێت وەکو کەوان دەچەمێتەوە، بۆیە پێی دەڵێن کەمان، ئەمە لێرەدا دەردەکەوێت ناوێکی کوردییە، کورد لە وەسفی جوانیی ئافرەتدا، بەتایبەت شاعیر، دەڵێت: چاوجوانی ئەبرۆ کەوان، بە هیلالی ئەبرۆی دەڵێت، واتا قەوسی کەوان، ئەمەش لە تیروکەوانەوە هاتووە، یان

ئـالەتی جـۆزە، عەرەب دەڵـێن جـۆزە، جـۆزە كـامەیە؟ كەرەسـتەیەكی میوزیكییە، واتا لە دارگوێز دروستكراوە، خڕە وەكو گوێز، بۆیە پێی دەڵـێن جـۆزە، واتـا گـۆزە، دەنـگەكەی وەكـو دەنگـی كەمـانە، كەمێـك گڕتـرە، ئەم قـاچی دەنێیـتە زەوی و دەیژەنیـت، وەكـو كەمـان نیـیە بیخەیتە ژێر ملت ئەوكات بیژەنیت، هەروەهـا تەپڵ بەهەمـان شـێوە لە دارگوێز دروست دەكرێت لە پاشان بە چەرمێك سـەری دادەپـۆشیت، كە دەیدەیت بەسەر چەرمەكەیدا، دەنگێك دەر دەكات (تەپ تەپ)، بۆیە بووە بە تەپڵ، بۆ مانای چەرمیش حەز دەكەم ڕوونكردنەوەیەك بدەم، كورد دەڵێت چەرمـوو، واتـا سـپی، لە سـپیدەی بەیـانەوە هـاتووە بەڵام چەرمووەكە لە ڕەنگی پێستەكەوە یان چەرمەكەوە هاتووە هەردوكیان ڕاستن چونكە دیوی نـاوەوەی پێسـتە سپییە، بۆیە بە شـتی ڕۆشـنیان گوتـووە چەرمـوو، واتـا وەكـو چەرمە، مەبەسـتم لە ناوەكـانە، خۆیـان گەواهیـدەرن لەســەر خۆیــان، كە مــوڵكی چ نەتەوەیەكــن، ئــامێر و ئاوازەكان لە چ ناوچەیەكیش دۆزراونەتەوە، بەڵێ هەموو ئامێرەكان و مەقامەكان و ئاوازەكان ناوی خۆیان هەیە، مێژووش گەواهیدەرە لەم ڕووەوە میوزیـك لە بەرنـامە و پەیـڕەوی ئـاینی ئەهلـی حەقـدا چـۆن بـووە، بەتـایبەتی ئـالەتی تەمـوور، یـان سـێتار، تەمـوور لە دوو وشـە پێكهاتووە لە تار+ مۆر زیكر و شیوەن بۆ هەرچی بێت، چۆن خۆمـان دەڵێین سەرمۆر هەر لەو سەردەمەدا (٧٢) مەقام هەبووە لەنـاو ئەهلـی حەقدا، بێگومان هەر سروودەكانی زەمانی زەردەشـتە، ئەهلـی حەقـیش پەیڕەوكەری دینی زەردەشـت بـوون، هەر هەمـان دیـن بـووە، دەشـێت گۆڕانكاری تێكەوتبێت بە درێژایی مێژوو، ئەوەتـا لە زۆر سـەرچاوەدا هــاتووە، بێگومــان ئەم ســروودانە لە هەمـوو بۆنەیەكـدا خـوێنراوە بە ئەمــری ســوڵتان ئیســحاق، بەتــایبەت لە جەمخانەكانــدا، یەكێــك لەو مەقامانە مەقامی گاتـایە كە پێشـتر بەڕوونـی باسـم كـردووە، بە واتـای قەتــاری ئێســـتا كە هەیە و هەر دەگوترێــت بۆخۆیشـــم دەیخـــوێنم،

مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی زەردەشت پێش لەدایکبوونی عیسای مەسیح، تا ئەمڕۆش لەناو کوردا باوە و گوێگری زۆریان هەیە، حەز دەکەم ئاماژەش بەوە بکەم زۆرجار لە کەناڵەکانەوە چاوم لێ دەبێت و بە گوێی خۆم دەیبیستم کە دەڵێن ناوی شاری سەردەشتیش لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان هەر لە زەردەشتەوە هاتووە، بڕوانە زەردەشت- سەردەشت یەک جیاوازی بچووکی هەیە، ئەوەش تەنها پیتی (ز)یان لاداوە، پیتی (س)یان لە جێگای داناوە، نەک هەر سەردەشت، بەڵکو شاری ئۆرمێش هەر لە هۆرییەکانەوە هاتووە، زەردەشت لەوێ لەدایک بووە و لە پاشان هاتووەتە ناوچەی هەورامان، دێی زەڕایەنیش لە ناوچەی شارەزوور، زەڕایەن، واتا زەڕئاین، واتا تەواوکەری زەردەشتیەکانە وە بووەتە زەڕایەن. واتا زەڕدەشتی ئاین.

با بێینە سەر هۆرە، ئەم ئاوازە بێجگە لە کورد هیچ کەس لەسەر گۆی زەوی خاوەنی نییە، هەتاوەکو ئەمڕۆش دە پازدە بەزمی هەیە، لەپێشتر ئاماژەم پێکردووە، وەکو مولکی کوردە، تایبەتە بە میتراییەکان، یان هۆرییەکان زۆر لەپێش زەردەشتیشەوە بوون. هۆرە، بە واتای زیکری ئاهورامەزدا، بە واتای خودای مەزن دێت لە سەردەمی میتراییەکاندا گوتوویانە ئەویش خۆربووە ، ئەم خۆرە خودایانبووە، لە ئاڤێستادا هۆر بە واتای خۆر دێت، ئەم ئاینانە لە پێش زەردەشتەوە هەبوون و زۆر شتیان پەرستووە، وەکو: هەوا، ئاگر، ئاو، باران، هەورەتریشقە، ئەستێرە، گا، تاریکایی و زۆرشتی تر...ئەمانەم زۆر دووپاتکردۆتەوە بۆزیاتر تێگەیشتن چونکە دەمەوێت جوانتر ڕونببێتەوە بۆخوێنەری ئازیز مۆزیک بەڵام لە هەموو پەرستگایەکدا و لە هەموو سەردەمێکدا میوزیک و سروودی خۆی هەبووە و بەبێ میوزیک نەبووە، لە هەموو کاروباری وڵاتدا میوزیک هەر لە گەشەدا بووە، هەتا هاتنی ئیسلام هەمووی قەدەغە کرا، چونکە

ڕێـی لە کاروباریـان دەگـرت و قەدەغە بـوو، هەتـا بە تەواوەتـی سەرکەوتن، لە پاشان بە کەلتوور و ئاو و خاکەوە هەموویان گۆڕی و کردیانە هی خۆیان، بۆیە دەڵێم دەبێت ڕۆشنبیرانی کورد دەبێت هەوڵ بدەن بیانگەڕێنینەوە بۆ ئەسڵی خۆیان بە هەرشێوەیەک بێت، پێویسـتە هەریەکە لەلای خـۆیەوە شـان بـداتە ژێـری بە هەمـوو توانـایەکییەوە، مـن دەمەوێـت نمـوونەیەکی سـاکار و سـادە بێنمەوە، ئەوەتا ئەمڕۆ نەتەوەی عەرەب کەناڵی میدیایی زۆریان هەیە، هەموو کەسێک دەیبینێت، ڕەسەنترینیان کەناڵە کەلتوورییەکانیانە وەکو کەناڵە دراماییەکانیان، کەوا هەمیشە باسی سەرەتای ژیانی نەتەوەی عەرەب دەکات، بەتایبەت بەدووەکان، من هەتا ئەمڕۆ نەمبینیوە و نەمبیستووە مەقامێک لەم مەقامانەی کە لە ڕۆژهەڵاتدا دەگوترێن، ئەوان هەر بەلایدا بچن، ئەگەر دەڵێیت ئەمڕۆ دەڵێن ئەوە لێرەوە ڕۆیشتووە لە ڕێی ئەو هونەرمەدانەوە کە کۆچیان کردووە بۆ وڵاتەکانیان، یان لە ڕێی میدیاکانەوە بە هەر هۆیەکەوە بێت، خۆ زۆرجار کورد حوکمی ئەو وڵاتانەی کردووە، بەتایبەت دەسەڵاتی هۆرییەکان، هەتا دەریای خوێ، یان مردوو ڕۆیشتووە، لەم دواییانەشدا سەلاحەدینی ئەویوبی فەرمان ڕوایی تەواوی ناوچەکەی کردووە بە کورد و کەلتورەکەیەوە زۆر لەعەرەبەکان دەڵێن سەلاحەدین داگیری کردوین ئێستاش ئاسەواری کوردیان پێوەدیارە من دەتوانم بڵێم بێجگە لەوە زۆر لە هونەرمەندە عەرەبەکان کوردن، چ شانۆکار، یان گۆرانیبێژ، یان شاعیر... هتد. لە سەردەمی هێرشی سوپای ئیسلامدا چەندەها خەڵک چ وەکو بیروباوەڕی ئاینی و چ وەکو کۆیلە، بێجگە لەو کوردانەی بە هۆکاری سیاسییەوە گەیشتوونەتە ئەوێ، بۆ نموونە ئەو هونەرمەندەی عەرەب شانازیی پێوە دەکات، کە کەوکەبتلشەرقە ئوم کەلسوم کوردە، یان فەرید ئەترەش، واتا لە هۆزی ئەترووشی کوردن، زۆربەیان لە سوریا

دەژین، قورئانخوێنی بەناوبانگی میسری شێخ محەمەد عەبدولباست، یان شاعیری گەورە ئەحمەد شەوقی- ئەمیرل شوعەرا، یان شاعیری عێراقی مەعروف ڕەسافی و دەیەها لە هونەرمەندانی شانۆکار لە وڵاتانی تری عەرەبیدا وەکو مەحمود ملێجی و یوسف شەعبان و سەڵاح سەعدەنی و ویسرای کچی محەمەد عەبدولباستی قورئانخوێنی، میسری کۆن، هەتا یەکەم پاشایان کە محەمەد پاشایە، ناسراو بە حەمەپاشای میسری بووە، سەربەخۆیی میسری ڕاگەیاند، کورد بووە، تەنانەت نووسەر و ئەدیب و زانا ئایینەکانی سەردەمی پێغەمبەری ئیسلام (ﷺ) هەموویان کورد بوون. (بۆ زانیاری زیاتر، بڕواننە سەرچاوەکان کە ئاماژەم پێکردوون لە کۆتاییدا). لە شام دورەید لەحام (غەوار تووشی، واتا لە هۆزی ئەترووشیە، چونکە زۆربەی ئەترووشییەکان لە سوریا دەژین). سوریا واتا خاکی سوورەکان، کە ئەوانیش سۆمەرییەکانن. واتا سوورە مێردییەکان، ئێستا بوونەتە هۆزێک بە ناوی سورەمەیرییەوە. بێجگە لە ئێران و تورکیا مێژووی نەتەوەکانی ترو ڕووداوەکان ڕویانداوە لە ناوچەکەدا بەڕونی باس ناکرێت لە پێشتریش ئاماژەم پێکردووە، بەداخەوە لەوانەیە زۆرکەس هەبێ پێی ناخۆشبی کە من ئەم ڕاستییانە دەڵێم، ئەگەر ئێمە سەرکردەی دڵسۆزمان هەبووایە و وڵاتیان یەک بخستایە و خۆمان بە خاوەنی ئەم نیشتمانە بزانایە، قەت ئاوەها ژێرچەپۆکە نەدەبووین، ئەو هەموو بلیمەتەی کورد نەدەبوونە مەشخەڵ بۆ دوژمنانی کورد و کوردستان، ئەوەتا ئەمڕۆش هەزارەها دڵسۆز، بلیمەت، هونەرمەند، قارەمان و شارەزامان هەیە بێناز کەوتوون لە کوچەی شاراندا و کەس ئاوڕیان لێ نەداتەوە، یان زۆرمان هەیە بوونەتە مایەی خێر و خۆشی بۆ وڵاتانی بێگانە، کەچی لێرەوە پێیان دەڵێین بێگانەپەرستن، ئەی برای کورد، ئەم دەردە ئێمەی گەیاندووەتە ئەم حاڵە، لە سەری سەرەوە دابەزینە ژێری ژێرەوە، بەم

شێوەیە هەموو شتێکمان لەناودا ئەمەوێ ڕونکردنەوەیەک بدەم
لەسەرکورد لەم وڵاتانەی دەوروبرمان ئەگەر سەرژمێری بکرێت
لەتورکیاو ئێران و عێرق و سوریادا کورد زۆرینەیە بەلوج و لوڕوو
لەک وکەڵ وڕ هەرئەمانە سێکوتی ئێرانن لەتورکیا بەهەمان شێوە
چوار ملێون کورد لە مەسرهەن چوار ملێون کورد بەس لە
ئەستنبوڵدایە بێجگە لە وڵاتانیتر وەکو ئەفغان و هندوو پاکستان و
ڕوسیا و لوبنان ،جا ئەوە سی ساڵە بۆ خۆمان سەربەخۆین، یەک
شت لەوانەی لەدەستمان داوە، نەمانهێناوەتەوە، یەک برینمان لەو
هەزارەها برینانەمان سارێژ نەبووەتەوە، بەڵکو زامەکان قوڵتر دەبن،
هەتا بێ شتی زیاتریش لەدەست دەدەین و زامی زیاتر لە جەستەمان
دەبێتەوە، وا کەلتوور و زمانەکەشمان لەدەست دەدەین بەهۆی بێ
دڵسۆزیی و بێ سەروبەرییەوە، تۆبڕوانە گەلی یەهودی هەریەکێکیان
کوتبونە وڵاتێک لەپاش دەیەها سەدە و ساڵەها دەربەدەری وئاوارەیی
کە هەلیان بۆڕێکەوت بڕوانە ئەو ئیسرایلەیان بنیاتنایەوە کە هەمو
عەرەب دوژمنیانن و پێی ناوێرن بەئازایی وبوێری خۆیان لە
پێشیشدا هیچ وڵاتێک یارمەتیان نەداون ئەگەر بڵێیت یارمەتیان داون
دەوڵەتانی تر ئەوزوڵمەش لەوان کراوە لە هیچ گەلێکی تر نەکراوە
هەموو دینەکان و نەتەوەکان هەوڵی لەناوبردنی ئەوانیان دەداو
دایانیش من بەرگری لەوان ناکەم وەکوو نمونەیەک بۆ ئەمڕۆی
خۆمان ئەیان هێنمەوە جا هەوڵ و هیمەتیان کردە کارو بە پشت
بەستن بەخۆیان و بەدڵسۆزی و پەروەردەیەکی ڕێک وپێک فشاریان
خستەسەر زۆربەی وڵاتە زلهێزەکان ناچاریان کردن یارمەتیانبدەن
وتوێژیان لەگەڵدا بکەن و دیفاع لە بەرژەوەندی خۆیان وئەوانیش
بکەن بۆیە بەماوەیەکی زۆرکەم  ئەو دوڵەتەیان بنیات نایەوەو ئەمڕۆ
زۆربەی زانا گەورەکانی جیهان لەوانن ئەگەر شتێکی موهومیان
دابهێنایە سودی بۆوڵاتان هەبوایە بەپرۆتۆکۆڵ پارەیەکی زۆرو

بەداواکاری زۆرەوە یەکێ لەو داواکاریانە یارمەتیدان وپشتگیری بوە لەئیسرائیل ئەوکات زانستەکەیان بە فشارەوە دەفرۆشن پێیان ئەوجا ناچاردەبون بەرگری لەمافی خۆیان و ئەوانیش بکەن ئەوەش ئیسرایلە کەدەیبنیت ئەوەیە سیاسەت و دڵسۆزی کەچی ئێمەی کورد ئەوەسی ساڵە هەموو شتێکمان لەدەستداوە هیچیمان نەکردووە شتی زۆریشمان لەدەستداوە هیوادارم سوودێکم گەیاندبێت بە خوێنەرانی گەلەکەم و کەلتووری کوردەواریی، بژیین مرۆڤدۆستان، بمرن مرۆڤکوژان، بە هیوای ئازادیی و سەرفرازیی بۆ هەموو مرۆڤایەتی لە جیهان بەبێ جیاوازیی. جا من لێرادا دەمەوێت ئەوە ڕابگەیەنم من دژی هیچ ڕێبازو دین ودیانەتێک و سیاسەت و هیچ ڕێکخراوێک و وڵات و باوەڕێنیم بەس دژی چەوساندنەوەی مرۆڤایەتیم و ئەوخراپەکاریانەی دژی مرۆڤایتی دەکرێت لە هەرکوێیەک بێت لە ژێر هەر ناوو ناونیشانێکدابێت چونکو من خۆم چەوساوەم مو هەتا مرۆڤایەتی مافیرەوای خۆی وەرنگرێ منیش ڕزگارنابم هیوام خۆشی وشادیە بۆ تەواوی سەرزەوی لەنوسینی ئەم کتێبە تەنها مەبەستم بوو ڕاستیەکان بخەمەڕوو بۆ نەوەی نوێی گەلەکەم بۆمێژوو کە بزانن چی ڕویداوە هەتاوەکو بڵێم ڕقم لەکۆنەپەرسیە و لەگەڵ پێشکەوتندام بەڕاستی پێشکەوتن نەک سەرلێشێوان هیچ کەسیش ناتوانێت بەربەپێشکەوتن بگرێت بێگومانبە جامن باسی کۆن دەکەم یەکەم بۆسەلماندنی بونی کورد و وڵات و داهێنانەکەیەتی و تا نەوەکانمان بزانن بە ناوی بیرو باوەڕی جیا جیاوە چۆن فەرهود کراوین لەلایەن ئەم گەلانەی چواردەورمانەوەو بە دەسکیسەی خۆفرۆشان و خیانەت کارانەوە کە لە مێژوودا خاوەنی کوێ بوین و چۆنمان لەدەسداوە چۆن هەڵیان خەڵەتاندوین بە فێڵ وقسەی بریقەدار هەتاکو ئەمڕۆیش هەربەردەوامە بێ گومانبە زۆریان خراپە بەسەر هێناوین زۆریش

ڕاستەو ئەم ڕۆ بە بۆنەی تەکنەلۆژیاوە بەو ئامێرانەی داهێنراون هەموشتێک لەژێر بەرە دەخاتە سەر بەرە جا تۆ خۆت گێل بکەیت یان هەرنەزانبیت کەیفی خۆتە مێژوویش هەرباسدەکرێت و دەنوسرێت و بەهەمان شێوەی گێڕانەوەکانی جاران ڕوی ڕەشی خراپەکارانیش ئاشکرا دەکات و کردەوەی باشی مرۆڤ دۆستانیش بەرز دەنرخێنێت

**هەتا بمێنێ تۆپی دەسمایە(*)**
**سەرمایەی ژیان کۆتایی نایە**
**باعیسی شادی سووک و ڕیسوایە**
**مرۆڤکوژەکان کوێراییان دایە**
**بێگومان خوێنمژ وەک زالوو وایە**
**ئەنجامی تەقینە و ڕەنجی بەزایە**

عومەر سۆفی
٢٠١٩/١٢/١٤

*- تۆپی دەسمایە، واتا تۆپی زەوی، یان ئەستێرەی زەوی.

لەکۆتایــــدا دەمەوێـــت ڕوونکـــردنەوەیەک بـــدەم دەربـــارەی ئەو سەرچاوانەی کە مـن هێناومنەتەوە و بەکـارم هـێناون بۆ ئەم کتێبەم وەکـو بەڵـگەیەک، بـۆ سـەلماندنی مـقامەکان و کەلـتوورەکەمان، کە موڵـکی کـوردن، ئەگینـا وەکـو سـەرچاوەی میـوزیکی سـوودم لـێ نەبینیـون، وەکـو مێـژووی میوزیـک دەتـوانم بڵـێم پشـتم بە ئەو زانیارییانەی خۆم و چەند سەرچاوەیەکی تری میوزیکی وەکو کاک محەمەدی حەمە باقی و مەلا بێستون و دەوڵەتی ساسانی و زۆر لەو هونەرمەندانەی کە لەگەڵیاندا ژیاوم و گوێم لێیان بووە؛ لە سـەرەتاوە نـاوی زۆربەیـانم هێنـاوە: زۆرجـار ڕاستەوخـۆ لە هەر کەناڵـێکەوە باسی مقام و گۆرانی ڕەسەنیان کردبێت، من ڕاستەوخۆ پـێنووس و تێنووسم هێناوە لەلای خۆم لە تێنـوسەکەدا نووسـیومنەتەوە و پیادا چـوونەوەم بـۆ کـردووە و بەشـبەحاڵی خـۆم زانیـاریم لـێوەرگرتووە، ئەمەش ئەو ســـەرچاوانەیە کە ســـوودم لـــێ بینیـــون لە ڕووی مێژووییەوە، کە بۆچوونەکانی منیـان سـەلماندووە، بەگشـتی سوپاسـی هەموو ئەوانە دەکەم کە لە خوارەوە ئاماژەم پێکردوون.

نـــووسەر
عومەر سۆفی
سلێمانی
٢٠٢٢/٣/١٦

## پاشکۆی وێنە مێژووییەکانی سەردەمی هۆرییەکان وسۆمەرییەکان و ماددەکان











دانەیەکی گەچینی کەلە سەری مرۆڤی نیانتەردال لە ئەشکەوتی شانەدەر دۆزراوەتەوە لە چیای برادۆستی کوردستانی ئێراق دەگەڕێتەوە بۆ (60000-45000) پ. ز





گایەکی باڵداری زیوی کوردی دێرینی سەردەمی مادەکان.
مێژوویی: سەدەی: ٩ – ٨ی پێش زایین. ماهیوبیان



یەمەنێکی کۆشکی شاهانەی ((نەمرودشا)) لەناوچەی (ئادیامان)دا کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی ئۆرفا و ئینافا ئامەددا لە باکووری کوردستان و جەمکێکی خۆراوای



مۆرێکی لولەیی کوردی دێرین-ی سەردەمی میتانیەکان کە تیایدا: دیمەنێکی ئایینی لە خۆ دەگرێت.



بەمنێکی کۆشکی شاهانەی ((نەمرودشا)) لەناوچەی (ئادییامان)دا کە دەکەوێتە نێوان شارەکانی ئۆرفا و نیناقا ئامەددا لە باکووری کوردستان و چەمکێکی خۆراوای



ئارامگای حەزرەتی (برایم) پێغەمبەر (د . خ) لەشاری خەلیل لە وڵاتی (فەلەستین)دا



ئیمەنێکی کۆشکی کەیخەسرەو شا ، پایتەختی ئیمبراتۆریەتی ساسانی بوو لە نزیك
شاری (مادیان) و (باغی داد)دا



حەزرەتی زەردەشت پێغەمبەر پێغەمبەری کوردان (د.خ)






دروست کراوێکی هونەری کوردی دێرینی هەزارەی دووەمی پێش زایین و سەردەمی هورییەکان، لە دووکان دۆزراوەتەوە.



ئیمەنێکی کۆشــک و تەلاری ئیمپراتۆریەتی مادی لەشــاری (ئەکباتان) و (هەمەزان= هەمەدان)ی. بێگومان کۆشکە مەزنەکەی دیاکۆ شا کە شاکارێکی زۆر گەورەو مەزن



ئیمەنێکی قەلا و شـاکارێکی شـارستانی کوردانی مادی لە شـاری هەمەزانی پایتەختی مانیدا کە نۆژەنکراوەتەوە.





ئارامگەی کەیخەسرەوی مەزن، لە سەدەی شەشی پێش زایین



ئارامگەی دیاکۆی مەزن، لە سەدەی حەوتی پێش زایین.



وێنەی خێزانێکی تورکمانی ڕەسەن لە دەوروبەری ساڵی ۱۹۱۰



خێزانێکی تورکی ڕەسەن، دانیشتوویی لای چیاکانی ئالتایی



سەکۆیەك لەبەشی سەرەوەی جووتیارێکی لولو دیارە زەوی دەکێڵێت (هەزارەی دووەم پ.ز)



پارچە شوێنەوارێك بەدەستی پیشەکارانی مانئی دروستکراوە (سەدەی هەشتەم پ.ز)



سەرێك لەبەردی توند دروستكراوی پادشایەك یان سەركردەیەكی گوتی لەناوچەی
حوجوش دۆزراوەتەوە (هەزارەی سێیەم پ.ز) لە مۆزەخانەی براپركایدی دایە —



وێنەی تەپەگاوری لەکانی ماسی







وێنەی جێ گەورە پەرەستگای سۆمەرییەکان کەناسراوە بە زەقوورە لە شاری ئۆرگ



مۆرێکی لولەیی کوردی ئێرینی سەردەمی میتانیەکان کە مێژووەکەی بۆ سەدەی ١٥-١٤ی پێش زایین دەگەڕێتەوە.



مۆرێکی لولەیی کوردی ئێرینی سەردەمی میتانیەکان

مێژوویی: سەدەی ١٥-١٤ی پێش زایین

سەرچاوەکان:

١- ئازگار، لێکۆڵینەوەی کولتووری، م. ئەیوب کوێخا ڕۆستەم،.
٢- گەوهەری ژمارەیەک تێکست و دەستنووسەکان،
م. ئەیوب کوێخا ڕۆستەم.
٣- مێژووی بنەچەی کورد، د. عەبدوڵڵا دارتاش، ٢٠١٧.
٤- بەرهەمی ڕووخێنەری بیروباوەڕ، د. ئازاد تۆفیق خەیات.
٥- چێشتی مجێور، م. هەژار موکریانی.
٦- (قورئانی پیرۆز) وەرگێڕانی بۆ کوردی: م. هەژار موکریانی.
٧-شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامەی شەرەفخان.
٨- مێژووی میوزیکی کوردی، م. محەمەدی حەمەباقی.
٩-مێژووی شاری کفری، م. سەلاحەدین عەبدولحەمید.
١٠-مێژووی ماد، م. دیاکۆ نۆفله، زنجیرەی کەمبریج،
ئەلیکسەندەر میخایلۆڤیچ، وەرگێڕانی بۆ فارسی: بەهرام شالگۆنی،
وەرگێڕانی بۆ کوردی: عوبەید سورخابی.
١١-وڵاتی کەیانیان و (زەردەشت )و هەورامان لە ئاڤێستادا،
پشکنین و توێژینەوەی د. م. محەمەد ئەمین هەورامانی.
١٢- شوناس و ئاڵۆزیی، مەریوان وریا قانع.
١٣- مێژووی دەوڵەتی ساسانی- سەردەمی کیرەوییەکان
(٢٢٦- ٦٥١)، نووسینی: مفید ڕائف مەحمود العابد، وەرگێڕانی:
عەبدوڵڵا گەرمیانی.
١٤-مێژووی شوێن هەوارناسیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان،
کۆکردنەوە و وەرگێڕانی: عوبەید سورخابی، ٢٠١٣.
١٥- مێژوو و شارستانییەتی کورد، نووسینی:
د.محەمەد مەحمود مەندەلاوی، وەرگێڕانی: د. محەمەد مەحمود
عوسمان.

١٦- مێژووی دەرکەوتنی ئاینەکانی ئێزیدی و کاکەیی،
نووسینی: پرۆفیسۆری یاریدەدەر، د. کەیوان ئازاد ئەنوەر، ساڵی ٢٠١٨.
١٧- هۆلاکۆ، وەگێرانی: مەشخەڵ کەولۆسی، سەرسەخترین دکتاتۆرەکەی ڕۆژهەلات، خوێنرێژی مێژوو، دوژمنی شارستانییەت.
١٨- کتێبی چەتەکانی خودا، نووسینی: م. عەبدولڕەزاق جوبران، ٢٠١٧.
١٩- کتێبی کۆماری پێغەمبەر، نووسینی: عەبدولڕەزاق جوبران، ٢٠١٧.
٢٠- زەبوورەکانی داود، پاشا و پێعەمبەری یەهوودییەکان.
٢١- تەوراتی موسای پێغەمبەری یەهوودی لەگەڵ هەموو
مێژووی پاشا و پێغەمبەرەکانی تری بەنی ئیسرائیلدا،
لە کتێبی پیرۆزدا هاتووە.
٢٢- کورتە مێژوویەکی نێربازیی لە ڕۆژهەلاتی ئیسلامدا،
نووسینی: کوردیار.
٢٣- باوکانی سەلەفییەت، دەروازەیەک بۆ سەلەفیناسی،
محەمەد هەریری، چاپی یەکەم، ٢٠١٧.
٢٤- مرۆڤ و ئایینەکان، میشیل مالرب، ساڵی١٩٩٠.
٢٥- مێژووی دێرینی کورد، ئاکۆ محەمەد میرزادەیی.
٢٦- مێژووی خۆرهەلاتی کۆن، دەوروبەری (٣٢٣ ٣٠٠٠)پ.ز،
مارک فان دی میرۆپ، لە ئینگلیزییەوە: عەلی نادر،
لەپاش گەڕان و پشکنینێکی زۆر.
٢٧- ئاین و ئەفسانەناسی، جەلیل عەباسی، (ج. قەقنەس).
٢٨- ژووانی یەسنا، هەنگاوێک بۆ دۆزینەوەی بەشێک لە
جوگرافیای ونبووی ئاڤێستا، بەشی یەک، چاپی دووەم، ٢٠١٨.
٢٩- ئاڤێستا، نەسکی یەکەم، مێژینەترین سروودی کوردی،
گاتاکان، جەلیلی عەباسی، هەر شەش بەشەکەی.
٣٠- مێژووی مرۆڤ لە پێش (١٣,٥) ملیار ساڵ بەر لە ئەمڕۆ،

یوڤاڵ نوح هەراری، وەرگێڕانی: کارزان کاوسێن.
٣١- پەیژەکـــانی مۆســـیقای کـــوردی، م. ســـەلاح ڕەئـــوف، ٢٠٢٠، پرۆژەی قەفتان
٣٢- سێبەری شمشێرەکان، نووسینی: چێنەر.
٣٣-کتێبي پیرۆزی ئێزیدییەکان، نووسینی: هەڵۆی سانی.
٣٤- نەتەوە ونبووەکان.
٣٥- تـورکی عەلـی ئەلڕەبیعـۆ و ئـاوات، توونـدوتیژی و پیرۆزیـی و سێکس لە میتۆلۆژیای ئیسلامیدا.
٣٦- فیتنە، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: مامۆستا سابیر عەبدوڵلا کەریم، نووسینی جعێت.
٣٧- ئاش ئەنفال، نووسینی: م. چێنەر.
٣٨- دیاردەی سەربڕین لە مێژووی ئیسلامیدا، حەسەن بارام، ٢٠١٨.
٣٩-لاپەڕە تاریکەکـانی مێـژووی دەوڵەتـی ئەمەوی، حەســەن بـارام، ٢٠١٦.
٤٠- دین و علمانییەت، مەریوان وریا قانع.
٤١- مێژووی دێرینی کورد، ئاکۆ محەمەد میرزادەیی، بەشی دوو.
٤٢- مێژووی ئاینی زەردەشت، وەرگێڕانی لە فارسییەوە: وریا قانع.
٤٣- دیزاینی مەزن، ستڤین هۆوکینگ، لیۆنارد ملۆدینۆ.
٤٤- چێشتی مجێور، م. هەژار.
٤٥- سینۆهە، پزیشکی تایبەتی فیرعەون.
٤٦- داروین و ڕەچەڵەکی مرۆڤ.
٤٧- مێـــژووی پاشـــاکانی ئێـــران لە شـــا ئیســـماعیلەوە هەتـــا محەمەد ڕەزا شا، شەش بەرگە.
٤٨- محەمەد ڕەزا شا.
٤٩- نهێنییەکانی شاو فەرەح.
٥٠- شا ئیسماعیلی قاجاری.

٥١- شا عەباس ی سەفەوی.
٥٢- نادر شای ئەفشار.
٥٣- کەریم خانی زەند.
٥٤- ئینجیلی پیرۆز.
٥٥- چەند گفتوگۆیەکی فیکری، توانا ئەمین.
٥٦- سوپای ئەیوبیان لە سەردەمی سەلاحەدیندا،
ن.پ .س. دکتۆر موحسین محەمەد حسێن.
٥٧- مەملەکەتی ماد، د. ئەحمەد مەحمود ئەلخەلیل، ٢٠١٣.
٥٨- مێژووی ئەیوبی و مەملوکییەکان،
عوسمان محەمەد قادر کردوویەتی بە کوردی،٢٠١٠.
٥٩- نهێنی عەشتار ،فیراس سەواح ،و.ئیبراهیم فەتاح، ٢٠٠٩.
٦٠- گلگامێش،تۆما ر.ب.میلکە ، و.فواد سەیدە، ٢٠١٩.
٦١- کورد و تورک و عەرەب ،سیسیل جۆن ئیدمۆندس.
٦٢_د.عةبولحسێن زەڕینکوب دووسەدە بێدەنگی.
٦٣-د.عبدالمعطی الشعراوی ، ئەفسانەکانی گریک،و،کاوە تۆفیق ، بەشی دووەم ، ٢٠٢٠ ، چاپخانەی چوارچرا.

خۆشەویستانم، ئەم کتێبانە زۆربەیان زانیاری بوونی کورد، دێرینیی،جوگرافیا، داهێنان، توانا، دەسەلات، سەروەت و سامانیانم پێویست بووە. بۆ بەڵگەیەک گەڕاوم کە کۆنیی و دێرینیی میللەتی کورد بسەلمێنم. زۆر کەس گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی خاوەنی ڕاستەقینەی ئەم وڵاتە هۆرییەکانن بە هەموو داهێنانێکەوە، ئەم سەرچاوانە هەریەکە و لە بوارێکدا سوودم لێیان بینیوە، بەتایبەت بۆ سەلماندنی دێرینیی میللەتی کورد لە ناوچەکەدا و پێشکەوتنیان، جگە لەو زانیارییانەی لە میدیاکان و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانی ئەمڕۆ، کە بە دەنگ و ڕەنگەوە هەیە و زانا و فەیلەسوف و دیارن لە وڵاتانی دونیادا، کە باس لە گەورەیی و دێرینیی میللەتی کورد دەکەن لەژێر ناوی جیاجیادا، دووبارە سوپاسی هەموویان دەکەم، زۆر سوپاس.
من ئەمەی پێم بووە، خستوومەتە سەر کاغەز، هیچ شتێک بێ کەموکورتی نابێت، هیوام وایە خوێنەری بەڕێز لە هەڵە و کەموکورتی بمبەخشن، من هیوادارم ئێوە بتوانن لە پاشەڕۆژدا باشتری بکەن و سودی لێ ببینن و کەلێنێک لە کتێبخانەی کوردی پڕ بکاتەوە، بەندە زۆرجار ئەو مامۆستایانەی کە بۆ نامەی دکتۆرا، یان ماجستێر دەخوێنن، دێن پرسیار دەکەن لەسەر کولتووری کوردی، بەتایبەت هونەری مەقام و گۆرانی کوردی، بەگوێرەی توانا ڕێنماییان دەکەم، گوتم بۆچی شتێک نەنووسم لە کتێبخانەکانی گەلەکەماندا دەستبکەوێت و بە گشتی سوودی لێ ببینن وەکو بەڵگەیەکیش بمێنێتەوە بۆ مێژووی میللەتەکەمان، هیوادارم کارێکم کردبێت، هیچ نەبێت کەمێک باری سەرشانی مرۆڤێکم ئاسان کردبێت، بەندە زۆر خۆشحاڵ دەبم و بەدڵنیاییەوە سوپاس بۆ هەر هەمووتان، سوپاسی هەموو کوردێکی بەشەرەف و کوردپەروەر دەکەم کە هەمیشە خزمەتی نەتەوەکەی و مرۆڤایەتی دەکات...

عومەر سۆفی